# تەزهیبی

# فَتحُ القَريب

# التَّذهيبُ

## في أدلة متن الغاية والتقريب


دانانی
دکتۆر مصطفى ديب البغا

وەرگێڕانی
حمه صالح حاجی ملا محمدی گەلاڵە



چاپی سێیەم

١٤٣١ کۆچی

٢٠٠٠ زایینی

# التّذهيبُ

## في أدلة

## متن الغاية والتقريب

دانانی

دکتۆر مصطفى ديب البغا

## وەرگێڕانی

حمە صاڵح حاجی ملا محمدی گەڵاڵە

چاپی یەکەم

١٤١٩ کۆچی ١٩٩٩ زایینی

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ (الجاثية: ١٧)

---


- ناوی كتێب: التهذیب في أدلة الغایة والتقریب.
- ناوی دانەر: دكتۆر مصطفی دیب البغا.
- وەرگێڕانی: حمە صالح حاجی ملا محمدی گەلاڵە.
- چـــــاپ: چاپی سێیەم لەسلێمانی.
- لەبڵاوكراوەكانی كتێبخانەی: (ئیمامی شافیعی) لە سلێمانی بازاڕی ڕاپەڕین.
- تـیـــــراژ: ١٠٠٠ دانە.



- چاپخانە و ئۆفسێتی فەشەنك.

# پێشەکی

ماوەیەك بوو حەزم دەكرد كەلە نامەخانەی كوردیدا كتێبێك هەبێت كە حوكمە شەرعیەكان ببەستێتەوە بەسەرچاوەكانی لەقورئان و حەدیس تا هەمووان بزانن كە ئەو حوكمانە بنەمایەكی پتەوو بەهێزیان هەیە .

كتێبەكەی دكتۆر ( مصطفى البُغا ) بەراستی بەپێشەنگ دائەنرێت لەم بوارەدا بەتایبەتی كەلەگەڵ كتێبی ( متن الغاية والتقريب ) نووسیونی .

لەپێناوی خزمەت بەرۆڵەكانی گەلی موسوڵمانی كورد هاتم بەشێوەیەكی هاوچەرخ و زۆر سادە كردم بەكوردی هیوادارم توانیبێتم كەلێنێكی بچووك پڕ بكەمەوە .

وەرگێر

بسم الله الرحمن الرحيم

**الحمد لله رب العالمين ، وصلى الله على سيدنا محمد النبي وآله الطاهرين وصحابته اجمعين.**

**قال القاضي ابو شجاع احمد بن الحسين بن احمد الأصفهاني (رحمه الله تعالى): سالني بعض الأصدقاء - حفظهم الله تعالى – ان اعمل مختصرا في الفقه على مذهب الأمام الشافعي (رحمة الله) تعالى عليه ورضوانه في غاية الأختصار ونهاية الأيجاز ليقرب على المتعلم درسه ويسهل على المبتديء حفظه وان اكثر فيه من التقسيمات وحصر الخصال فاجبته إلى ذلك طالباً للثواب ، راغباً إلى الله تعالى في التوفيق للصواب إنه على مايشاء قدير وبعباده لطيف خبير .**

---

قازی أحمدی كوری حسینی ئەسفەهانی دەفەرموێت : لەلایەن هەندێك دۆستمەوە داوام لێ كرا كە كورتەیەك لەبابەتی (شەرع) لەسەر مەزەبی ئیمامی شافعی (خوا لێی ڕازی بێت ) بنووسمەوە بەشێوەیەكی زۆر كورت تاوەكو فێر خواز بەئاسانی تێی بگات و زوو لەبەری بكات . هەروەها بەچەند بەشێك دابەشی بكەم و مەسەلە گرنگەكانی تیا باس بكەم منیش بەنیازی وەدەست هێنانی پاداشی خوایی بەدەم داواكەیانەوە چووم . داواكارم لەخوای مەزن كەیارمەتیم بدات كەڕاستەكان بنووسمەوە . هەر ئەویشە توانای بەسەر هەموو شتێك دا هەیە و ئاگاداری بەندەكانیەتی و بەزەیی پیایان دا دێتەوەو لەكارەكانیان دا سەریان دەخات .

# كتابُ الطهارة

**المياهُ التي يجوزُ بها التَّطهيرُ سَبعُ مياهٍ : ماء السَّماءِ ، وَماءُ البَحرِ ، وماءُ النَّهرِ ، وَماءُ البئرِ ، وَماءُ العَينِ ، وَماءُ الثلجِ ، وماءُ البَرد . ثُمَّ المِياه عَلىٰ أربَعةِ أقسامٍ : طاهِرٌ مُطَهِّرٌ غيرُ مَكروهٍ وَهُوَ الماءُ المُطلَقُ.**

## باسی لابردنی بێ دەستنوێژیو پاكەوەكاری

ئەو ئاوانەی كە بۆ ئەم مەبەستە بەكار دێن حەوتن: (ئاوی باران ، ئاوی دەریا ، ئاوی ڕووبار ، ئاوی بیر ، ئاوی كانیاو ، ئاوی بەفر ، ئاوی تەرزە) [1]

بەگشتی ئاوەكان دەبن بەچوار بەشەوە :

١- پاكەو پاككەرەوەیە واتە بۆ دەستنوێژ دەشێت وبەكار هێنانی باشە ئەوەش وەك : ئاوی موتڵەق واتە بێ خەوش.[2]

---

(١) بەكورتی دەتوانرێت بوترێت : هەموو ئاوێك كەلە ئاسمانەوە دابكات یان لەزەوی یەوە هەڵبقوڵێت بۆ دەستنوێژ دەشێت.

بەڵگە لەسەر پاكی ئەم ئاوانە ئایەتی : ﴿ وَيُنَزِّلُ عليكُم مِنَ السَّماءِ ماءً لِيُطَهِّرَكُمْ بِهِ﴾ (الأنفال:١١) واتە لەئاسمانەوە بارانتان بۆ دەبارێنێت تا پاكتان بكاتەوە .هەروەها حەدیسی ئەبو هریرە: ((سأل رجل رسول الله (ﷺ) فقال یارسول الله انا نركب البحر ونحمل معنا القليل من الماء فإن توضأنا به عطشنا أفنتوضأ بماء البحر ؟ فقال رسول الله (ﷺ) هو الطهور ماؤه الحِلُّ ميتَتُه)) .

پیاوێك لەپێغەمبەری پرسی : ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە كەدەچینەناو دەریا ئاوێكی كەم لەگەڵ خۆمان دەبەین، ئەگەر بۆ دەستنوێژ بەكاری بهێنین تینوومان دەبێت ئایا دەتوانین ئاوی دەریا بەكار بهێنین؟ ئەویش فەرمووی : بەڵێ ئاوی دەریا پاككەرەوەیە و مردارەوەبوویشی حەڵاڵە . (هەرپێنج ریوایەتیان كردووە)

(٢) بوخاری (٢١٧) ((عن أبي هريرة قال: قام أعرابي فبال في المسجد فقام إليه الناس ليقعوا به فقال النبي (ﷺ) : دعوه وأهريقوا على بوله سجلا من الماء – أوذنوبا من ماء فإنما بعثتم ميسرين ولم تبعثوا معسرين))

بوخاری (٢١٧) لە أبو هريرەوە : ((پیاوێكی خێڵەكی عەرەب لەناو مزگەوتدا میزی كرد خەڵكە كە ویستیان ئازاری بدەن پێغەمبەر فەرمووی : وازی لێ بێنن دۆلكەیەك ئاو بكەن بەسەر میزەكەدا ئێمە دەبێت كارەكانمان ئاسان بكەین نەك باری، خەڵك گران بكەین .

**وَطاهِرٌ مُطَهِّرٌ مَكروهٌ وهُوَ الماءُ المُشَمَّسُ وَطاهِرٌ غَيرُ مُطَهِّرٍ وَهُوَ الماءُ المُستَعْمَلُ وَالمُتَغَيِّرُ بِما خالَطَهُ مِنَ الطّاهِرات.**

**٢- پاكەو پاككەرەوەيە بەلام كەراهەت هەيە لەبەكار هێنانی داوەك ئاوی بەرخۆر [١]**

**٣- پاكەو بەلام پاككەرەوەنیيە وەك ئاوی بەكارهاتوو. [٢] يان ئەو ئاوەی كەبەهۆی تێكەڵ بوونی شتی پاكەوە گۆرابێت. [٣]**

---

(١) مەبەست ئەو ئاوەيە كەلە قاپێكی كانزادا لەبەرخۆر گەرم بووبی گوايا ئەڵێن : دەبێتە هۆی بەڵەكی ، ديارە ئەمە بۆ ئەو شوێنانە يەكە پلەی گەرمی يان بەرزە وەك وولاتی حيجاز .

(٢) واتە بۆلابردنی بێ دەستنوێژی . بەڵگە لەسەر پاكی ئەم ئاوە حەديسی بوخاری (١٩١) وموسليم (١٦١٦) عن جابر بن عبدالله (ﷺ) قال: **((جاء رسول الله يعودني وأنا مريض لأعقل فتوضأ وصب علي من وضوئه)).**

لەجابری كوری عبد اللەوە ئەگێرێتەوە : جارێكيان پێغەمبەر (ﷺ) سەردانی كردم من نەخۆش بووم وئاگام لەخۆم نەبوو ئەويش دەستنوێژی شت و ئاوەكەی كرد بەسەرما ديارە ئەگەر پاك نەبوايە ئەوەی نەدەكرد.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی كە پاككەرەوە نیيە حەديسی موسليم (٢٨٣) **((أن النبي (ﷺ) قال: لايغتسل أحدكم في الماء الدائم وهو جنبٌ، فقالوا: يا أبا هريرة كيف يفعله؟ قال: يتناوله تناولا)).**

لەأبو هريرەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : لەئاوی وەستاو دلخۆتان مەشۆن بەمەبەستی لابردنی لەش پيسی ووتيان ئەی أبو هريرە ئەی چی بكەين ؟ ووتی لێی هەڵێنجن . ديارە ئەمە مانای وايە كەئەگەر ئاوێك جارێ بەكار هاتبێت نابێت جارێكی تر بەكار بهێنرێتەوە ئەمەش بۆئاوی كەمەو جياوازيش لەنێوان خۆشتن و دەستنوێژ دا نیيە . چونكە مەبەست لابردنی بێ دەستنوێژیيە.

(٣) مەبەست ئەو شتانەيە كە ئاو پێويستی پێيان نیيە و ناشتوانرێت لێی جيابكرێتەوە وەك خوێ وبۆنی خۆش لەبەر ئەوەش پاككەرەوە نیيە چونكە ئيتر پێی ناوترێت ئاو.

**وَماءٌ نَجِسٌ وَهُوَ الَّذِي حَلَّتْ فِيهِ نَجَاسَةٌ وَهُوَ دُونَ القُلَّتَيْنِ أَوْ كَانَ قُلَّتَيْنِ فَتَغَيَّرَ وَالقُلَّتَانِ خَمْسُمِائَةِ رِطْلٍ بَغْدَادِيٍّ تَقْرِيباً فِي الأَصَحِّ.**

**٤-ئاوی پیس : ئەو ئاوەیە کەشتی پیسی تێکەڵاو بوو بێت و لە قولەتێن کەمتر بێت [١] یان قولەتێن بێت بەڵام بە تەواوەتی گۆڕا بێت. [٢] قولەتێن بریتی یە لە (٥٠٠) رەتڵی بەغدادیی لەڕاسترین رادا [٣]**

(١) روی الخمسة عن عبد الله بن عمر (ﷺ) قال: سمعت رسول الله (ﷺ) وهو يسأل عن الماء يكون بالفلاة من الأرض وماينوبه من السباع والدواب؟ فقال: ((إذا كان الماء قلتين لم يحمل الخبث)).

هەر پێنج ئیمامەکەی حەدیس ڕیوایەتی کردووە لە عبد الله کوڕیعمرەوە ئەڵێت : گوێم لێبوو لەپێغەمبەر یان پرسی دەربارەی ئەو ئاوەی کەلە بیابان دا جۆرە ها دڕندەو گیان دار دەچنە سەری ئەویش فەرمووی : هەرئاوێك بگاتە قولەتێن پیسی هەڵناگرێ واتە: ئەگەر لەوە کەمتر بوو ئەوا پیس ئەبێت بانەش گۆڕرابێت بەڵگەش لەسەر ئەمە حەدیسی (موسلیم) (٢٧٨)(عن أبي هريرة) (ﷺ) أن النبي (ﷺ) قال: ((إذا استيقظ أحدكم من نومه فلا يغمس يده في الإناء حتى يغسلها ثلاثا فإنه لايدري أين باتت يده)).

پێغەمبەر فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان لەخەو هەڵسا با دەست نەخاتە ناو ئاوەوە تا سێ جار نەی شوات چونکە نازانێت دەستی بەرچی کەوتووە . لێرەدا نەهی کردووە لەترسی ئەوەی ئەوەك دەستی پیس بووبێت دیارە ئەو پیسی یەش دیار نی یە و ئاوەکەش ناگۆڕێت.

(٢) بەڵگە لەسەر ئەمە تێکرا ی رای موسوڵمانانە واتە(الأجماع) (ابن المنذر) دەڵێت : هەموان لەسەر ئەوەیەك ڕان کە ئاو ج کەم بێت یان زۆر ئەگەر شتی پیسی تێ بکەوێت و تام یان بۆن یان ڕەنگی بگۆڕێت ئەوە پیسە.

ئەو حەدیسەی کە دەڵێت : (ئاو پاککەرەوەیە بەهیچ شتێك پیس نابێت مەگەر تام یان بۆنی گۆڕابێت) پشتی پێ نابەسترێت ئیمامی شافیعی بەحەدیسێکی بێ پشتی داناوە (المجموع ١/١٦٠)

(٣) واتە نزیکەی (١٩٠) لیتر یان پڕ بەچوار پاڵوێکی وا کە درێژی لایەکی (٥٨) سم بێت .

(فصلٌ) وَجلودُ المَيتَةِ تَطهُرُ بالدِّباغِ إلاّ جِلدَ الكَلْبِ وَالخِنْزيرِ وَماتَوَلَّدَ مِنهُما أَو مِن أَحَدِهِما، وَعَظمُ المَيتَةِ وَشَعرُها نَجِسٌ إلاّ الآدَمِيَّ.

(فَصلٌ) وَلا يَجوزُ إستِعمالُ أَوانِي الذَّهَبِ وَالفِضَّةِ وَيجوزُ إستِعمالُ غَيرِهِما مِنَ الأَواني.

(باس) پێستەی گیان لەبەری مردارەوە بوو بەهۆی خۆشکردنەوە پاك دەبێتەوە [1] بێجگە لەپێستەی سەگ وبەراز یان هەرگیان لەبەرێك لەم دوانە یان لەیەکێکیانەوە بکەوێتەوە [2] ئیسقانی مردارەوەبوو هەروەها تووکە کەی پیسەو بەهیچ شتێك پاك نابێتەوە بەلام مرۆڤی مردوو هیچ شتێکی پیس نابێت. [3]

(باس) بەهیچ جۆرێك بەکارهێنانی قاپ و قاچاخی لە ئالتوون یان لەزیو دروستکراو دروست نییە [4] بەلام بێجگە لەو دووانە دروستە. [5]

(١) موسلیم (٣١٦) عن عبدالله إبن عباس (رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: ((إذا دُبغ الإهاب فقد طهُر)).

لەعەبدوڵلای کوڕی عباس ەوە دەگێڕێتەوە: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو ئەی فەرموو: ((هەر کاتێك پێستە خۆشکرا ئەوا پاك دەبێتەوە)) خۆشکردنیش بەوە دەبێت کەچی زیادەی پیوەیەتی لێی بکرێتەوەو ئەگەر بخرێتە ناو ئاوەوە بۆن نەکات.

(٢) چونکە ئەو دووانە لەکاتی ژیانیان دا پیسن دیارە بەمردارەوەبوویی خراپترن ،

(٣) مردارەوەبوو: ئەو گیان لەبەرەیەکە بە ڕێگەیەکی ناشەرعی سەبڕابێت وەك ئەو گیان لەبەرەی کە (مرتد) سەری بڕی بێت باگۆشتەکەشی بخورێت و هەروەها ئەو گیان لەبەرانەی کە گۆشتەکەیان ناخورێت وەك گوێ درێژ بەلگەشی ئایەتی: ﴿حُرِّمَت عليكُم الميتة﴾ (المائدة: ٣) بەلام ئادەمیزاد هیچ شتێکی پیس نییە بەلگەش ئایەتی: ﴿ولقد كرمنا بني آدم﴾ (الإسراء: ٧) ..واتە: ئێمە ڕێزی تایبەتیمان بۆ ئادەمیزاد داناوە، هەر لەبەر ئەمەشە کە گۆشتەکەی ناخورێت.

(٤) بوخاری (٥١١٠) موسلیم (٢٠٦٧) عن حذيفة بن اليمان (رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: ((لاتلبسوا الحرير ولا الديباج ولاتشربوا في آنية الذهب والفضة ولاتأكلوا في صحافها فإنها لهم في الدنيا ولنا في الآخرة)).

لە حوزەیفەوە (خوای لێ ڕازی بێت) پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: ((ئاوریشم لەبەر مەکەن و لەهیچ قاپ و قاچاخێکی لەئالتوون و زیوو دروستکراودا مەخۆن ومەخۆنەوە چونکە ئەوانە لەجیهان دا بۆ کافرانن ولەو دنیاش بۆئێمەیە، هەروەها هەموو بەکارهێنانەکانی تریش یان حەرامە، ئەمەش پیاو وژن دەگرێتەوە.

(٥) بەمەرجێك پاك بن.

**(فَصلٌ) وَالسِّواكُ مُستَحَبٌّ فِي كُلِّ حالٍ إلّا بَعْدَ الزَّوالِ لِلصّائِمِ، وَهُوَ فِي ثَلاثَةِ مواضِعَ أَشَدُّ إستِحْباباً: عِنْدَ تَغَيُّرِ الفَمِ مِن أَزَمٍ وَغيرِهِ، وَعِند القِيامِ مِنَ النَّومِ وعندَ القِيامِ إلىٰ الصَّلاةِ.**

**(باس) بەكارهێنانی سیواك كارێكی پەسەندە لەهەموو بارێك [1] مەگەر بۆیەكێك كەبە ڕۆژوو بێت، پاش نیوەڕۆ بۆی باش نی یە. [2] لەسێ كاتدا لەكاتەكانی تر زیاتر خێری هەیە:**

**١- كاتێك بۆنی دەمی گۆڕابێت لەبەر كەم دوورییان هەر هۆیەكی تر. [3]**

**٢- كاتێك كەلە خەو هەڵدەستێت. [4]**

**٣- كاتێك هەڵدەستێت بۆ نوێژكردن (٥)**

---

(١) سیواك: بەوشتە دەڵێن: كەددان پاك دەكاتەوەو بەكردارەكەش دەڵێن: بەهەرشتێك زبر بێت وچڵك لابەرێ دەبێت بەڵام بەداری (أراك) باشترە.

النسائي (١٠/١) ((السواك مطهرة للفم مرضاة للرب)) البخاري بصيغة الجزم والشافعي وأحمد، أنظر متن الغاية والتقريب في الفقه الشافعي (ص:٣٩) تحقيق وتعليق ماجد الحموي.

(٢) پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((بەڕاستی بۆنی دەمی ڕۆژووان لەلای خوا لەبۆنی مسك خۆشترە))، ئەو بۆنەش دوای نیوەڕو پەیدا دەبێت بەكارهێنانی سیواك نای هێڵێت بۆیە باش نی یە.

(٣) یان بۆ ماوەیەكی زۆر هیچی نەخواردبێت یان شتێكی بۆن ناخۆشی خواردبێت.

(٤) بوخاری (٢٤٢) موسلیم (٢٥٥) عن حذیفة (رضي الله عنه) قال: ((كان النبي (ﷺ) إذا قام من اللیل یشوص فاه بالسواك)).

پێغەمبەر (ﷺ) كەشەو خەبەری دەبۆوە سیواكی دەكرد، هەروەها، أبوداود (٥٧) موسلیم (٢٥٥) ((أن النبي (ﷺ) كان لایرقد من لیل ولانهار فیستیقظ إلا تسوك قبل أن یتوضأ)).

لە عائیشەوە (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: ((هەركاتێك پێغەمبەر (ﷺ) هەوستایە هەركە خەبەری دەبۆوە خێرا سیواكی دەكرد پێش دەستنوێژ ج شەو ج ڕۆژ.

(٥) هەروەها لەكاتی دەستنوێژدا بوخاری (٨٤٧) موسلیم (٢٥٢) ((لولا أن أشق على أمتي لأمرتهم بالسواك عند كل صلاة)). (وفي روایة لأحمد (٣٢٥/١) ((لأمرتهم بالسواك عند كل وضوء)).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە كە نامەوێت باری میللەتەكەم قورس بكەم ئەگینا فەرمانم دەكرد لەگەڵ هەموو نوێژێك سیواك بكەن)) لەریوایەتی (ئەحمەد (٣٢٥/٦) ((فەرمانم دەكرد لەگەڵ هەموو دەستنوێژێك دا سیواك بكەن)). واتە: لەسەرم فەرز دەكردن ئەمەش بەڵگەی خێری زۆری یەتی.

(فَصلٌ) وفُروضُ الوُضوءِ سِتَّةُ أشْياءَ: النِّيَّةُ عِندَ غَسلِ الوَجهِ، وَغَسلُ الوَجهِ وَغَسلُ اليَدَينِ إلىٰ المِرفَقَينِ، وَمَسحُ بَعضِ الرَّأسِ وَغَسلُ الرِّجلَينِ إلىٰ الكَعبَينِ، وَالتَّرتيبُ عَلىٰ ما ذَكَرناهُ.

(باس) فەرمزەكانی دەستنوێژ شەش شتن.[1]

١- نیەت هێنان لەكاتی دەمو چاو شۆردن دا.[2]

٢- شۆردنی دەمو چاو.

٣- شۆردنی هەردوو دەست لەگەڵ ئانیشكەدا.

٤- دەست هێنان بەسەر بەشێكی سەردا.

٥- شۆردنی هەردوو قاچ لەگەڵ قولەپێدا.

٦- ئاگاداری تەرتیب بەو شێوەی كە باسكرا.[3]

---

(١) بەڵگە لەسەر دەستنوێژو فەرزەكانی ئایەتی: ﴿يا أيها الذين آمنوا إذا قمتم إلى الصلاة فأغسلوا وجوهكم وأيديكم إلى المرافق وأمسحوا برؤسكم وأرجلكم إلى الكعبين﴾ (المائدة: ٦)..واتە: ((ئیمان داران كاتێك ویستتان نوێژ بكەن ئەوا دەمو چاوودەستتان لەگەڵ ئانیشكە بشۆن و دەست بەسەر سەرتان دا بێنن وقاچتان لەگەڵ قولەپێ بشۆن)).. واتە: قولەپێ وئانیشكە دەبێت بشۆرێن بەڵگەش حەدیسی موسلیم (٢٤٦) عن أبي هريرة (ﷺ) ((أنه توضأ فغسل وجهه فأسبغ الوضوء ثم غسل يده اليمنى حتى أشرع في العضد ثم يده اليسرى حتى أشرع في العضد ثم مسح رأسه ثم غسل رجله اليمنى حتى أشرع في الساق ثم غسل رجله اليسرى حتى أشرع في الساق ثم قال: هكذا رأيت رسول الله (ﷺ) يتوضأ)).

كە ئەبو هورەیرە دەستنوێژی شتو هەردوو، ئانیشكەی لەگەڵ دەستە كانیاو هەردوو قولەپێی لەگەڵ قاچە كانیاو شۆردو فەرمووی: پێغەمبەرم بینی بەم شێوە دەستنوێژی دەگرت.

(٢) بەڵگەلەسەر ئەمە حەدیسی بوخاری(١) موسلم(١٩٠٧) ((انما الاعمال بالنيات)) واتە هەموو كردەوەیەك كاتێك لەشەرع دا ئیعتباری بۆ دەكرێت كەنیەتی لەگەڵ دابێت.

(٣) بەڵگە لەسەر ئەمە كرداری پێغەمبەرە (ﷺ) كەلەبەر چاوی ئەسحابەكان دا دەی كرد هەروەها هەموو ئەسحابەكان لەسەر شێوەی تەرتیبەكە یەك ڕان كەچی لەسەر ژمارەی جارەكان یەك ڕا نین كە ئەوەش بەڵگەیە كە تەرتیبەكە فەرزە.

وَسُنَنُهُ عَشَرَةُ أَشياءَ: التَّسمِيَةُ وغَسلُ الكَفَّينِ قبلَ إدخالِهما الإناءَ، وَالمَضمَضَةُ، وَالإستِنشاقُ، وَمَسحُ جَميعِ الرَّاسِ، وَمَسحُ الأُذُنَينِ، ظاهِرِهِما وَباطِنِهما بِماءٍ جَديدٍ

سوننەتەكانی دەستنوێژ دە (١٠) شتن: ووتنی بسم الله، [١] شۆردنی هەردوو دەست پێش ئەوەی بیان خەیتە ناودەفری ئاوەكەوە، ئاولەدەم وەردان، ئاولە لووت وەردان، دەست هێنان بەسەر هەموو سەردا، [٢] سرینی گوێچكەكان دەرەوەو ناوەوە یان بەئاوێكی تازە. [٣]

(١) النسائي: (٦١/١) عن أنس (ﷺ) قال: طلب بعض أصحاب النبي (ﷺ) وضوء فلم يجدوا ماء فقال: (ﷺ) ((هل مع أحدكم ماء؟ فأتي بماء فوضع يده في الإناء الذي فيه الماء ثم قال: توضؤوا باسم الله أي قائلين ذلك فرأيت الماء يفور من بين أصابعه حتى توضأ نحو سبعين رجلا)).

هاوڕێكانی پێغەمبەر (ﷺ) بەدوای ئاودا دەگەڕان بۆ دەستنوێژ دەستیان نەكەوت پێغەمبەر فەرمووی: ((كەستان ئاوی پێیە؟ كەمێك ئاویان بۆ هێنا ئیتر دەستی خستە ناو قاپەكەوەو فەرمووی: دەستنوێژ بشۆن بەناوی خواوە))..واتە: بڵێن بسم الله.

(٢) بەڵگە لەسەر ئەم چوارانە بوخاری (١٨٣)و موسلیم (٢٣٥) ((من حديث عبدالله بن زيد (ﷺ) وقد سئل عن وضوء النبي (ﷺ) فدعا بتور من ماء فتوضأ لهم وضوء النبي فأكفأ على يده من التور فغسل يديه ثلاثا ثم أدخل يده في التور فمضمض واستنشق واستنثر بثلاث غرفات ثم أدخل يده فغسل وجهه ثلاثا ثم يده مرتين إلى المرفقين ثم أدخل يده فمسح راسه وأقبل بهما وأدبر مرة واحدة ثم غسل رجليه إلى الكعبين)).

لەعەبدوڵڵای كوڕی زید یان پرسی دەربارەی شێوەی دەستنوێژی پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش داوای قاپێكی گەورەی ئاوی كردو ئینجا سێ جار دەستی شۆردوپاشان دەستی خستە ناو قاپەكەوە ئاوی لەدەم و لووتی وەردا ئینجا سێ جار دەم و چاوی شت سێ جار هەردووباسكی لەگەڵ ئانیشكەدا ئینجا دەستی هێنا بەسەر سەریدا لەپێشەوەو لەدواوە ئینجا هەردوو قاچی لەگەڵ قولەپێی شۆرد.

(٣) الترمذي (٣٦) ((أن النبي (ﷺ) مسح برأسه وأذنيه ظاهرهما وباطنهما)).

((پێغەمبەر (ﷺ) دەستی بەسەر سەریدا هێناو هەردوو گوێچكەی دەرەوەو ناوەوەیانی مەسح كرد)) (النسائي (٧٤/١) ((مسح برأسه وأذنيه باطنهما بالسباحتين وظاهرهما بإبهاميه)) ناوەوەیان بە پەنجەی شایەتو دەرەوەش بە پەنجە گەورە (الحاكم (١٥١/١)) ((في صفة وضوئه (ﷺ) أنه توضأ فمسح أذنيه بماء غير الذي مسح به الرأس)) (كذلك في كتاب (متن الغاية والتقويب في الفقه الشافعي (ص: ٣١) لماجد الحموي).

((لەكاتی مەسحی گوێچكەكانیا ئاوێكی تازەی بەكار هێنانەك هەرئاوی مەسحی سەر واتە: هەریەكەیان ئاوی خۆی بۆ هەڵێنجا)).

وَتَخليلُ اللِّحيَةِ الكَثَّة، وَتَخليلُ أصابِع اليَدَين وَالرِّجلَين، وَتقديمُ اليُمنىٰ عَلىٰ اليُسرىٰ، وَالطَّهارةُ ثَلاثًا ثَلاثًا، وَالمُوَالاة.

پەنجە بخاتە ناوریشی ئەگەر پڕبوو [1] پەنجە بخاتە نێوان پەنجەكانی دەستو قاچی، [2] لای ڕاست پێش لای چەپ بخات، [3] هەموو كردارەكانی سێ جار سێ جار بكات، [4] یەك لەدوای یەك كردارەكان بكات. [5]

(١) أبوداود (١٤٥) ((أن النبي (ﷺ) كان إذا توضأ أخذ كفا من ماء فأدخله تحت حنكه فخلل به لحيته وقال: هكذا أمرني ربي عزوجل)).

پێغەمبەر (ﷺ) كاتێك دستنوێژی دەشۆرد هەندێك ئاوی هەڵدەگرت ریشی پیرۆزی تەڕدەكردودەی فەرمووی: ((خوای مەزن بەم شێوەیە فەرمانی پێ كردووم)).

(٢) أبوداود (١٤٢) الترمذي (٣٨) عن لقيط بن صبرة قال: قلت يارسول الله أخبرني عن الوضوء؟ قال: ((أسبغ الوضوء وخلل بين الأصبع وبالغ في الإستنشاق إلا أن تكون صائما)).

یەكێك لە هاوڕێكانی پێغەمبەر (ﷺ) لێی پرسی چۆن دەستنوێژ هەڵبگرم؟ ئەویش فەرمووی: ((بادەستنوێژەكەت تەواو بێتو نێوان پەنجەكانت تەڕبكەو ئاو لە لووتت وەربدە مەگەر بەڕۆژوو بێت)).

(٣) بوخاری (١٤٠) عن إبن عمر (رضي الله عنه) (أنه توضأ. وفيه: ثم أخذ غرفة من ماء فغسل بها يده اليسرى ثم مسح رأسه ثم أخذ غرفة من ماء فرش بها على رجله اليمنى حتى غسلها ثم أخذ غرفة من ماء فغسل بها رجله اليسرى ثم قال: هكذا رأيت رسول الله (ﷺ) يتوضأ).

((ئیبنو عەباس (خوای لێ ڕازی بێت) وەسفی دەستنوێژی كرد هەموو جارێك لای ڕاستی پێش چەپ دەخستو پاشان دەی ووت: بەم شێوەیە پێغەمبەرم دیوە دەستنوێژی دەشۆرد)).

(٤) موسليم (٢٣٠) أن عثمان (رضي الله عنه) قال: ((ألا أريكُم وضوءَ رسول الله (ﷺ)؟ ثم توضأ ثلاثا ثلاثا)).

عثمان (خوای لێ ڕازی بێت)ئەی فەرموو: (حەز دەكەن دەستنوێژی پێغەمبەرتان پێ بڵێم؟ ئینجا سێ سێ كردارەكانی دەكرد).

(٥) واتە: بەشێوەیەك كە ئەندامی یەكەم ووشك نەبێتەوە دەست بكات بەئەندامەكەی تر.

تێ بینی:

(أ) لە ڕووالەتی حەدیسەكان وا دەر ئەكەوێت كە ئەم كردارانە فەرزین بەلام لەبەر ئەوە ئایەتی دەستنوێژ لەرزەكانی دیاری كردووە ئەوا ئەمانە ئەبن بە سوننەت.

(ب) واباشە دوای دەستنوێژ ئەم دوعایە بخوێنرێت: ((أشهد أن لاإلـه إلا الله وحده لاشريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله أللهم اجعلني من التوابين وأجعلني من المتطهرين، سبحانك أللهم وبحمدك أشهد أن لاإله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك)). موسليم (١٤٩) الترمذي (٥٥).

**(فَصلٌ) والإستِنجاءُ واجِبٌ مِنَ البَولِ وَالغائِطِ، وَالأَفضَلُ أَن يَستَنجي بِالأَحجارِ ثُمّ يُتبِعُها بالماءِ، وَيجوزُ أَن يَقتَصِرَ عَلىٰ الماءِ أَو عَلىٰ ثَلاثَةِ أَحجارٍ يُنقي بِهِنّ المَحَلّ فَإِذا أَرادَ الإقتِصارَ عَلىٰ أَحدِهما فَالماءُ أَفضَلُ.**

**(باس) خۆ پاککردنەوە لەمیزو پیسایی واجبەو باشتروایە لە پێشدا بە بەرد ئینجا بە ئاو ئەم کارە بکات، دروستە تەنها هەر بە ئاویان هەر بەسێ بەرد شوێنەکە پاك بکاتەوە بەڵام ئەگەر ویستی هەر یەکێکیان بەکار بهێنێت ئەوا بائاو بەکار بهێنێت ئەو باشترە.** [1]

(١) بوخاری (١٤٩) موسلیم (٢٧١) عن أنس بن مالك (ﷺ) قال: ((كان رسول الله (ﷺ) يدخل الخلاء فأحمل أنا وغلام نحوی إداوة من ماء وعنزة فيستنجي بالماء)).

لە ئەنەسەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە: ((کاتێك پێغەمبەر دەچووە سەر ئاو بۆ دەست بە ئاو گەیاندن، منو منداڵێکی تری وەك خۆم ئاوو دارێك مان بۆ دەبرد بەئاوەکە خۆی پاك دەکردەوە دارەکەشی وەك نیشانە دەچەقاند)).

بوخاری (١٥٥) عن إبن مسعود (ﷺ) قال: ((أتى النبي الغائط فأمرني أن آتيه بثلاثة أحجار)).

لە ئیبن مەسعودەوە (خوای لێ ڕازی بێت) : ((جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) چووە شوێنێکی نزم بۆ دەست بە ئاوگەیاندن، داوای لێ کردم سێ بەردی بۆ ئامادە بکەم)).

أبوداود (٤٠) عن عائشة (ﷺ) أن رسول الله (ﷺ) قال: ((إذا ذهب أحدكم إلى الغائط فليذهب معه بثلاثة أحجار يستطيب بهن فإنها يجزيء عنه)).

لەعائیشەوە (خوای لێ ڕازی بێت): پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((کاتێك یەکێکتان دەچێتە سەر ئاو باسێ بەرد لەگەڵ خۆیدا بەرێت خۆی پێیان پاك بکاتەوە)).

أبوداود (٤٤) الترمذي (٣٠٩٩) إبن ماجة (٣٥٧) عن أبي هريرة (ﷺ) عن النبي (ﷺ) قال: ((نزلت هذه الآية في أهل قباء ﴿فِيهِ رِجالٌ يُحِبّونَ أَن يَتَطَهَّروا وَاللهُ يُحِبُّ المطهرين﴾ (التوبة: ١٠٨) قال: كانوا يستنجون بالماء فنزلت فيهم هذه الآية)).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (( ئایەتی: ﴿فيه رجال يحبون أن يتطهروا والله يحب المطهرين﴾ (التوبة: ١٠٨) دەربارەی خەڵکی (قباء) نازڵ بووە ئەوان بە ئاو خۆیان پاك دەکردەوە)). مانای ئایەتەکەش ئەمەیە: ((چەند پیاوێکی تیایە حەز لە خۆپاك کردنەوە دەکەن، خواش ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کە خۆیان پاك ڕادەگرن)).

**وَيَجتَنِبُ إستِقبالَ القِبلَةِ وَاستِدبارَها في الصَّحراءِ، وَيَجتَنِبُ البَولَ، والغائِطَ في الماءِ الرّاكِدِ وَتَحتَ الشَّجَرةِ المُثمِرةِ، وَفي الطَّريقِ والظِّلِ، والثُّقبِ، وَلا يَتَكَلَّمُ علىٰ البولِ وَالغائِطِ،**

**ئەبێت خۆی لەوە بپارێزێت ڕوو لەقیبلە یان پشتی تێ بکات، [1] هەروەها نابێت لەئاوی ڕاوەستاودا دەست بەئاو بگەیەنێت [2] یان لەژێر دەرختی بەر دار یان لەسەر ڕێگاو ژێر سێبەر [3] و کونی ناو زەوی. [4] پێویستە لەکاتی دەست بەئاو گەیاندن دا قسەنەکات [5]**

---

(١) بوخاری (٣٨٦) موسلیم (٢٦٤) عن أبي أيوب الأنصاري (ﷺ) عن النبي (ﷺ) قال: ((إذا أتيتم الغائط فلا تستقبلوا القبلة ولا تستدبروها ولكن شرقوا أو غربوا)).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((لەکاتی چوونە سەر ئاودا ڕووەو قیبلە یان پشت لەقیبلە دامەنیشن، بەڵام ڕووەو ڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاوا دابنیشن. مەبەست لە بیابان واتە: شوێنێك کەدیواری بۆ نەکرابێت ئەگینا چۆن دابنیشێت خراپ نییە)).

ئەوەتا بوخاری (١٤٨) موسلیم (٢٦٦) عن ابن عمر (ﷺ) قال: ((أرتقيت فوق ظهر بيت حفصة لبعض حاجتي فرأيت النبي (ﷺ) يقضي حاجته مستدبر القبلة مستقبل الشام)).

ئیبن عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: ((پێغەمبەرم بینی لەماڵەوەی دەستی بەئاودەگەیاند پشتی کردبووە قیبلە)).

(٢) موسلیم (٢٨١) ((عن جابر (ﷺ) عن النبي (ﷺ) إنه نهى أن يبال في الماء الراكد)).

((پێغەمبەر (ﷺ) نەهی کردوە لەوەی بەکێك میز بکاتە ناو ئاوی ڕاوەستاوەوە)) دیارە پیسایی خراپترە.

(٣) موسلیم (٢٦٩) عن أبي هريرة (ﷺ) عن النبي (ﷺ) قال: ((أتقوا اللعانين)) قالوا: وما اللعانان؟ قال: ((الذي يتخلى في طريق الناس أو في ظلهم)).

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((خۆتان لە دوو کارە نەعەلەتییەکە بپارێزن ئەوانەش دەست بەئاو گەیاندنە لەسەر ڕێگا یان لە ژێر سێبەردا)).

(٤) أبوداود (٢٩) ((نهى رسول الله (ﷺ) أن يبال في الجحر)).

((پێغەمبەر (ﷺ) نەهی کردووە کە میز بکرێتە کونی زەوییەوە)).

(٥) موسلیم (٣٧٠) ((أن رجلا مر و رسول الله (ﷺ) يبول فسلم عليه فلم يرد عليه)).

((پیاوێك بەلای پێغەمبەردا تێپەڕی خەریکی دەست بەئاوگەیاندن بوو سڵاوی لێ کرد ئەویش وەڵامی نەدایەوە)).

أبوداود (١٥) عن أبي سعيد (ﷺ) قال: سمعت النبي (ﷺ) يقول: ((لايخرج الرجلان يضربان الغائط كاشفين عن عورتهما يتحدثان فإن الله عزوجل يمقت على ذلك)).

پێغەمبەر (ﷺ) دەی فەرموو: ((نابێت دووانتان لەسەر ئاو لەشیان ڕووت بکەنەوە ووتو وێژ لەگەڵ یەکدا بکەن چونکە خوای گەورە پێی ناخۆشە)).

وَلايَستَقبِلُ الشَّمسَ والقَمَرَ ولا يَستَدبِرهُما.

(فصلٌ) وَالَّذي يَنقُضُ الوضوءَ سِتَّةُ أَشياءَ: ماخَرَجَ مِنَ السَّبيلَينِ، والنومُ عَلىٰ غيرِ هَيئةِ المُتمَكِّنِ، وَزوالُ العقلِ بِسُكرٍ او مَرَضٍ، وَلمسُ المَرأةِ الأجنَبيَّةِ مِن غيرِ حائلٍ،

---

و ڕوونەكاتە خۆرو مانگو پشتیان تێ نەكات [(١)]

(باس) ئەوانەی دەستنوێژیان پێ بەتاڵ دەبێتەوە شەش شتن: هەرشتێك لەپێش یان لەپاشی مرۆڤەوە دەربچێت، [(٢)] نووستن ئەگەر خۆی قایم نەكردبێت، [(٣)] نەمانی هۆش بەهۆی سەرخۆشی یان نەخۆشی یەوە، پیاو دەستی بەر ئافرەتێكی بێگانە بكەوێت بەڕووتی: [(٤)]

---

(١) ئیمامی (النووی)لە (المجموع) دا دەڵێت: ((ئەو حەدیسەی لەم بارەوە وتراوە پاڵپشتی توندی نییە ڕاست ئەوەیە كە تەنها ڕووتێ كردنیان خراپە نەك پشت تێ كردن المجموع) (١/١٠٣).

(٢) ئایەتی: ﴿أَو جَاءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ الْغَائِطِ﴾ (المائدة: ٦)..واتە: كاتێك یەكێكتان لەدەست بە ئاو گەیاندن دەگەڕێتەوە.

بوخاری (١٣٥) موسلیم (٢٢٥) عن أبي هريرة (ﷺ) قال رسول الله (ﷺ): ((لايقبل الله صلاة أحدكم إذا أحدث حتى يتوضأ))، فقال: (رجل من أهل حضرموت ما الحدث يا أباهريرة؟ قال: فساء أو ضراط).

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((هەر كەسێك دەستنوێژی شكا بەهۆی دەرچوونی باوە نا بێت نوێژ بكات تا دەستنوێژ ئەشواتەوە))، جا هەر شتێك لەو دووانە بێتە دەرێ با پاكیش بێت دەستنوێژی پێ دەشكێت.

(٣) أبوداود(٢٠٣) عن علي (ﷺ) قال رسول الله (ﷺ) ((وكاء السه العينان فمن نام فليتوضأ))

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەر كەسێك نووست ئەبێت دەستنوێژ بگرێتەوە))، مەبەست لەخۆ قایم كردن ئەوەیە كەوا دابنیشێت سمتی لەزەوی گیر بكات، دیارە بێ هۆش ئاگای لەخۆی نییە لەبەر ئەوە دەستنوێژی نامێنێت.

(٤) ئایەتی: ﴿أَو لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ﴾..واتە: دەستتان بەر ئافرەت بكەوێت، هەر پێنج ڕاوییەكەو الترمذي (٨٢) عن بسره بنت صفوان (ﷺ)أن النبي (ﷺ) قال: ((من مس ذكره فلا يصلي حتى يتوضأ)).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((یەكێك دەستی بەر عەورەتی خۆی بكەوێت تا دەستنوێژ نەشوات نابێت نوێژ بكات)).

النسائي (١/١٠٠) ((ويتوضأ من مس الذكر)).

إبن ماجة (٤٨١) ((من مس فرجه فليتوضأ)).

((هەر كەسێك دەستی بەر عەورەتی بكەوێت با دەستنوێژ بشواتەوە))، كەواتە: جیاوازی نێرو مێ نییە هەروەها پێشوپاش فەرقی نییە.

وَمَسِّ فَرجِ الآدمِيّ بِباطِنِ الكَفِّ، وَمَسِّ حَلْقَةِ دُبُرِهِ علىٰ الجَديد.

(فصل) والذي يوجِبُ الغُسلَ سِتةُ اشياءَ: ثلاثةٌ تَشتَرِكُ فيها الرّجالُ والنِساءُ وهيَ: إلتِقاءُ الخِتانَين، وَإنزالُ المَنِيّ،

بەری دەستی بەر عەورەتی مرۆڤ بكەوێت، دەستی بەر دواوەی خۆی بكەوێت لەسەر ڕای تازەی ئیمامی شافعی.[1]

(باس) خۆشۆردن (غوسڵ) بەشەش شت واجب دەبێت سیان یان پیاووژن هاوبەشن تیایاندا ئەوانەش: پێك گەیشتنی عەورەتی پیاوو ژن،[2] هاتنە دەرەوەی مەنی (تۆو)،[3]

(١) بەو ڕایانە دەوترێت كە ئیمامی شافیعی لە میسردا دەری بڕیون هەمیشە ئەوانە جێگەی متمانەن تەنها لەچەند مەسەلەیك دا نەبێت كە دەست نیشان كراون.

(٢) واتە: (جماع) بوخاری (٢٨٧) موسلیم (٣٤٨) عن أبي هريرة (ﷺ) عن النبي (ﷺ) قال: ((إذا جلس بين شعبها الأربع ثم جهدها فقد وجب عليه الغسل..·(في رواية لمسلم)..((وإن لم ينزل)).

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: ((هەر كاتێك پیاو لەگەڵ ئافرەت دا جووت بوو ئەوا غوسڵ واجب دەبێت با تۆویشی نەڕژێت)).

(٣) بوخاری (٢٨٧) موسلیم (٣١٣) (عن أم سلمة (ﷺ) قالت: جاءت أم سليم إلى رسول الله (ﷺ) فقالت: يارسول الله إن الله لايستحي من الحق فهل على المرأة من غسل إذا هي إحتلمت؟ فقال رسول الله (ﷺ): ((نعم إذا رأت الماء)) ).

(لەپێغەمبەریان پرسی : ئەگەر ئافرەت ئیحتلامی بوو غوسڵی لەسەرە یان نا؟ فەرمووی: ((بەڵێ بەمەرجێك ئاو ببینێ)) ).

أبوداود (٢٣٦) (عن عائشة (ﷺ) قالت: سئل رسول الله عن الرجل يجد البلل ولا يذكر إحتلاما. فقال: ((يغتسل))، وعن الرجل يرى أن قد إحتلم ولا يجد البلل؟ فقال: ((لاغسل عليه))، فقالت أم سليم: يارسول الله (ﷺ) إن الله لايستحي من الحق فهل على المرأة ترى ذلك أعليها غسل؟ قال: ((نعم النساء شقائق الرجال)).

لە پێغەمبەریان پرسی ئەگەر یەكێك تەڕی ببینێ بەڵام نەزانێت ئاخو ئیحتلامی بووە یان نا؟ فەرمووی: ((ئەبێ غوسڵ بكات بەڵام ئەگەر وای زانی ئیحتلام بووە بەڵام هیچ تەڕایی نەبینێ ئەوا غوسڵی لەسەر نییە لەمەش دا جیاوازی پیاوو ئافرەت نییە.

وَالمَوتُ. وَثلاثَةٌ تَختَصُّ بِها النِّساءُ وهيَ: الحَيضُ، والنِّفاسُ وَالوِلادَةُ.
(فَصلٌ) وَفَرائِضُ الغُسلِ ثلاثَةُ اشياءَ: النِّيَّةُ وإزالَةُ النَّجاسَةِ إن كانَتْ علىٰ بَدَنِه،

مردن. [1] سیانیش تایبەتن بە ئافرەتان ئەوانەش: حەیز [2] وخوێنی منالبوون [3] ومنالبوون. [4]

(باس) فەرزەکانی غوسل سێ شتن نیەت هێنان، لابردنی پیسی ئەگەر هەبوو، [5]

(١) بوخاری (١١٩٥) موسلیم (٩٣٩) عن أم عطیة الإنصاریة (ﷺ) قالت: دخل علینا رسول الله (ﷺ) حین توفیت إبنته فقال: ((إغسلنها ثلاثا)).

ئەگێرنەوە کاتێك یەکێك لە کچەکانی پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد، فەرمووی: ((سێ جار غوسلی بکەن)).

هەروەها بوخاری (١٢٠٨) موسلیم (١٢٠٦) عن إبن عباس (ﷺ): (أن رجلا وقصته بعیره ونحن مع النبي (ﷺ) وهو محرم فقال: النبي: ((إغسلوه بماء وسدر وکفنوه في ثوبین)) ).

پیاوێك حوشترەکەی ملی شکاندبوو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (( بە ئاوو ئەسپون (شتێکی بۆن خۆشە) بی شۆن وله دووپارچە قوماش دا کفنی بکەن.

(٢) ئایەتی: ﴿فاعتزلوا النساء في المحیض ولاتقربوهن حتى یطهرن فإذا تطهرن فأتوهن من حیث أمرکم الله إن الله یحب التوابین ویحب المتطهرین﴾ (البقرة: ٢٢٢)..واتە: لەکاتی حەیزدا توخنی ژنەکانتان مەکەون تا خۆیان دەشۆن ئەوکاتە لەو شوێنەوە کە خوا ئەمری پێ کردوون بچنە لایان خوا ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کە تۆبە دەکەنو خۆیان پاك ڕائەگرن.

بوخاری (٣١٤) عن عائشة (ﷺ) أن رسول الله (ﷺ) قال لفاطمة بنت أبي حبیش (ﷺ): ((فإذا أقبلت الحیضة فدَعي الصلاة وإذا أدبرت فأغتسلي وصلي)).

پێغەمبەر بە ئافرەتێکی فەرموو: (لەکاتی حەیزدا واز لە نوێژ کردن بهێنە کە خوێنەکەش بڕا خۆت بشۆو نوێژ بکە.

(٣) ئەمیش وەکو حەیز وایە چونکە لەڕاستیدا ئەوە هەر خوێنی حەیزە کۆبۆتەوە.

(٤) هەرچەندە زۆر جار خوێنی لەگەلا دەبێت بەلام خوێنیشی لەگەلا نەبێت هەر ئەبێت خۆی بشوات.

(٥) بوخاری (٢٤٦) عن میمونة (ﷺ) في غسله (ﷺ) ((وغسل فرجه وما أصابه من أذى [أي نجاسة وقذر])).

((هەموو جارێك پێغەمبەر (ﷺ) پێش غوسل چی پیسایی هەبوو لای ئەبرد)).

**وَإيصالُ الماءِ إلىٰ جَميعِ الشَّعرِ وَالبَشَرَةِ .**
**وَسُنَنُهُ خَمسَةُ أشياءَ: التَّسمِيَةُ، والوضوءُ قَبلَهُ، وَإمرارُ اليَدِ عَلىٰ الجَسَدِ، وَالمُوالاةُ، وَتَقديمُ اليُمنىٰ عَلىٰ اليُسرىٰ.**

**گەیاندنی ئاو بەهەموو لەش بە پێست و مووەوە.** [1]

**سوننەتەکانی غوسڵ پێنج شتن: بسم الله کردن،** [2] **دەستنوێژ شتن لەپێش غوسڵەکە، دەست هێنان بەسەر لەشدا،** [3] **یەك دوواییەك کارەکان بکات، لای ڕاست پێش چەپ بخات.** [4]

(١) بوخاری (٢٤٥) موسلیم (٣١٦) عـن عائشـة (ﷺ): ((أن النـبي (ﷺ) كـان إذا إغتسل من الجنابة بدأ فغسل يديه ثم يتوضأ كما يتوضأ للصلاة ثم يدخل أصابعه في الماء فيخلل بها أصول شعره ثم يصب على رأسه ثـلاث غـرف بيديـه ثـم يفيـض المـاء على جلده كله)).

ئەگێڕنەوە: ((کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) بیویستایە غوسڵی لـەش پیسی بکـات، هـەر دوو دەستی دەشت وئینجا دەستنوێژی دەگرت و پاشان بە پەنجە مووەکانی تەڕ دەکـردو سێ مست ئاوی دەکرد بەسەریا ئینجا ئاوی دەکرد بە هەموو لەشیدا)).

أبووداود (٢٤٩) عن علي (ﷺ) قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: ((من تـرك موضـع شعرة من جنابة لم يصبها الماء فعل الله به كذا وكذا مـن النـار، قـال علـي: فمـن ثـم عاديت شعري، وكان يجز شعره: أي يحلقه)).

پێغەمبەر (ﷺ) دەی فەرموو: ((هەرکەسێك ژێر مووەکانی ئاوی بەر نەکەوێت خـوا لـە ئاگردا دەی سوتێنێت)) لەبەر ئەوە ئیمامی علي (ﷺ) هەموو جارێ مووەکانی ئەتاشی)).

(٢) چونکە هەرشتێکی باش دەبێت بەوە دەست پێ بکات.

(٣) لەمەزهەبی ئیمامی مالك دا ئەمە فەرزە.

(٤) بوخاری (١٦٦) موسليم (٢٨٦) عن عائشة (ﷺ) قالت: ((كان النبي (ﷺ) يعجبه التيمن في تنعله وترجله وطهوره وفي شأنه كله)).

((پێغەمبەر (ﷺ) هەمیشـە حـەزی دەکرد لەهـەموو شتێکدا لای ڕاسـت پێـش بخـات تەنانەت لەپێڵاو لەپێ کردنیشدا)).

(فَصلٌ) وَالإِغتِسالاتُ المَسنونَةُ سَبعَةَ عَشَرَ غُسلاً: غُسلُ الجُمُعَةِ، والعيدَين، والإستِسقاءِ، والخُسوفِ والكسوفِ، وَالغُسلُ مِن غُسلِ المَيِّت.

(باس) ئەو غوسلانەی كە سوننەتن حەڤدە جۆرن: غوسلی هەینی، [1] دوو جەژنەكە، [2] نوێژەبارانە ، مانگ گیران و خۆر گیران، [3] ئەو كەسەی كە مردوو دەشوات. [4]

(١) بوخاری (٨٣٧) موسلیم (٨٤٤) عن إبن عمر (ﷺ) قال رسول الله (ﷺ): ((إذا جاء أحدكم إلى الجمعة فليغتسل)) ولمسلم ((أراد أن يأتي)).

پێغەمبەر (ﷺ) دەی فەرموو: ((ئەگەر هاتن بۆ نوێژی هەینی خۆتان بشۆن، لەبەر ئەوەش واجب نییە چونكە حەدیسێكی (الترمذي) (٤٩٧) هەیە دەڵێت: ((من توضأ يوم الجمعة فبها ونعمت ومن إغتسل فالغسل أفضل)).

((ئەگەر یەكێك لە ڕۆژی هەینیدا دەستنوێژی شۆرد ئەوە باشە بەلام ئەگەر غوسڵ بكات ئەوە باشترە)).

(٢) ئیمامی مالك لە (الموطاء) (١٧٧/١) أن عبدالله بن عمر (ﷺ) ((كان يغتسل يوم الفطر قبل أن يغدو إلى المصلى)).

دەگێڕنەوە كە عبدالله كوڕی عمر (ﷺ) (ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان غوسڵی دەكرد پێش ئەوەی بچێت بۆ نوێژەكەی)

(٣) لەبارەی ئەم سێ غوسڵەوە هیچ شتێك ڕوایەت نەكراوە دیارە قیاس دەكرێنە سەر غوسڵی هەینی.

(٤) الترمذی(٩٩٣) عن ابي هريرة (ﷺ) عن النبي(ﷺ) قال: ((من غسل ميتا فليغتسل ومن حمله فليتوضأ))

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی : (ئەگەر یەكێك مردووی شۆرد باخۆشی غوسڵ بكات هەركەسێكیش هەڵی گرت بادەستنوێژ بگرێت)

لەبەر حەدیسی الحاكم (٣٨٦/١) كەدەڵێت : ((ليس في غسل ميتكم غسل اذا غسلتموه))

واتە: ئەگەر یەكێك مردوو یەكی شۆرد ئەوا غوسڵی لەسەر نییە) ئەم غوسڵە فەرز نەكراوە .

وَالكافِرُ إذا أَسْلَمَ، وَالمَجنونُ وَالمُغمىٰ عَلَيهِ إذا أفاقَ، وَالغُسلُ عِندَ الإحرامِ، وَلِدُخولِ مَكَّةَ، وَلِلوقوفِ بِعَرَفَةَ، وَلِلمَبيتِ بِمُزدَلِفَةَ، وَلِرَمي الجِمارِ الثَّلاثِ، وَلِلطَّوافِ، وَلِلسَّعيِ، وَلِدُخولِ مَدينَةِ رَسولِ اللهِ (ﷺ).

کافر کە ئیسلام بو [1] شێت و بێ هۆش کەهاتنەوە هۆش خۆیان، [2] لەکاتی بەستنی ئیحرام بۆ حەج، [3] بۆچونەناو شاری مەککە، [4] بۆوەستان لەکێوی عەرەفات، [5] بۆمانەوەی شەو لەموزدەلیفە، بۆبەردە بارانی شەیتان لەحەجدا، بۆتەوافی ماڵی خوا، بۆڕاکردن لەنێوان سەفاو مەروەدا، کاتێك دەچێتە شاری (مدینە) شاری پێغەمبەر (ﷺ)

(١) ابوداود (٣٥٥) الترمذی (٦٠٥) عن قیس بن عاصم (ﷺ)قال: ((اتیت النبي (ﷺ) ارید الإسلام فأمرني ان اغتسل بماء وسدر)).

یەکێك دەگێڕێتەوە: ((کاتێك چوومە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەمەویست ئیسلام بیم، ئەویش فەرمووی: ((جارێ بچۆ خۆت بشۆ)).

(٢) بوخاری (٦٥٥) موسلیم (٤١٨) ((عن عائشة (ﷺ) قالت: ثقل علی رسول الله (ﷺ) فقال: ((أصلى الناس؟)) فقلنا: لا هم ینتظرونك یا رسول الله، فقال: ((ضعوا لي ماء في المخضب)) قالت: ففعلنا فأغتسل ثم ذهب لینوء فإغمي علیه ثم أفاق فقال: ((أصلى الناس)) فقلنا لا هم ینتظرونك یا رسول الله، فقال: ((ضعوا لي ماء في المخضب)) قالت: ففعلنا فإغتسل ثم ذهب لینوء فإغمي علیه ثم أفاق..).

خاتوو عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە: ((کاتێك نەخۆشییەکەی پێغەمبەر گران ببوو دەی فەرموو: ((ئایا موسوڵمانان نوێژیان کردووە؟ ئێمەش عەرزمان دەکرد: چاوەڕوانی تۆ دەکەن، ئەویش فەرمانی دەکرد ئاوی بۆ ئامادە بکەین خۆی دەشت پاشان بێ هۆش دەبوو، دیسان خۆی دەشت تا چەند جارێك ئەوەی دووبارە کردەوە)).

(٣) الترمذي (٨٣٠) عن زید بن ثابت (ﷺ) ((أنه رأى النبي (ﷺ) تجرد لإهلاله وإغتسل)).

زەیدی کوڕی سابت (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە: ((پێغەمبەرم بینی پێش ئیحرام خۆی شۆرد)).

(٤) بوخاری (١٤٧٨) موسلیم (١٢٥٩) عن إبن عمر (ﷺ): (أنهكان لایقدم مكة إلا بات بذي طوى حتى یصبح ویغتسل ثم یدخل مكة نهاراً ویذكر عن النبي (ﷺ) أنه فعله).

(ئیبنو عومەر هەموو جارێك پێش ئەوەی بچێتە ناو شاری مەککەوە شەو لە (ذات الطوی) دەمایەوە سەر لەبەیانی خۆی دەشۆرد ئینجا دەچووە ناو شارەوە دەی ووت: ((پێغەمبەر (ﷺ) بەو شێوەی دەکرد)). )

(٥) مالك لە (الموطاء) (٣٢٢/١) دەڵێت: (عن إبن عمر (ﷺ): كان یغتسل لإحرامه قبل أن یحرم ولدخول مكة ولوقوفه عشیة عرفة).

(هەمیشە ئیبنو عومەر بۆ ئیحرامو چوونە ناو مککەو وەستانی عەرەفات خۆی دەشۆرد).

(فَصلٌ) وَالمَسحُ عَلىٰ الخُفَّينِ جائِزٌ بِثَلاثَةِ شَرائِطَ: أَن يَبتَدِيءَ لَبسَهُما بَعدَ كَمالِ الطَّهارَةِ، وَأَن يَكونا ساتِرَينِ لِمَحَلِّ غَسلِ الفَرضِ مِنَ القَدَمَينِ وَأَن يَكونا مِمّا يُمكِنُ تَتابُعُ المَشيِ عَليهِما. وَيَمسَحُ المُقيمُ يومًا وَلَيلَةً والمُسافِرُ ثَلاثَةَ أَيّامٍ بِلَياليهِنَّ وَابتِداءُ المُدَّةِ مِن حينِ يُحدِثُ بَعدَ لَبسِ الخُفَّينِ.

(باس) دەستی تەڕ هێنان بەسەر خوف دا دروستە [1] ئەگەر ئەم سێ مەرجە بێنـ‌دی: یەکەم: ئەگەر پاش پاکی لەپێ کرابن [2] دووەم: هەموو ئەو شوێنە داپۆشێت لەقاچدا کە پێویستە لەدەستنوێژدا بشۆرێت، سێیەم: بتوانرێت لەسەریان ئامۆشۆ بکرێت، بۆ یەکێك لەسەفەردا نەبێت تەنها ماوەی شەوو ڕۆژێك دەتوانێت ئەو کارە بکات بەڵام بۆ سەفەری ماوەکەی سێ‌شەو و سێ ڕۆژە [3] سەرەتای ماوەکەشی لەوکاتەوە دەست پێ دەکات کەپاش لەپێ کردنی خوفەکان بێ دەستنوێژ دەبێت.

(١) بەڵگە لەسەر ئەمە بوخاری (٣٨٠) موسلیم (٢٧٢) عن جرير (ﷺ): (أنه بال ثم توضأ ومسح على خفيه فقيل له: تفعل هذا؟ فقال: ((نعم رأيت رسول الله (ﷺ) بال ثم توضأ ومسح على خفيه)) ).

(جریر) جارێکیان میزی کرد ئینجا دەستنوێژی شۆرد بەڵام لەباتی شتنی قاچەکانی مەسحی خوفەکەی کرد لێیان پرسی: ووتی: ((پێغەمبەر (ﷺ) وای کردووە)).

(٢) بوخاری (٢٠٣) موسلیم (٢٧٤) عن المغيرة بن شعبة (ﷺ):قال: ((كنا مع النبي (ﷺ) ذات ليلة في مسير فافرغت عليه من الاداوة فغسل وجهه وغسل ذراعيه ومسح برأسه ثم أهويت لأنزع خفيه فقال: ((دعهما فإني أدخلتهما طاهرتين، فمسح عليهما)).

یەکێك لە ئەصحابە دەگێڕێتەوە: ((شەوێکیان لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بووم، بۆ دەستنوێژ ئاوم دەکرد بەدەستیا، کاتێك گەیشتە سەرقاچەکانی خەریك بووم خوفەکانی دابکەنم، فەرمووی: وازیان لێ بێنە، چونکە لەسەر پاکی لەپێم کردوون، ئیتر مەسحی کردن)).

(٣) موسلیم (٢٧٦) عن شريح بن هاني قال: (أتيت عائشة (ﷺ) أسألها عن المسح على الخفين فقالت: إئت عليا فإنه أعلم بهذا مني كان يسافر مع رسول الله (ﷺ) فسألته فقال: ((جعل رسول الله (ﷺ) ثلاثة أيام ولياليهن للمسافر ويوما وليلة للمقيم)) ).

(یەکێك لەئەصحابە دەچێتە خزمەت عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) تا پرسیاری مەسحی لێ بکات ئەویش دەڵێت: بچۆ بۆ لای علی (خوای لێ ڕازی بێت) ئەو لەمن شارەزاترە کە چوو بۆلای فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) سێ شەوو سێ ڕۆژی بۆ مسافرو یەك شەوو ڕۆژی بۆ ئەوەی لەماڵەوەیە بڕیار داوە)).

فَإن مَسَحَ في الحَضَرِ ثُمَّ سافَرَ، أومَسَحَ في سَفَرٍ ثُمَّ أقامَ أتمَّ مَسحَ مُقيم.
وَيَبْطُلُ المَسحُ بثلاثةِ أشياءَ: بِخلعِها، وَانقِضاءِ المُدّةِ وَمايُوجِبُ الغُسلَ.
(فصلٌ) وشرائِطُ التَّيَمُّمِ خَمسَةُ أشياءَ: وُجودُ العُذرِ، بِسَفَرٍ أو مَرَضٍ، وَدُخولُ وَقتِ الصَّلاةِ، وَطلَبُ الماءِ، وَتَعذرُ إستِعمالِه، وإعوازُهُ بعدَ الطَّلَبِ، وَالتُّرابُ الطاهِرُ لَهُ غُبارٌ، فَإنْ خالَطَهُ جِصٌّ أو رَملٌ لَم يَجُز.

ئەگەر لەماڵ دەستی پێ کردو ئینجا چوو بۆ سەفەر یان لەسەفەردا دەستی پێ کرد بوو بەلام گەڕایەوە بۆ ماڵ ئەوا هەرتەنها شەوو ڕۆژێك بۆی هەیە مەسح بکات. بەسێ شت مەسحەکە بەتاڵ دەبێتەوە: هەر کاتێك دایان بکەنێت، کەماوەکە تەواو بوو، یان غوسلی لەسەر واجب بوو.[1]

(باس) مەرجەکانی تەیەموم پێنج شتن: بیانوویەکی ڕاستی هەبێت وەك سەفەر یان نەخۆشی،[2] کاتی نوێژ هاتبێت،[3] بەدوای ئاودا بگەڕێ، نەتوانێت ئاوبەکاربێنێ، پاش گەڕان بەدوای ئاودا دەستی نەکەوێت، گڵێکی پاکی تۆزاوی دەست بکەوێت، ئەگەر ئەو گڵە گەچ یان ڕەملی تێکەڵ بوو ئەوا بەکاری تەیەموم نایەت.

(١) الترمذي (٩٦) النسائي (٨٣/١) صفوان بن عسال (ﷺ) قال: ((كان رسول الله (ﷺ) يأمرنا إذا كنا مسافرين أن نمسح على خفافنا ولا ننزعها ثلاثة أيام من غائط وبول ونوم إلا من جنابة)).

((پێغەمبەر فرمانی پێ دەکرێن کاتێ کەلە سەفەردا بووینایە تاسێ ڕۆژ خوفەکان دانەکەنین لەبەر میزو پیسایی وخەوەگەر بۆ لەش پیسی ئەو کاتە بەتاڵ دەبۆوە.

(٢) بوخاری (٣٢٨) عن جابر (ﷺ) أن النبي (ﷺ) قال: ((وجعلت لي الأرض مسجدا وطهورا فإيما رجل من أمتي أدركته الصلاة فليصل)) (وعند أحمد) (٢٢٢/٢) ((إينما أدركتني الصلاة تمسحت وصليت)).

جابر (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((خوای گەورە هەموو زەوی بۆ کردووم بە مزگەوت و خاکەکەشی پاککەرەوەیە هەر یەکێك کاتی نوێژی هات با نوێژەکەی بکات، (أحمد) (٢٢٢/٢) ((لەهەر شوێنێك کاتی نوێژ هات تەیەموم بکات و نوێژ بکات)).

هەر ئەو ڕیوایەتەکە ئەوە دەردەخەن کە تا کاتی نوێژ نەیەت نابێت تەیەموم بکرێت.

(٣) بوخاری (٣٤١) مسلم (٦٨٢) عن عمران بن حصين (ﷺ) قال: ((كنا عند رسول الله (ﷺ) في سفر فصلى بالناس فإذا هو برجل معتزل فقال: مامنعك أن تصلي؟ قال: أصابتني جنابة ولا ماء قال: عليك بالصعيد فإنه يكفيك)).

((ئەسحابەیك دەگێڕێتەوە لەسەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) نوێژمان کرد پیاوێك لەولاوە دانیشتبوو نوێژی نەکرد پێغەمبەر (ﷺ) لێی پرسی بۆچی نوێژ ناکات؟ لەوەلامدا وتی: لەشم پیسەوئاویش نییە ئەویش فەرمووی تەیەموم بکە)).

وَفَرائِضُهُ أَربعةُ أشياءَ: النيةُ، وَمَسحُ الوَجهِ، وَاليَدينِ مَعَ المِرفَقَينِ، والتَّرتيبُ، وَسُنَنُهُ ثَلاثةُ أشياءَ:التَّسمِيَةُ، وَتقديمُ اليُمنىَ علىَ اليُسرىَ، وَالمُوالاةُ. والذي يُبطِلُ التَيمُّمَ ثلاثةُ أشياءَ: ما أبطَلَ الوُضوءَ، وَرؤيةُ الماءِ في غيرِ وقتِ الصلاةِ، والرِّدَّةُ.

وَصاحِبُ الجَبائِرِ يَمسَحُ علَيها وَيَتَيَمَّمُ وَيُصَلّي وَلا إعادَةَ عليهِ إن وَضَعَها علىٰ طُهرٍ.

فەرزەكانی تەیەمووم چوار شتن: نیەت هێنان، مەسحی دەم و چاو و هەر دوو دەست لەگەڵ ئانیشكە،[1] تەرتیب لە نێوان ئەم كارانەدا، سوننەتەكانی سێ شتن: ووتنی بسم الله، لای ڕاست پێش چەپ خستنن یەك بەدووای یەكدا بكرێن،[2] هۆیەكانی بەتاڵ بوونەوەی تەیەموم سێ شتن: ئەوانەی دەستنوێژیان بەتاڵ دەكردەوە، بینینی ئاو لەپێش دابەستنی نوێژەكە،[3] كافربوون.

ئەگەر شوێنێكی دەستنوێژ بریندار بوو ئەوا ئەی بەستێ ومەسحی دەكات وتەیەموم دەكات ونوێژەكەی دەكات و گەڕانەوەی لەسەر نی یە ئەگەر لەسەر پاكی بە ستبێتی.[4]

(١) ئایەتی: ﴿فتيمموا صعيدا طيبا فامسحوا بوجوهكم وأيديكم منه﴾ (المائدة: ٦).

(٢) چونكە ئەمە لەبری دەستنوێژە كردارەكانی ئەوی تیارەچاو دەكرێت.

(٣) واتە ئەگەر لەكاتی كردنی نوێژەكەدا ئاوی بینی ئەوا بەتاڵ نابێتەوە چونكە تازە فەرزەكەی بەجێ هێناوە.

(الترمذي) (١٢٤) (ان أبي ذر (رضي الله عنه) أن رسول الله (ﷺ) قال: ((أن الصعيد الطيب طهور المسلم وإن لم يجد الماء عشر سنين فإذا وجد الماء فليمسه بشرته فإن ذلك خير)).

((گڵی پاك پاككەرەوەیە بۆ موسڵمانان با ماوەی (دە) ساڵ ئاوی دەست نەكەوێت هەر كاتێك ئاوی دەست كەوت ئەبێت ئەو بەكار بهێنێت چونكە ئەو باشترە)).

(٤) أبوداو (٣٣٦) عن جابر (رضي الله عنه) قال: ((خرجنا في سفر فأصاب رجلا منا حجر فشجه في رأسه ثم إحتلم فسأل أصحابه: هل تجدون لي رخصة في التيمم؟ فقالوا: ماتجدلك رخصة وأنت تقدر على الماء فأغتسل فمات فلما قدمنا على رسول الله (ﷺ) أخبر بذلك فقال: قتلوه قتلهم الله ألا سألوا إذا لم يعلموا؟ فإنما شفاء: العي السؤال إنما كان يكفيه أن يتيمم ويعصر –أويعصب– جرحه ثم يمسح عليه ويغسل سائر جسده)).

جابر (خوای لێ ڕازی بێت) ئەگێڕێتەوە: (لەسەرفەردا بووین بەردێك بەر سەری پیاوێك كەوت و شكاندی شەو ئیحتلام بوو لە هاوڕێكانی پرسی داخوا دەتوانێت تەیەمموم بكات ئەوانیش وتیان مادام ئاو هەیە نابێت تەیممووم بكەیت ئەویش خۆی شۆردو ئیتر مرد كە هاتینەوە بۆ پێغەمبەرمان گێڕایەوە فەرمووی: ((خوابیان كوژێ ئەوان كوشتوویانە كەهەت نازانن بۆ ناپرسن ئەو پیاوە دەی توانی برینەكەی ببەستێ و تەیەمووم بكات ولەشەكەی تری بشوات)) ).

وَيَتَيَمَّمُ لِكُلِّ فَرِيضَةٍ وَيُصَلِّي بِتَيمُّم واحدٍ ماشاءَ مِنَ النَّوافِلِ.

(فَصلُ) وكلُّ مائعٍ خَرَجَ مِنَ السَّبيلَينِ نَجِسٌ إلا المَنيَّ، وغَسلُ جَميعِ الأَبوالِ وَ الأَوراثِ واجِبٌ إلا بَولَ الصَّبيِ الذي لَم يَأكلِ الطعامَ فإنهُ يَطهُرُ بِرَشِّ الماءِ عليهِ.

---

هەموو نوێژێکی فەرز تەیەمومی تایبەتی ئەوێت [1] بەڵام بەیەك تەیەمموم چەند سوننەتی بوێ دەی کات.

(باس) هەر شتێك لەپاش و پێش بێتە دەرێ پیسە، [2] بێجگە لە مەنی(تۆو) [3]، شتنەوەی هەموو جۆرە میزو پیسایی‌یەك واجبە [4] بێجگە لە میزی منداڵی شیرە خۆرە کەلەشیر زیاتر نەخوات کە بەڵێ پرژاني ئاو بەسەریا پاك دەبێتەوە. [5]

---

(١) البيهقي (١/٢٢) عن إبن عمر (ﷺ) قال: ((يتيمم لكل صلاة وإن لم يحدث)).

((هەموو نوێژێك تەیەمومی بۆ دەکرێت با دەستنوێژەکەشی نەشکابێ)).

(٢) بوخاری (٢١٤) عن أنس (ﷺ) قال: ((كان النبي إذا تبرز لحاجته أتيته بماء فيغسل به)).

ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: ((هەرکاتێك پێغەمبەر بۆ دەست بەئاو گەیاندن بڕۆیشتایە ئاوم بۆ دەبردو خۆی پێ دەشۆرد)).

بوخاری (١٥٥) عن عبدالله بن مسعود (ﷺ) قال: ((أتى النبي (ﷺ) الغائط فأمرني ان آتيه بثلاثة أحجار فوجدت حجرين والتمست الثالث فلم أجده فأخذت روثة فأتيته بها فإخذ الحجرين والقى الروثة وقال: ((هذا ركس)) ).

عبدالله بن مسعود دەڵێت: (پێغەمبەر (ﷺ) داوای لێ کردم سێ بەردی بۆ ببەم بۆ ئەوەی خۆی پێ پاك بكاتەوە منیش هەردوو بەردم دەست کەوت پارچەیەك پیسایی ووشکم بۆ برد ئەویش وەری نەگرت وفەرمووی: ((ئەوە پیسە)) ).

(٣) هی مرۆڤ بێت یان هی گیانلەبەرانی دیکە بێجگە لەسەگو بەراز بەڵگە لەسەر مرۆڤ: (موسلیم) (٢٨٨) عن عائشة (ﷺ) قالت: ((كنت أفرك المني من ثوب رسول الله (ﷺ) ثم يذهب فيصلي فيه)).

((خێزانێکی پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێت: زۆر جار مەنی‌یەکەیم ئەپرواندو ئیتر نوێژی پێوە دەکرد. هی غەیری مرۆڤ: چونکە ئەساسی گیانلەبەرێکی پاکە)).

(٤) ((لەوە پێش باسمان کرد کاتێك عەرەبە دەشتەکی‌یەکە لە مزگەوتدا میزی کرد چۆن ئاویان پیاکرد)).

(٥) بوخاری (٢٢١) موسلیم (٢٢٧) ((عن أم قيس بنت محصن (ﷺ) أنها أتت بإبن لها صغير لم يأكل الطعام إلى رسول الله (ﷺ) فأجلسه في حجره فبال على ثوبه فدعا بماء فنضحه ولم يغسله)).

((ژنێك منداڵێکی ساوای هێنایە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) کەلە شیر زیاتر هیچی تری نەخواردبوو ئەویش خستیە سەر باوەشی میزی پیاکرد ئاوی بەسەردا پرژاندو نەی شۆردەوە)).

ولا يعفى عن شئ من النجاسات إلا اليسير من الدم والقيح ومالا نفس له سائلة: إذا وقع في الإناء ومات فيه فأنه لا ينجسه. والحيوان كله طاهر إلا الكلب والخنزير وماتولد منهما أو من أحدهما والميتة كلها نجسة إلا السمك و الجراد والآدمي.

ويغسل الإناء من ولوغ الكلب والخنزير سبع مرات إحداهن بالتراب،

---

هيچ پيسايي يەك عەفوى لیٚ ناكريٚت بێجگە لە خويٚنی كەم‌و زوو خاوی ‌ ‌ ‌يزن، هەرگيانلەبەريٚك خويٚنی لەبەر نەڕوات ئەگەر بكەويٚتە ناو دەفريٚكەوە وتيا بمريٚت پيسی ناكات. [1] گيانلەبەران هەموويان پاكن [2] بێجگە لە سەگ‌و بەرازو ئەوەی لەوان بكەويٚتەوە. [3] مردارەوەبوو هەموويان پيسن بێجگە لە ماسی‌و كوللەو‌مرۆڤ نەبيٚت [4]

ئەگەر سەگ يان بەراز دەميان خستە ناو دەفريٚكەوە ئەوا ئەبيٚت حەوت جار بشۆردريٚت: جاريٚكيان بە قوڕاو بيٚت، [5]

---

(١) بوخاری (٥٤٤٥) ((عن أبي هريرة (ﷺ) أن رسول الله (ﷺ) قال: ((إذا وقع الذباب في إناء أحدكم فليغمسه كله ثم ليطرحه فإن في أحد جناحيه شفاءوفي الآخر داء)).

پێغەمبەر فەرموويەتی: ((ئەگەر مێش كەوتە ناو دەفری يەكێكتانەوە با نقومی بكات‌و پاشان فرێی بدات چونكە باڵێكی شيفايە‌و باڵێكی دەردە)).

دیارە ئەگەر پیس بوایە داوای نقوم كردنی نەدەكرد، هەر گيانلەبەريٚكيش كە خوێنی لەبەر نەڕوات وەك ئەم وایە.

(٢) واتە: هەموويان لە حاڵی ژيانيان دا پاكن.

(٣) ئايەتی: ﴿أو لحم خنـــزير فإنه نجس﴾ (الأنعام: ١٤٥).

(٤) واتە: هەموو مردارەبووەكان بێجگە لەوانە پيسن ماسی‌و كوللە لە حەديسی: دوومردارەوەبوومان بۆ حەلاڵ كراوە: ماسی‌و كوللە.

(٥) بوخاری (١٧٠) موسليم (٢٧٩) عن أبي هريرة (ﷺ) أن رسول الله (ﷺ) قال: ((إذا شرب الكلب في إناء أحدكم فليغسله سبعا)) وفي رواية مسلم ((طهور إناء أحدكم إذاولغ فيه الكلب أن يغسله سبع مرات أولاهن بالتراب)).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتی: ((ئەگەر سەگ دەمی خستە دەفری يەكێكتانەوە با حەوت جار بی شوات يەكەميان بە قوڕاوبێت، ديارە فەرقی سەگ‌و بەراز نیيە دەم وشوێنەكانی تر جياوازيیان نیيە.

وَيُغسَلُ مِن سائِرِ النَّجاساتِ مَرَّةً تأتي عَليه وَالثَّلاثَةُ أَفضَلُ وَإذا تَخَلَّلَت الخَمرةُ بِنفسِها طَهُرَت وإن خُلِّلَتْ بِطَرحِ شَئٍ فِيها لَم تَطهُر.

(فَصلٌ) وَيَخرُجُ مِنَ الفَرجِ ثَلاثَةُ دِماءٍ: دَمُ الحَيضِ وَالنِّفاسِ والإستِحاضَة، فالحَيضُ: هُوَ الدَمُ الخَارِجُ مِن فَرجِ المَرأَةِ عَلى سَبيلِ الصِّحَّةِ مِن غَيرِ سَبَبِ الوِلادَةِ

بەلأم ئەگەر پیسی‌یەکانی تر بوو ئەوایەك جار کافی‌یەو سێ جاریش باشترە.[1]

ئەگەر شەراب لەخۆیەوەبووبە سرکە ئەوا پاکە[2] بەلأم ئەگەر بەهۆی خستنەناوی شتێکەوە بوو بەسرکە ئەوا پاك نابێتەوە.[3]

(باس) لەکۆئەندامی زاوزێی ئافرەتەوە سێ جۆر خوێن دێتەدەرەوە: خوێنی حەیز، خوێنی منالبوون، حەیزی بەردەوام.

حەیز: ئەو خوێنەیەکە لەکاتی تەندروستی و بەبێ هۆی منالبوونەوە دێتەردەرێ[4].

(١) أبوداود (٢٤٧) ((عن إبن عمر (رضي الله عنه): كانت الصلاة خمسين والغسل من الجنابة سبع مرار وغسل البول سبع مرار فلم يزل رسول الله (ﷺ) يسأل -أي يسأل الله التخفيف- حتى جعلت الصلاة خمسا والغسل من الجنابة مرة وغسل البول من الثوب مرة)).

(لەپێشدا نوێژەکان پەنجا بوون وغوسلی لەش پیسی حەوت جارو شتنەوەی میز حەوت جار بەلأم پێغەمبەر (ﷺ) زۆر داوای کرد کە لەسەری سووك بکرێن تا نوێژەکان بوون بە پێنج و غوسلیش یەك جار وشتنەوەی میز یەك جار لەرقی میزو ئەوانی تریش نییە.

(٢) چونکە هۆی پیسی‌یەکەی سەرخۆش کردنەکەبوو بەسرکە ئیتر ئەوەی نامێنێت.

(٣) چونکە ئەو شتەی کە دەکرێتەناوی یەکسەر بەهۆی شەرابەکەوە پیس دەبێت کە بوویەسرکە ئەو شتە پیسی دەکات.

(٤) بوخاری (٢٩٠) موسلیم (١٢١١) عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: خرجنا لانرى إلا الحج فلما كنا بسرف حضت فدخل علي رسول الله (ﷺ) وأنا أبكي قال: ((مالك أنفست؟)) قلت: نعم قال: ((إن هذا أمر كتبه الله على بنات آدم فاقضي مايقضي الحاج غير أن لاتطوفي بالبيت)) وفي رواية ((حتى تطهري)).

لەعائیشەوە (خوای لێ رازی بێت) : کاتێك کەبۆ حەج دەچووین‌من لە نزیك مکە تووشی حەیز بووم: دەستم کرد بەگریان پێغەمبەر فەرمووی: ((ئەمە شتێکە خوا لەسەر کچانی ئادەمی داناوە، ئەتوانی هەموو کردارەکانی حەج بکەی بێجگە لەتەوافی مالی خوا)).

ولونه أسود محتدم لذاع، والنفاس: هو الدم الخارج عقب الولادة.
والإستحاضة: هو الدم الخارج في غير أيام الحيض والنفاس.
وأقل الحيض يوم وليلة وأكثره خمسة عشرة يوما وغالبه ست أو سبع
وأقل النفاس لحظة وأكثره ستون يوما وغالبه أربعون يوما وأقل الطهر بين الحيضتين خمسة عشر يوما، ولا حد لأكثره.
وأقل زمن تحيض فيه المرأة تسع سنين.

ڕەنگی ڕەشەو گەرمەو بەئازارە.[1]
خوێنی منداڵبوون: ئەو خوێنەیە کە دوای منداڵبوون دێتە دەرەوە.
خوێنی بەردەوام: ئەو خوێنەیە کەلە غەیری ڕۆژانی حەیز یان منداڵ بوون دا دێتە دەرەوە.[2]
کەمترین ماوەی حەیز شەوو ڕۆژێکەو زۆر ترینی پانزە ڕۆژەو زۆربەکەی شەش یان حەوت ڕۆژە، کەمترین ماوەی خوێنی دوای منداڵ بوون ساتەوەختێکەو زۆر ترینی شەست ڕۆژەو زۆربەی چل ڕۆژە.
کەمترین ماوەی نێوان دوو حەیز پانزە ڕۆژە بەڵام سنووری دیاری کراو بۆ زۆرترین ماوەی نی یە. کەمترین تەمەن بۆ ئافرەت کەتیا تووشی حەیز دەبێت نۆ ساڵی یە.[3]

(١) ئەبوداود (٢٨٦) عن فاطمة بنت أبي حبيش: أنها كانت تستحاض وقال لها النبي (ﷺ): ((إذاكان دم الحيضة فإنه دم أسود يعرف، فإذا كان ذلك فأمسكي عن الصلاة وإذا كان الأخر فتوضئي وصلي فإنما هو عرق)).
پێغەمبەر (ﷺ) بە ئافرەتێکی فەرموو کە تووشی ئەم جۆرە خوێنە بووبوو ئەگەر خوێنی حەیزت هەبوو کەناسراوە لەلایەن ئافرەتانەوە ئەوا واز لە نوێژکردن بێنە، ئەگەر ئەوی تربوو ئەوا دەستنوێژ بشۆو نوێژ بکە ، ئەوە ڕەگە تووشی خوێن بەربوون بووە.
(٢) بوخاری (٢٢٦) موسلیم (٣٣٣) عن عائشة (﵂) قالت: جاءت فاطمة بنت أبي حبيش إلى النبي فقالت: يارسول الله أني أمرأة أستحاض فلا أطهر أفأدع الصلاة؟ فقال رسول الله: ((إنما ذلك عرق وليس بالحيضة فإذا أقبلت الحيضة فأتركي الصلاة وإذا ذهب قدرها فأغسلي عنك الدم وصلي)).
عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ووتی: من هەرگیز پاك نابمەوە ئایا ئەبێت تەرکی نوێژ بکەم؟ ئەویش فەرمووی: ((ئەوە حەیز نی یە ئەگەر کاتی حەیزبوو ئەوا نابێت نوێژ بکەی، ئەگەر ئەو ماوەیە تەواو بوو ئەوا خۆت بشۆو نوێژ بکە)).
(٣) ئەم تەقدیرانە لەسەر ئەساسی عادەت دانراونو لەواقع دا تاڕادەیەك ڕاستن
أبوداود (٣١١) عن أم سلمة (﵂) قالت: (كانت النفساء تجلس على عهد رسول الله أربعين يوما).
لە ئوم سەلەمەوە (خوای لێ ڕازی بێت): (جاران ژنی تازە منداڵ بوو چل ڕۆژ سەبری دەگرت). دیارە ئەمە مانای ئەوە نی یە کەلەو ماوەیە زیاتر نابێت.

**وَأَقَلُّ الحَملِ سِتَّةُ أَشهُرٍ، وَأَكثَرُهُ أَربعُ سِنِينَ، وَغالِبُهُ تِسعَةُ أَشهُرٍ.**
**وَيَحرُمُ بِالحَيضِ وَالنِّفاسِ ثَمانِيَةُ أَشياءَ: الصَّلاةُ، الصَّومُ وَقِراءَةُ القُرآنِ،**

**کەمترین ماوەی سك پڕی شەش مانگەو زۆرترینی ماوەی چوار ساڵەو زوربەکەشی نۆ مانگە.[1]**

**بەهۆی حەیزو منداڵ بوونەوە (النفاس) هەشت شت حەرام دەبن:**
**نوێژ، ڕۆژوو،[2] خوێندنی قورئان،[3]**

---

(١) بەڵگە لەسەر کەمترین ماوەی سك پڕی ئایەتی: ﴿وحمله وفصاله ثلاثون شهرا﴾ (الأحقاف: ١٥)، ئایەتی: ﴿وفصاله في عامين﴾ (لقمان: ١٤) دیارە ئەگەر ماوەی سك پڕیو لەشیر بڕینەوە بکاتە سی مانگو شیر بڕینەوەش ماوەی دوو ساڵ بێت کەواتە: کەمترین ماوەی سك پڕی دەکاتە شەش مانگ.

(٢) بوخاری (٢٨٩) موسلیم (٨٠) عن أبي سعيد الخدري (ﷺ) أن رسول الله (ﷺ) قال: ((في المرأة وقد سئل عن نقصان دينها: أليس إذا حاضت لم تصل ولم تصم)).

پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی ئافرەتەوە فەرمووی: ((لەبەر ئەوەی کە لەکاتی حەیزدا نوێژ ناکاتو ڕۆژوو ناگرێت ئاینی نوقسانە پێویستە ڕۆژووەکانی بگرێتەوە، بەلام نوێژەکانی ناگێڕێتەوە)).

بوخاری (٣١٥) موسلیم (٣٣٥) (عن معاذة قالت: سألت عائشة (ﷺ) فقلت: ما بال الحائض تقضي الصوم ولا تقضي الصلاة:؟ قالت: كان يصيبنا ذلك مع رسول الله فنؤمر بقضاء الصوم ولا نؤمر بقضاء الصلاة).

ئافرەتێك دەگێڕێتەوە دەڵێت: لە عائشەم پرسی بۆچی حەیزدار ئەبێت ڕۆژووەکانی بگرێتەوە بەلام نوێژەکانی دووبارە ناگێڕێتەوە؟ فەرمووی: (لەسەردەمی پێغەمبەر لەو کاتەدا کەتووشی حەیز دەبووین فەرمانی پێ دەکردین کە ئەبێت ڕۆژووەکان بگرێتەوە بەلام نوێژ نا).

(٣) إبن ماجة (٥٩٦) عن إبن عمر (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ): ((لايقرأ الجنب والحائض شيئا من القرآن))

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لەش پیسو حەیزدار نابێت بەهیچ جۆرێك قورئان بخوێنن)).

وَمَسُّ المُصحَفِ وَحَمْلُهُ
وَدُخولُ المَسجِدِ وَالطَّوافُ وَالوَطْءُ والإستِمتاعُ بمابَينَ السُّرَّةِ وَالرُّكبَةِ.

دەست لێدانی قورئانو هەڵگرتنی، [1] چوونە ناو مزگەوت، [2] تەوافی ماڵی خوا، [3] كاری شەرعی، [4] سوود وەرگرتن لەنێوان ناوكو ئەژنۆی ئافرەت. [5]

(١) ئايەتی: ﴿لايمسه إلا المطـــهرون﴾ (الواقعة: ٧٩). الدارقطني (١٢١/١) مالك في الموطأ (١٩٩/١) قال (ﷺ): ((أن لايمس القرآن إلا طاهرٌ)).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتی: ((بێجگە لەمرۆڤی لەش پاك نابێت كەس دەست لەقورئان بدات)).

(٢) ئەمە كاتێك حەرامە ئەگەر مەترسی پیس بوونی مزگەوتەكەی هەبێت، ئەگینا بەس مانەوە تیایدا حەرامە.

أبوداود (٢٣٩) عن عائشة (ﷺ) عن رسول الله (ﷺ) قال: ((لا أحل المسجد لحائض ولا جنب)).

موسليم (٢٩٨) عن عائشة (ﷺ) قالت: قال لي رسول الله ((ناوليني الخمرة من المسجد)) فقلت: إني حائض فقال: ((إن حيضتك ليست في يدك)).

النسائي (١٤٧/١) عن ميمونة (ﷺ) قالت: وتقوم أحدنا بالخمرة إلى المسجد فتبسطها وهي حائض)).

(چەند ئافرەتێك دەگێڕنەوە كە چۆن لەكاتی حەیزدا ئاموشۆی مزگەوتیان كردووە، بۆ بەرماڵ ڕاخستن).

(٣) الحاكم (٤٥٩/١) عن إبن عباس (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ): ((إن الطواف بالبيت مثل الصلاة، ألا إنكم تتكلمون، فمن تكلم فلا يتكلم إلا بخير)).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتی: ((تەواف وەك نوێژ وايە)).

(٤) ئايەتی: ﴿فأعتزلوا النساء .....﴾ مەبەست دوور كەوتنەوەیە لە كاری شەرعی.

(٥) أبوداود (٢١٢) عن عبدالله بن (ﷺ) أنه سأل رسول الله (ﷺ) : ((ما يحل لي من إمرأتي وهي حائض؟ قال: لك مافوق الإزار)).

ئەصحابەیەك لە پێغەمبەری پرسی: لەكاتی حەیزدا چی ئافرەت حەڵاڵە؟ فەرمووی: ((بێجگە لەنێوانی ناوكو ئەژنۆ ئەوی تر حەڵاڵە)). دیارە (نفاس)یش وەك حەیزە.

وَيَحرُمُ علىٰ الجُنُب خَمسةُ أشياءَ: الصَّلاةُ، وقِراءةُ القُرآن، وَمَسُّ المَصحَفِ وَحَملُهُ، وَالطَّوافُ، وَاللُّبثُ في المَسجِدِ،

وَيَحرُم علىٰ المُحدثِ ثَلاثةُ أشياءَ: الصَّلاةُ، وَالطَّوافُ، وَمَسُّ المَصحَفِ وَحَملُهُ.

لەش پیس پێنج شتی لێ حەرامە: نوێژ،[1] خوێندنی قورئان، دەست لێ دانی قورئانو هەڵگرتنی، تەواف، مانەوە لەمزگەوتدا.

یەکێك دەست نوێژی نەبێت سێ شتی لێ حەرامە: نوێژ، تەواف، دەست لێ دانی قورئانو هەڵگرتنی.[2]

(١) ئایەتی: ﴿ولا تقربوا الصلاة وأنتم سكارى حتى تعلموا ماتقولون ولاجنبا إلا عابري سبيل حتى تغتسلوا﴾ (النساء: ٤٣)..واتە: بەسەر خۆشی نوێژ مەکەن بۆ ئەوەی ئاگاتان لەقسەکانتان هەبێت، هەروەها لەش پیس تا خۆی نەشوات نابێت نوێژ بکات.

موسلیم (٢٢٤) عن إبن عمر (ﷺ) قال: إني سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: ((لاتقبل صلاة بغير طهور)).

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((نوێژ بێ دەست نوێژ قبوڵ نىيە)).

(٢) بوخاری (٦٥٥٤) موسلیم (٢٢٥) عن أبي هريرة (ﷺ) عن النبي (ﷺ) قال: ((لا يقبل الله صلاة أحدكم إذا أحدث حتى يتوضأ))

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر یەکێك دەست نوێژی نەبێت نابێت نوێژ بکاتو پێویستە دەست نوێژ بشوات)).

# كتابُ الصَّلاةِ

**الصَّلاةُ المَفروضَةُ خَمسٌ:**

**الظُّهرُ: وَأَوَّلُ وقتِها زَوالُ الشَّمسِ، وَآخِرُهُ إِذاصارَ ظِلُّ كُلِّ شَيءٍ مِثلَهُ بعدَ ظِلِّ الزَّوالِ.**

## بـاسى نويژ(1)

**نويژه فەرزەكان پێنجن:**

**نيوەڕۆ: كاتەكەى لەو كاتەوە دەست پێ دەكات كەخۆر لەناوەڕاستى ئاسمان لادەدات، دواكاتيشى لەو كاتەيەكە سێبەرى هەموو شتێك بەقەدەر خۆى لێ‌دێت، بێجگە لەو سێبەرەى كەلەكاتى لادانى خۆر لەناوەڕاستى ئاسمان بوويەتى**

(1) ئايەتى: ﴿إن الصلاة كانت على المؤمنين كتابا موقوتاً﴾ (النساء: 102).

بوخارى (8) موسليم (16) قال رسول الله (ﷺ): ((بني الإسلام على خمس: شهادة أن لاإله إلا الله وأن محمداً رسول الله، وإقام الصلاة، وإيتاء الزكاة والحج وصوم رمضان)).

((ئيسلام لەسەر پێنج پايە دامەزراوە شايەت‌و ئيمان‌و نوێژكردن...))

بوخارى (342) موسليم (163): جاء في حديث الإسراء: ((ففرض الله على أمتي خمسين صلاة فراجعته فقال: هي خمس وهي خمسون لايبدل القول لدي)).

لەحەديسى ميعراج كە: ((نوێژ لەپێشدا پەنجابوون دوايى كران بەپێنج)).

موسليم (614) عن أبي موسى الأشعري (رضي الله عنه) عن رسول الله (ﷺ) أنه: ((أتاه سائل يسأله عن مواقيت الصلاة فلم يرد عليه شيئا قال: فأقام الفجر حين إنشق الفجر والناس لايكاد يعرف بعضهم بعضا، ثم أمره فأقام بالظهر حين زالت الشمس والقائل يقول قد إنتصف النهار وهو كان أعلم منهم ثم أمره فأقام بالعصر والشمس مرتفعة، ثم أقام بالمغرب حين وقعت الشمس ثم أمره فأقام بالعشاء حين غاب الشفق، ثم أخر الفجر من الغد حين إنصرف منها والقائل يقول قد طلعت الشمس أو كادت، ثم أخر الظهر حتى كان قريبا من وقت العصر بالأمس، ثم أخر العصر ثم إنصرف منها والقائل يقول قد إحمرت الشمس، ثم أخر المغرب حتى كان عند سقوط الشفق، ثم أخر العشاء حتى كاد ثلثي الليل الأول، ثم أصبح فدعا السائل فقال: ((الوقت بين هذين)) )).

((پياوێك هاتە خزمەت پێغەمبەرو (ﷺ) پرسيارى كاتى نوێژەكانى كردو ئەويش كاتى سەرەتاو دوايى بۆديارى كردو پێى ووت: كاتەكەيان لەنێوان ئەو دوو كاتەيە)).

وَالعَصرُ: وأوَلُ وَقتِها الزِّيادَةُ عَلىٰ ظِلِّ المِثْلِ، وَآخِرُهُ في الإِختِيارِ إِلىٰ ظِلِّ المِثلَين.

وَالمَغرِبُ: وَوَقتُها واحِدٌ وهو غروبُ الشَّمسِ، وَ بِمِقدارِ مايُؤَذِّنُ وَيَتَوَضَّأ وَيَستُرُ العورَةَ وَيُقيمُ الصَّلاةَ، وَيُصَلِّي خمسَ رَكعاتٍ.

وَالعِشاءُ: وأوَلُ وقتِها إِذا غابَ الشَّفَقُ الأَحمَرُ، وَآخِرُهُ في الإِختِيارِ إِلىٰ ثُلُثِ اللَّيلِ، وَفي الجَوازِ إِلىٰ طُلوعِ الفَجرِ الثاني.

عەسر: لەو كاتەوە دەست پێدەكات كە سێبەری شتەكە لەخۆی زیاتر دەبێت، دواكاتیشی ئەو كاتەیە كەسێبەری شتەكان دەبێتە دووقاتی شتەكەو باشتر وایە لەمەزیاتر دوانەخرێت بەلام تا ڕۆژئاواش دروستە بكرێت.[1]

شێوان: یەك كاتی هەیە ئەویش لەئاوابوونی خۆرەوە دەست پێ دەكات بەقەدەر ئەوەندەی كەبانگ بدرێ‌و دەست نوێژ هەلبگیرێت‌و خۆی لەبەر بكات‌و بەقەدەر نوێژێكی پێنج ڕكاتی ماوەی هەیە.[2]

خەوتنان: لەئاوابوونی سوورایی قەراغ ئاسمان تا سێ‌یەكی شەو دەڕوات، باش وایە لەمە زیاتر دوانەخرێت بەلام تا هەلهاتنی سپێدەی دووەم هەر دروستە.[3]

(١) بوخاری (٥٥٤) موسلیم (٦٠٨) عن أبي هريرة (رضي الله عنه): أن رسول الله (ﷺ) قال: ((من أدرك من الصبح ركعة قبل أن تطلع الشمس فقد أدرك الصبح ومن أدرك ركعة قبل أن تغرب الشمس فقد أدرك العصر))

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەگەر یەكێك پێش هەلهاتنی خۆر فریا ڕكاتێك بكەوێت ئەوە نوێژەكەی دروستە هەروەها پێش خۆر ئاوابوون فریا ڕكاتێكی عەسر بكەوێت ئەوا نوێژەكەی دروستە)).

(٢) ئیمامی شافعی دوو ڕای دەربارەی كاتی شێوان هەیە، ئەمەیان ڕا تازەكەیەتی بەلام ڕاكەی تری ئەوەیەتائاوابوونی سورایی كەناری ئاسمان دەوام دەكات. ئەمەیان پێ ڕاستترە.

(٣) موسلیم (٦٨١) عن أبي قتادة (رضي الله عنه): أنه (ﷺ): ((قال أما إنه ليس في النوم تفريط إنما التفريط على من لم يصل الصلاةحتى يجيء وقت الصلاة الأخرى))

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (كەس دەسەلاتی خەوی نی‌یە بەلام بێ موبالاتی‌یە كە لەوەدایە كە یەكێك نوێژ دوا بخات تاكاتی ئەوی تر دەگات، ئەمە بەلگەیە لەسەر ئەوە كە هەموو نوێژێك بێجگە لە نوێژی بەیانی تاكاتی نوێژەكەی تر دەوام دەكات.

مەبەست لەسپێدەی دووەم: ئەو ڕووناكی‌یەیە كەبەپانی ئاسمان دەگرێتەوە دوای ئەوە شەوقی ڕووناكی‌پەیدا دەبێت، بەلام سپێدەی یەكەم وەك لاكێشێكی درێژ كولَە دەرئەكەوێت‌وپاشان تاریك دەبێتەوە.

وَالصُّبحُ: وأَولُ وقتِها طُلوعُ الفجرِ الثّاني وَآخِرُه في الإختِيار إلى الإسْفارِ وفي الجَوازِ إلى طُلوعِ الشَّمسِ.

(فَصلٌ) وَشرائِطُ وُجوبِ الصَّلاةِ ثَلاثَةُ أشياءَ: الإسلامُ، والبُلوغُ والعَقلُ، وهو حَدُّ التَّكليفِ.

وَالصَّلَواتُ المَسنوناتُ خَمسُ العيدانِ، والكُسوفانِ والإستِسقاءِ، والسُّنَنُ التّابِعةُ لِلفَرائِضِ سَبعَ عَشرَةَ رَكعةً: رَكعتا الفَجرِ،

---

بەیانی: سەرەتای کاتەکەی لە هەڵهاتنی سپێدەی دووەمەوە تا بەتەواوی دنیا ڕووناك دەبێتەوە باش وایە لەمە زیاتر دوانە خرێت بەڵام تا هەڵهاتنی خۆر دروستە.

(باس) مەرجەکانی واجب بوونی نوێژ سێ شتن: [1] ئیسلام، [2] بالغ بوون، ئەقڵ و هۆش، بەمانە حەدی تەکلیف دێتەدی، نوێژە سوونەتەکان پێنجن: [3] دووجەژنەکە، مانگ گیران و خۆرگیران، نوێژەبارانە، بەڵام ئەو نوێژە سوونەتانەی کە پاشکۆی فەرزەکانن حەڤدە ڕکاتن: دووڕکاتی بەیانی، [4]

---

(١) واتە: ئەگەر ئەم سێ مەرجە هاتنەدی ئەوا مرۆڤ دەبێت نوێژویاقی ئەرکە شەرعییەکانی تر بەجێ بێنێت ئەگینا تەکلیفی لەسەر نییە.

(٢) بوخاری (١٣٣١) موسلیم (١٩) عن إبن عباس (ﷺ) أن النبي (ﷺ) بعث معاذا (ﷺ) إلى اليمن فقال: ((أدعهم إلى شهادة أن لاإله إلا الله وأني رسول الله فإن هم أطاعوك لذلك فأعلمهم أن الله قد إفترض عليهم خمس صلوات في كل يوم وليلة))..

پێغەمبەر (ﷺ) کەمعازی نارد بۆیەمەن پێی فەرموو: ((پاش ئەوەی کەشایەت و ئیمان یان هێنا داوایان لێ بکە کەلە شەوو ڕۆژێکدا پێنج نوێژ بکەن)).

أبوداود (٤٤٠٣) عن علی (ﷺ) عن النبي (ﷺ) قال: ((رفع القلم عن ثلاثة: عن النائم حتی یستیقظ وعن الصبي حتی یحتلم وعن المجنون حتی یعقل)).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((خوای مەزن تەکلیفی لەسەر ئەم کەسانە هەڵگرتووە، نووستو تا خەبەری دەبێتەوە، منالّ تا بالّغ دەبێت، شێت تا چاك دەبێتەوە)).

(٣) واتە: لەوانی تر خێریان زۆرترە چونکە سەریەخۆن و تەنانەت بەجەماعەت دەکرێن.

(٤) بوخاری (١١٦) موسلیم (٧٢٤) عن عائشة (ﷺ) قالت: ((لم یکن النبي (ﷺ) علی شيء من النوافل أشد تعاهدا منه علی رکعتي الفجر)).

عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: ((لەهەموو سوننەتەکان زیاتر پێغەمبەر (ﷺ) گرنگی بەدوو ڕکاتەکەی بەیانی ئەدا)).

**وَأَرْبَعٌ قَبْلَ الظُّهرِ،وَرَكْعَتانِ بَعْدَهُ، وأَرْبَعٌ قَبْلَ العَصرِ وَركعتانِ بَعْدَ المَغربِ**

**چوار ڕکات پێش نیوەڕۆ دووڕکات دوای نیوەڕۆ.[1] چوار ڕکات پێش عەسر،[2] دوو ڕکات دوای شێوان،[3]**

(١) بوخاری (١١٢٧) عن عائشة (ﷺ): ((أن النبي (ﷺ) كان لايدع أربعا قبل الظهر وركعتين قبل الغداة))

عائیشه (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە: ((پێغەمبەر (ﷺ) هەرگیز چوار ڕکاتەکەی پێش نیوەڕۆو دووڕکاتەکەی بەیانی فەرامۆش نەدەکرد)).

پاش نیوەڕۆ چوارڕکاتە بەپێی ڕیوایەتی هەر پێنج ڕاوییەکە.

الترمذي (٤٢٧-٤٢٨) عن أم حبيبة (ﷺ) قالت: سمعت النبي (ﷺ) يقول: ((من صلى أربع ركعات قبل الظهر وأربعا بعدها حرمه الله على النار)).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەرکەسێك چوار ڕکات پێش نیوەڕۆ چوار ڕکات دوای نیوەڕۆبکات لەئاگر بەدوور دەبێت))، هەینی وەك نیوەڕۆ وایە.

موسلیم (٨٨١) عن أبي هريرة (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ): ((إذا صلى أحدكم الجمعة فليصل بعدها أربعا)).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((کاتێك نوێژی هەینیتان کرد چوار ڕکات دوای ئەوە بکەن)).

(٢) الترمذي (٤٣٠) عن إبن عمر أن النبي (ﷺ) قال: ((رحم الله إمرأ صلى قبل العصر أربعا))

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((خوا ڕەحم بەو کەسە بکات کە پێش عەسر چوار ڕکات بکات، هەر دوو دوو بەجیا)).

(٣) بوخاری (١١٢٦) موسلیم (٧٢٩) عن إبن عمر (ﷺ) قال: ((حفظت من النبي (ﷺ) عشر ركعات: ركعتين قبل الظهر وركعتين بعدها وركعتين بعد المغرب في بيته وركعتين بعد العشاء في بيته وركعتين قبل صلاة الصبح كانت ساعة لايدخل على النبي (ﷺ) فيها)).

ئیبن و عومەر دەڵێت: ((دەڕکات نوێژم لە پێغەمبەرەوە لەبیر ماوە دوو پێش نیوەڕۆ دوو پاش نیوەڕو دوو پاش شێوان لەماڵەوە دووپاش خەوتنان لەماڵەوە دوو پێش بەیانی)).

واباشە پێش شێوان دووڕکات بەخێرایی بکرێت چونکە بوخاری (٥٩٩) موسلیم (٨٣٧) عن أنس (ﷺ) قال:((كنا بالمدينة فإذا أذن المؤذن لصلاة المغرب إبتدروا السواري فيركعون ركعتين ركعتين حتى أن الغريب ليدخل المسجد فيحسب أن الصلاة قد صليت من كثرة من يصليها)).

لەئەنس ەوە دەگێڕنەوەکە: (پێش شێوان دووڕکاتی خێرایان دەکرد)، هەروەها واباشە پێش خەوتنانیش دووڕکاتی خێرا بکرێت.

بوخاری (٦٠١) موسلیم (٨٣٨) عن عبدالله بن مغفل (ﷺ) قال: قال النبي (ﷺ): ((بين كل أذانين صلاة، بين كل أذانين صلاة ثم قال في الثالثة لمن شاء))

(واباشە لەنێوان بانگو قامەت دا نوێژ بکرێت).

**وَثَلاثٌ بَعْدَ العِشَاءِ، يُوتِرُ بِواحِدَةٍ مِنْهُنَّ وَثَلاثٌ نَوافِلَ مُؤَكَّدات: صَلاةُ اللَّيلِ،**

**سێ ڕكات دوای خەوتنان ڕكاتێك بەتەنها دەكات (الوتر) [1] سێ جۆرە سوننەتی تر هەن خێریان زۆرە: شەو نوێژ،[2]**

(١) موسلیم (٧٥٢) قال رسول الله (ﷺ): ((الوتر ركعة من آخر الليل)).

ویتر: بریتیە لەیەك ڕكات لەدواكاتەكانی شەودا كەمترینیان یەك ڕكاتە– سێ ڕكات یانزە ڕكات.

بوخاری (١٠٧١) موسلیم (٧٣٦) عن عائشة (ﷺ) قالت: ((كان رسول الله (ﷺ) يصلي ما بين أن يفرغ من صلاة العشاء إلى الفجر إحدى عشرة ركعة يسلم بين كل ركعتين ويوتر بواحدة فإذا سكت المؤذن من صلاة الفجر وتبين له الفجر وجاءه المؤذن قام فركع ركعتين خفيفتين ثم أضطجع على شقه الإيمن حتى يأتيه المؤذن للإقامة)).

عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە: ((پێغەمبەر (ﷺ) لەنێوان خەوتنانو بەیانیدا یانزە ڕكات نوێژی دەكرد دوو دوو بەجیاو دانەیەكیان بەتەنها كەبانگی بەیانیش ئەدرا دوو ڕكاتی نوێژی خێرای دەكرد تا قامەت دەكرا)).

أبوداود (١٤٢٢) عن أبي أيوب قال: قال رسول الله (ﷺ): ((الوتر حق فمن أحب أن يوتر بخمس فليفعل، ومن أحب أن يوتر بثلاث فليفعل، ومن أحب أن يوتر بواحدة فليفعل)).

((ویتر كارێكی باشە ج پێنج ڕكات ج سێ ڕكات ج یەك ڕكات)).

(٢) ئەمانە دوای ئەوانەن كەباسمان كردن، ئایەتی: ﴿ومن الليل فتهجد به نافلة لك﴾ (الإسراء: ٧٩).

واتە: لەشەودا واز لەخەو بێنەو نوێژ بكە سەرەڕای نوێژە فەرزەكان، دیارە لەسەر ئەو فەرز بووە.

## وَصَلاةُ الضُّحىٰ وَصَلاةُ التَّراويحِ

## نوێژی چەشتەنگاو،[1] نوێژی تەراویح[2]

(١) بوخاری (١٨٨٠) موسلیم (٧٢١) عن أبي هريرة (ﷺ) قال: ((أوصاني خليلي بثلاث، صيام ثلاثة أيام من كل شهر وركعتي الضحى، وأن أوتر قبل أن أنام)).

لـ ئەبو هورەیرەوە (خوای لیٚ ڕازی بێت): ((خۆشەویستم ئامۆژگاری کردم کەسێ ڕۆژ لەمانگێکدا بەڕۆژوو بم دوو ڕکات لەچێشتەنگاودا بکەم پێش نووستن نوێژی ویتر بکەم)).

کەمترینی دووڕکاتەو زۆر ترینی هەشتە.

بوخاری (٣٥٠) موسلیم (٣٣٦) في حديث أم هانيء (ﷺ): ((أنه لما كان عام الفتح أتت رسول الله (ﷺ) وهو بأعلى مكة فقام رسول الله (ﷺ) إلى غسله فسترت عله فاطمة ثم أخذ ثوبه والتحف به ثم صلى ثمانية ركعات سبحة الضحى)).

((لە ساڵی فەتحی مەککەدا پێغەمبەر (ﷺ) خۆی شۆرد ئینجا جلەکانی لەبەر کردەوەو هەشت ڕکات نوێژی چێشتەنگاوی کرد)).

کاتی ئەم نوێژە لەبەرزبوونەوەی خۆرەوەیە تا نیوەڕۆ، باشتر وایە لەچارەکی یەکەم دا بکرێت.

موسلیم (٧٤٨) عن زيد بن أرقم (ﷺ) قال: ((خرج النبي (ﷺ) على أهل قباء وهم يصلون الضحى فقال: ((صلاة الأوابين إذا رمضت الفصال من الضحى)) )).

جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) سەردانی مزگەوتی (قباء)ی کرد لەو کاتەدا نوێژی (الضحى)یان دەکرد ئەویش فەرمووی: ((خواپەرستان لەکاتی گەرمادا خوا دەپەرستن)).

(٢) پێی ئەوترێ: شەو نوێژی ڕەمەزان بیست ڕکاتە لەهەموو شەوێکدا دووڕکات دووڕکات دەکرێت کاتەکەی لەنێوان خەوتنانو بەیانی دایەو ویتر دەکەوێتە دوای ئەوان)).

بوخاری (٣٧) موسلیم (٧٥٩) قال رسول الله (ﷺ): ((من قام رمضان إيمانا واحتسابا غفرله ماتقدم من ذنبه)).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەوەی شەو نوێژ لە ڕەمەزان دا بکات تەنها بۆ خواو بەدڵسۆزی خوا لەتاوانەکانی پێشووی دەبورێت)).

بوخاری (٨٨٢) موسلیم (٧٦١) عن عائشة (ﷺ) أن النبي (ﷺ) صلى في المسجد ذات ليلة فصلي بصلاته ناس ثم صلى من القابلة فكثر الناس ثم أجتمعوا من الليلة الثالثة –أو الرابعة– فلم يخرج إليهم رسول الله (ﷺ) فلما أصبح قال: ((قد رأيت الذي صنعتم فلم يمنعني من الخروج إلاّ إني خشيت أن تفرض عليكم)) )).=

(فَصلٌ) وَشَرائِطُ الصَّلاةِ قَبلَ الدُّخولِ فيها خَمسَةُ أشياءَ: طَهارَةُ الأعضاءِ مِنَ الحَدَثِ وَالنَّجَسِ،

(باس) مەرجەكانی نوێژ پێش دابەستنی پێنج شتن: پاكی ئەندامەكانی لەش لە پیسیو بێ دەستنوێژی، [1]

عائشە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەڵێـت: ((جارێكیـان پێغەمبـەر لەشـەودا نوێـژی كـرد لــە مزگەوت خەڵكەكەش لە گەڵیا دەستیان پــێ كـرد شـەوی دووهـەمیش هـەمان شێوە شـەوی سێیەم نەچوو فــەرمووی: ((لەبـەر ئـەوە نـەهاتم ترسـام لـەوەی لەسـەرتان فـەرز بكرێـت))، دیارە ئەو كاتە ڕەمەزان بووە.

بوخاری (١٩٠٦) عن عبدالرحمـن بـن عبدالقـاري قـال: (خرجـت مـع عمـر بـن خطـاب في رمضان الى المسجد فإذا الناس أوزاع متفرقون يصلي الرجـل لنفسـه ويصلـي الرجـل فيصلـي بصلاته الرهط فقـال عمـر: إنـي أرى لوجمعـت هـؤلاء علـى قـارئ واحـد لكـان أمثـل ثـم عـزم فجمعهم على أبي بن كعب ثم خرجت معه ليلة أخرى والناس يصلون بصلاة قارئهم فقال عمـر: نعمت البدعة هذه والتي ينامون عنها أفضل من التي يقومون).

لە عبدوالرحمن كوڕی عبدالقاری دەگێڕێتـــەوە: (لەگـەڵ ئیمـامی عمـردا (خـوای لێ ڕازی بێت) لە ڕەمەزان دا چووین بۆ مزگەوت بینیمان خەڵكەكە كۆمەڵ كۆمەڵ نوێژیان دەكرد عمـر فەرمووی: ئەگەر هەموان لەدەوری یەكێك كۆبكەینەوە لەمە باشترە پاشان داوای لە (أبي بن كعب) كرد نوێژیان بۆ بكات بۆ شەوی داهاتوو هەموان تێكڕا نوێژیان دەكرد عمـر فـەرمووی: (بدعە یەكی باش مان داهێنا).

البيهقي (٢/٩٩٦): (إنهم كانوا يقومون على عهد عمر بن الخطاب (ﷺ) في شـهر رمضـان بعشرين ركعة).

(لەسەردەمی عمردا (خوای لێ ڕازی بێت) خەڵكی لە ڕەمەزاندا (٢٠) ڕكاتیان دەكرد).

مالك له (الموطأ) (١/١١٥) (كان الناس في زمن عمر يقومون في رمضان بثـلاث و عشـرين ركعة) (إن الثلاث كان وترا).

(خەڵكی لەوسەردەمەدا (٢٣) ڕكاتیان دەكرد دیارە ئەوسێ ڕكاتە وتیرەكە بوو).

(١) واتە بە بچووكو گەورەوە. ئایەتی: ﴿يأيها الذين آمنوا إذا قمتـــم إلى الصـــلاة ئاتەگاتە.. إن كنتم جنبا فاطهروا﴾ (المائدة: ٦) دیارە ئـەبێت پیسـی پـاك بكرێتـەوە وەك لە هەدیسەكانی پیشوودا باس كرا، ئایەتی: ﴿وثيابك فطهر﴾ (المدثر: ٥).

**وسـتر العـورة بلبـاس طـاهر، والوقـوف علـى مكـان طـاهر، والعلـم بدخول الوقت.**

**پۆشینی عەورەت بە پۆشاکێکی پـاك،[1] وەسـتان لەسـەر شـوێنێکی پـاك،[2] بزانێت کە وەختی نوێژ هاتووە.[3]**

(١) ئایەتی: ﴿خذوا زینتكم عند كل مسجد﴾ (الأعراف: ٣١).. كەمەبەست جلە كانە لە نوێژدا.

الترمذي (٣٧٧) عـن عائشـة (رضي الله عنها) قـالت: قــال رسـول الله (ﷺ): ((لا تقبـل صـلاة الحائض إلا بخمار)) ).

عائشە (خوای لیٚ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فـەرمووی: ((پێویستـە ئـافرەتی باڵغ لە نوێژدا سەری دا بپۆشێت)).

بوخاری (٣٦٥) عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: ((لقد كان رسول الله (ﷺ) يصلي الفجر فيشـهد معه نساء من المؤمنات متلفعات في مروطهن ثم يرجعن الى بيوتهن مايعرفهن احد)).

((پێغەمبـەر (ﷺ) کـە نوێـژی بـەیانی دەکرد چـەند ئـافرەتێك نوێژیـان لەگـەڵ دەکـرد خۆیان بەتەواوی دادەپۆشی وپاشان دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە کەس پیٚی نەدەزانین)).

أبوداود (٣٦٥) عن أبـي هريـرة (رضي الله عنه): (أن خولـة بنـت يسـار أتـت النـبي (ﷺ) فقـالت: يارسول الله أنه ليس لي إلا ثـوب واحـد وأنـا أحيـض فيـه فكيـف أصنـع؟ قـال: ((إذا طـهرت فأغسليه ثم صلي فيه)) فقالت: فإن لم يخرج الدم؟ قال: ((يكفيك غسـل الـدم ولا يضـرك أثره)) ).

((ئافرتێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ووتی: من لەیەك جـل زیـاتر شـك نابـەم ئەگـەر تووشی حەیز بووم چی بكەم؟ فەرمووی: کەپاك بویتـەوە بیشـۆو نوێـژی پێـوە بکـە، ئەگـەر بەتەواویش لیٚی نەبێتەوە قەیدی نییە)).

(٢) بەڵگە لەسەر ئەمە ئەوەیە: کـە پێغەمبـەر (ﷺ) ئـەمری فـەرموو کـە ئاویکـەن بـەر میزەی کەپیاوە دەشتەکییەکە لە مزگەوت دا کردبووی.

(٣) ئایەتی: ﴿إن الصلاة كانت على المؤمنين كتابا موقوتا﴾ (النساء: ١٠٣)..واتە: هەر نوێژەکاتی تایبەتی خۆی هەیە، لەبەر ئەوە پێویستە ئەو کاتە بزانێت.

وَاستِقبالُ القِبلَةِ. وَيَجوزُ تَركُ القِبلَةِ في حالَتَينِ: في شِدَّةِ الخَوفِ، وَفي النّافِلَةِ في السَّفَرِ عَلى الرّاحِلَةِ.
(فَصلٌ) وَأَركانُ الصَّلاةِ ثَمانِيَةَ عَشَرَ رُكنًا: النِّيةُ،

---

ڕووبكاته قيبله.[1] له دووحاڵەت دا دەتوانرێت واز له ڕووكردنه قيبله بهێنێ: لەكاتى ترسێكى زۆردا، [2] له نوێژى سوننەت دا لەسەر وولاخ. [3]
(باس) ئەركانەكانى نوێژ هەژدەن: نيەت هێنان، [4]

---

(١) ئايەتى: ﴿قد نرى تقلب وجهك في السماء فلنولينك قبلة ترضاها فول وجهك شطر المسجد الحرام﴾..واتە: ئاگامان لەوەيە كە چۆن ڕووتەكەيتە ئاسمان ڕووت پێ دەكەينە قيبلەيەك كە خۆت پێت خۆشە ڕوويكەرەلاى مزگەوتى (الحرام) كەمەبەست كەعبەيە.
بوخارى (٥٨٩٧) موسليم (٣٩٧) ((إذا قمت الى الصلاة فأسبغ الوضوء ثم أستقبل القبلة فكبر)).
پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتى: ((كاتێك ويستت نوێژ بكەيت دەستنوێژى تەواو بشۆو ڕووبكەرە قيبلەو بڵێ الله أكبر))
بوخارى (٣٩٠) موسليم (٥٢٥): عن البراء بن عازب (ﷺ) قال: ((كان رسول الله (ﷺ) صلى نحو بيت المقدس ستة عشر أوسبعة عشر شهرا وكان رسول الله (ﷺ) يحب أن يوجه نحو الكعبة فإنزل الله: ﴿قد نرى تقلب وجهك في السماء..﴾ فتوجه نحو الكعبة)).
((پێغەمبەر (ﷺ) شانزەيان حەڤدە مانگ ڕووى كردە (بيت المقدس) بەڵام حەزى دەكرد ڕوويكاتە كەعبە كاتێك ئايەتى ﴿قد نرى..﴾ هاتە خوارەوە، ئيتر ڕووى كردە كەعبە.
(٢) لەبەر شەڕيان شتێكىتر بە مەرجێ حەڵاڵ بێت ئايەتى: ﴿فإن خفتم فرجالا أو ركبانا﴾ (البقرة: ٢٣٩).زواتە: ئەگەر نەتان توانى نوێژەكانتان بەتەواوى بكەن لەبەرترس يان لەبەر هەر هۆيەكىتر ئەوا چۆن بۆتان لوا بيكەن بەپيادەيى يان بەسوارى ڕووەو قيبلەيان ڕووەو شوێنىتر. بوخارى (٤٢٦١)
(٣) بوخارى (٣٩١) عن جابر (ﷺ) قال: ((كان رسول الله (ﷺ) يصلي على راحلته حيث توجهت –وفي راوية– نحو المشرق فاذا أراد الفريضة نزل فاستقبل القبلة)).
جابر دەڵێت: ((پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر وولاخەكەى نوێژى دەكرد هەر كاتێك وەختى نوێژى فەرز دەهات دادەبەزىو ڕووى ئەكردە قيبلە و نوێژى دەكرد. ئەمە بەڵگەيە كەلەنوێژى سوننەت داو بەسوارى قيبلە مەرج نىيە.
(٤) ئايەتى: ﴿وما أمروا إلا ليعبدوا الله مخلصين له الدين﴾ (البينة: ٥) مەبەست لە (الإخلاص) نيەت هێنانە، حەديسى: ((إنما الإعمال بالنيات))..واتە: هەموو كارێك بەستراوە بەنيەتەوە.

**والقيام مع القدرة، وتكبيرة الإحرام، وقراءة الفاتحة، وبسم الله الرحمن الرحيم آية منها، والركوع والطمانينة فيه، والرفع والأعتدال والطمانينة فيه، والسجود والطمانينة فيه.**

**به پيوەوەستان بۆيەكيك بتوانيت، [1] الله اكبرى دابەستن، خويندنى فاتحە، بسم الله بەشيكه له فاتحه، چوونه ركوع و ئارام گرتن تيا، هەلسانەوەو راست بوونەوەو ئارام گرتن، چوونه سوجدەو ئارام گرتن. [2]**

(١) بوخارى (١٠٦٦) عن عمران بن حصين (رضي الله عنه) قال: (كانت بي بواسير فسألت النبي (ﷺ) عن الصلاة فقال: ((صل قائما فإن لم تستطع فقاعدا فإن لم تستطع فعلى جنب)) ).

عمران دەليت: ((من مايه سيريم هەبوو له پيغەمبەرم پرسى دەربارەى نويژ فەرمووى: ئەگەر دەتوانيت بەپيوه نەت توانى بەدانيشتنەوه نەت توانى لەسەر تەنيشت يان لەسەر پشت.

(٢) بەلگە لەسەر ئەمانە حەديسى بوخارى (٧٢٤) موسليم (٣٩٧) عن أبي هريرة (رضي الله عنه) ((أن النبي (ﷺ) دخل المسجد فدخل رجل فصلى ثم جاء فسلم على النبي (ﷺ) فرد النبي (ﷺ) عليه السلام فقال: ((أرجع فصل فإنك لم تصل)) فصلي ثم جاء فسلم على النبي (ﷺ) فقال: ((إرجع فصل فإنك لم تصلي)) ثلاثا، فقال: والذي بعثك بالحق ما أحسن غيره فعلمني فقال: ((إذا قمت إلى الصلاة فكبر ثم أقرأ ماتيسر معك من القرآن ثم أركع حتى تطمئن راكعا ثم أرفع حتى تعتدل قائما ثم أسجد حتى تطمئن ساجدا ثم أرفع حتى تطمئن جالسا ثم أسجد حتى تطمئن ساجدا ثم أفعل ذلك في صلاتك كلها)) ).

پياويك لەسەردەمى پيغەمبەردا هاتە مزگەوت و نويژى كرد پيغەمبەر فەرمووى: ((بگەريوه نويژەكەت بكەوه چونكه تۆ نويژت نەكرد)) پاش چەندجاريك عەرزى كرد قەسەم بەخوا لەوه باشتره نازانم ئينجا فەرمووى: ((كاتيك ويستت نويژ بكەى الله أكبر بكه پاشان كەميك قورئان بخوينه (فاتحه) ئينجا بچۆرەركوع وئارام بگره ئينجا هەلسەوه تا تەواو راست دەبيتەو ئينجا بچۆره سوجده وئارام بگره هەربەم شيوه تاتەواوى دەكەيت)).

بوخارى (٧٢٣) موسليم (٣٩٤) ((لا صلاة لمن لم يقرأ بفاتحة الكتاب)) ((هەركەسيك (فاتحه)ى نەخوينيت ئەوا نويژى دروست نىيه)). لەبەر ئەوەش (بسم الله) بەشيكه له فاتحه.

موسليم (٤٠٠) عن أنس (رضي الله عنه) قال: ((بينا رسول الله (ﷺ) ذات يوم بين أظهرنا إذا أغفى إغفاء ثم رفع رأسه مبتسما فقلنا: ما أضحكك يارسول الله؟ قال: ((أنزلت علي آنفا سورة فقرأ: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم إنا أعطيناك الكوثر﴾)).

دەگيريتەوه: ((جاريكيان پيغەمبەر (ﷺ) وەحى بۆهات پاشان فەرمووى: ئيستا ئايەتيكم بۆهات زۆر پىى خۆشحالّ بووم ئينجا خويندييەوه: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم، إنا أعطيناك الكوثر﴾.واته: (بسم الله)ى به بەشيك لەسوورەتەكه دانا)).

**وَالجُلوسُ بيَنَ السَّجدتَين وَالطُّمانينةُ فيه، وَالجلوسُ الأخيرِ وَالتَّشَهُّدُ فيه، والصَّلاةُ علىَ النَّبي (ﷺ) فيه، والتَسليمَةُ الأولى،**

**دانيشتن له نێوان دووسوجدەكەو ئارام گرتن، دانيشتنی دوايی[1] و خوێندنی (تحيات) تيايا[2] وناردنی دروود بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لەوێداد[3] سەلام دانەوەی يەكەم،[4]**

(١) بوخاری (٧٩٤) عن أبي حميد الساعدي (رضي الله عنه) في صفة صلاته (ﷺ): ((وإذا جلس في الركعة الأخرة قدم رجله اليسرى ونصب الأخرى وقعد على مقعدته))

ئەصحابەيەك لەباسی شێوەی نوێژ كردنی پێغەمبەردا (ﷺ) دەڵێت: ((كەلە دوا ركات دانەنيشت قاچی چەپی پێش دەخستو ئەوەكەی تری هەڵئەناو لەسەر سمتی دادەنيشت)).

(٢) بوخاری (٥٨٠٦) موسليم (٤٠٢) عن إبن مسعود (رضي الله عنه) قال: (كنا إذا صلينا مع النبي (ﷺ) قلنا قبل أن يفرض علينا التشهد: السلام على الله قبل عباده السلام على جبريل السلام على ميكائيل السلام على فلان فلما انصرف النبي أقبل علينا بوجهه فقال: ((أن الله هوالسلام فإذا جلس أحدكم في الصلاة فليقل: التحيات.)) ).

(إبن مسعود) (خوای لیٚ رازی بێت) دەڵێت: ((پێش فەرزكردنی (تحيات) دەمان ووت السلام.. ئيتر پێغەمبەر فێری كردين بڵێين: التحيات.. تەواوترين شێوەی يحيات ئەوەيە كە موسليم (٤٠٣) عن إبن عباس (رضي الله عنه) أنه قال: ((كان رسول الله (ﷺ) يعمنا التشهد كما يعلمنا السورة من القرآن فكان يقول: ((التحيات المباركات الصلوات الطيبات لله السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته السلام علينا وعلى عباده الصالحين أشهد أن لاإله إلا الله وأشهد أن محمدا رسول الله)).

له (إبن عباس)ەوە دەگێڕێتەوە: ((التحيات المباركات الصلوات الطيبات لله السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته السلام علينا وعلى عباده الصالحين أشهد أن لاإله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله)).

(٣) ئايەتی: ﴿إن الله وملائكته يصلون على النبي يا أيها الذين آمنوا صلوا عليه وسلموا تسليما﴾ (الأحزاب: ٥٦)..واتە: خواو فريشتەكانی دروود بۆ پێغەمبەر دەنێرن ئێوەش ئيمان داران دروودو سڵاوی بۆ بنێرن.

دياره ئەمەش لە غەيری نوێژدا واجب نىيە. شوێنەكەشی كۆتايی نوێژە واتە لە (التحيات)دا. شێوەكەشی بەم جۆرەيە: ((أللهم صل على محمد وعلى آل محمد كما صليت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم وبارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على أبراهيم وعلى آل إبراهيم في العالمين إنك حميد مجيد)).

(٤) موسليم (٤٩٨) عن عائشة (رضي الله عنها) ((كان رسول الله يستفتح الصلاة بالتكبير وكان يختم الصلاة بالتسليم)).

عائشە (خوای لیٚ رازی بێت) دەفەرموێت: ((دەست پێكردنی نوێژ لە لايەن پێغەمبەر (ﷺ) بە الله أكبر بوو كۆتاييشی بە سڵاودانەوە))؟

وَنِيَّةُ الخُروجِ مِنَ الصَّلاةِ، وَتَرتِيبُ الأَركانِ عَلىٰ ماذَكرناهُ.
وَسُنَنُها قَبلَ الدُّخولِ فيها شَيئانِ: الأذانُ، وَالإقامَةُ.

نیەت هێنانی دەرچوون لە نوێژ، [1] ئەم ڕوکنانە بەوتەرتیبە بکات کەباسمان کردن.[2]
پێش دابەستنی نوێژ دووشت سوننەتن: بانگ دان، قامەت کردن.[3]

(١) ڕاستتر وایە ئەمە ڕوکن نیيە، سوننەتە.

(٢) لەبەر حەدیسی ئەو پیاوەی کەنەی دەزانی نوێژەکەی بەتەواوی بکات.

(٣) بۆ نوێژە فەرزەکان بوخاری (٦٠٢) موسلیم (٦٧٤) عن مالك بن الحويرث (ﷺ) أن النبي (ﷺ) قال: ((إذا حضرت الصلاة فليؤذن أحدكم وليؤمكم أكبركم)).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتی: (کەوەختی نوێژەکات بایەکێکتان بانگ بدات و بەتەمەنترین تان ئیمامەتتان بۆ بکات، لەبەر چەند بەڵگەیەکی تر بەواجب دانەنراوە).

شێوەی بانگیش بەم شێوەیە: ((الله أكبر ٤ جار أشهد أن لاإله إلا الله ٢ جار أشهد أن محمدا رسول الله ٢ جار حي على الصلاة ٢جار حي على الفلاح ٢جار الله أكبر ٢ جار لا إله إلا الله ١یەك جار)) لە نوێژی بەیانیدا پاش ((حي على الفلاح)) دووجار دەڵێت: ((الصلاة خير من النوم)).

شێوەی قامەتیش بەم جۆریە: ((الله أكبر الله أكبر أشهد أن لاإله إلا الله أشهد أن محمداً رسول الله حي على الصلاة حي على الفلاح قد قامت الصلاة قد قامت الصلاة الله أكبر الله أكبر لاإله إلا الله)) سوننەتە یەکێك گوێی لە بانگ بوو وەك ئەو دووبارەی بکاتەوە.

بوخاری (٥٨٩) ((عن جابر (ﷺ) أن رسول الله (ﷺ) قال: من قال حين يسمع النداء ((اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة آت محمدا الوسيلة والفضيلة وأبعثه مقاماً محمودا الذي وعدته) حلت له شفاعتي يوم القيامة)).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پاش بانگ هەرکەس ئەم دوعایە بخوێنێ شەفاعەتی منی بۆ دەستەبەر دەبێت ((أللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة آت محمداً الوسيلة والفضيلة و أبعثه مقاما محمودا الذي وعدته)).

بۆ ئەوەی کە گوێی لە بانگە هەموو وتەکان وەك خۆی دەڵێتەوە تەنها لە وەڵامی ((حي على الصلاة وحي على الفلاح)) دەڵێت: ((لاحول ولا قوة إلا بالله)) وە لەوەڵامی ((الصلاة خير من النوم)) دەڵێت: ((صدقت وبررت)) بۆ وەڵام دانەوەی قامەتیش وەك خۆی دەی ڵێتەوە بەلام لەوەڵامی ((قد قامت الصلاة)) دەڵێت: ((أقامها الله وأدامها)) بوخاری (٥٨٨) موسلیم (٣٨٥) أبوداود (٥٢٨).

وَبَعدَ الدُخولِ فيها شيئانِ: التَشَهدُ الأولُ، وَالقُنوتُ في الصُبحِ وَفي الوِترِ في النِصفِ الثاني مِن شَهرِ رَمَضانَ، وَهَياتُها خمسةَ عَشرَ خَصلَةً:
رَفعُ اليَدينِ عِندَ تَكبيرةِ الإحرام،

پاش دابەستنیشی دووشتن: خوێندنی (تحیات) ی یەکەم، [1] خوێندنی قنوت لە نوێژی بەیانیو [2] لە نوێژی (ویتر) لە نیوەی دووەمی مانگی ڕەمەزاندا.

سیفەتەکانی بە ئەنجام دانی نوێژ پانزەن: دەست بەرز کردنەوە لەکاتی دابەستنی نوێژ [3]

(١) بوخاری (١١٦٧) ((أن رسول الله (ﷺ) قام من أثنتين من الظهر لم يجلس بينهما فلما قضى صلاته سجد سجدتين ثم سلم بعد ذلك)).

جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) لە نوێژی نیوەڕۆدا پاش کردنی دوو ڕکات تحیاتی نەخوێند پاش تەواوبوونی نوێژەکە دوو سوجدەی برد ئینجا سەلامی دایەوە. ئەوە بەڵگەیە کە سوننەتەو واجب نییە.

(٢) الحاكم عن أبي هريرة (ﷺ) قال: ((كان رسول الله (ﷺ) إذا رفع رأسه من الركوع في صلاة الصبح في الركعة الثانية رفع يديه يدعو بهذا الدعاء: اللهه أهدني فيمن هديت)).

لە ئەبو هورەیرەوە (خوای لێ ڕازی بێت): ((کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لەنوێژی بەیانیدا ولەڕکاتی دووەم دا کە لە ڕکوع هەڵئەستایەوە دەستی بەرز دەکردەوە دوعای قنوتی دەخوێند. ((مغني المحتاج (١/١٦٦)).

(٣) أبوداود (١٤٢٥) عن الحسن بن علي (ﷺ) قال: ((علمني رسول الله (ﷺ) كلمات أقولهن في الوتر ((أللهم أهدني فيمن هديت وعافني فيمن عافيت وتولني فيمن توليت وبارك لي فيما أعطيت وقني شر ما قضيت إنك تقضي ولا يقضي عليك وأنه لايذل من واليت ولا يعز من عاديت تباركت ربنا وتعاليت)).

لە حسن کوڕی علیەوە دەگێڕێتەوە: ((پێغەمبەر (ﷺ) فێری کردم کەلە نوێژی (ویتر)دا ئەمە بخوێنم: ((أللهم أهدني فيمن هديت، وعافني فيمن عافيت، وتولني فيمن توليت وبارك لي فيما أعطيت وقني شر ماقضيت إنك تقضي ولا يقضي عليك أنه لايذل من واليت ولا يعز من عاديت تباركت ربناوتعاليت)).الترمذي (١٤٢٨)

((دەڵێت: لەم دوعایە باشترمان نەبیستووە کە لە پێغەمبەرەوە بۆمان مابێتەوە)).

أبوداود (١٤٢٨) (أن أبي بن كعب (ﷺ) أمهم –يعني في رمضان– وكان يقنت في النصف الآخر من رمضان)).

کاتێك (أبي بن كعب) لە ڕەمەزاندا ئیمامەتی بۆ خەڵکەکە دەکرد لە نیوەی دووەمی ڕەمەزاندا قنوتی بۆ دەخوێندن.دیارە کرداری ئەصحابەش بەبەڵگە دادەنرێت ئەگەر کەس دژی نەبێت.

وَعِندَ الركوعِ وَالرَّفعِ مِنهُ.
وَوَضعُ اليَمينِ عَلىٰ الشِمالِ، وَالتَّوَجُّهُ، وَالاستِعاذَةُ،

لەكاتی چوونە ڕكوع‌و هەڵسانەوە لە ڕكوع. [1]
دەستی ڕاستی بخاتەسەر دەستی چەپی، [2] دوعای ((وجهت وجهی)) بخوێنێت، [3] ((اعوذ باالله)) بڵێت، [4]

(١) بوخاری (٧٠٥) موسليم (٣٩٠) عن إبن عمر (ﷺ) قال: (رأيت النبي (ﷺ) افتتح التكبير في الصلاة فرفع يديه حين يكبر حتى يجعلها حذو منكبيه وإذا كبر للركوع فعل مثله وإذا قال: ((سمع الله لمن حمده فعل مثله وقال: ربنا ولك الحمد ولا يفعل ذلك حين يسجد ولا حين يرفع رأسه من السجود)) ).

إبن عمر دەڵێت: ((پێغەمبەرم دیوە لەكاتی دابەستنی نوێژدا هەردوو دەستی بەرز ئەكردەوە بەشێوەیەك دەگەیشتنە بەرامبەر شانەكانی بۆ چوونە ڕكوعیش هەمان شێوە هەروەها كەدەی فەرموو: ((سمع الله لمن حمدة)) هەمان شێوە بەلام بۆ سوجدە وهەڵسانەوە لە سوجدە ئەوەی نەدەكرد)).

(٢) موسليم (٤٠١) عن وائل بن حجر (ﷺ) ((أنه رأى النبي (ﷺ) رفع يديه حين دخل في الصلاة ثم وضع يده اليمنى على اليسرى)).

((پێغەمبەر (ﷺ) لەكاتی دابەستنی نوێژدا دەستی بەرز دەكردەوە وپاشان دەستی ڕاستی دەخستە سەردەستی چەپی.

(٣) موسليم (٧٧١) عن علي (ﷺ) عن رسول الله (ﷺ): ((أنه كان إذا قام إلى الصلاة قال: وجهت وجهي للذي فطر السموات والأرض حنيفا وما أنا من المشركين إن صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين لاشريك له وبذلك أمرت وأنا من المسلمين)).

ئیمامی عەلی (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە: ((كاتێ پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی دابەست پاش ئەوە دەی فەرموو: ((وجهت وجهي للذي فطر السموات والأرض حنيفا وما أنا من المشركين إن صلاتي ونسكي ومحياى ومماتى لله رب العالمين لا شريك له وبذلك أمرت وأنا من المسلمين)).

(٤) ئايەتی: ﴿فإذا قرأت القرآن فاستعذ بالله من الشيطان الرجيم﴾ (النحل:٩٨)..واتە: كاتێك دەست ئەكەیت بە خوێندنی قورئان بڵێ خۆم دەخەمە پەنای خوای مەزن لەشەیتانی دوورخراوە لەڕەحمەتی خوا.

**وَالجَهرُ في موضِعِهِ، وَالإِسرارُ في مَوضِعِهِ، وَالتَّأمِينُ.**

**لەونوێژانـەی کـە دەنـگ بـەرز کردنـەوەی تیایـە بـادەنگی بـەرز بکاتـەوە،** (١) **لەوانـەش کەدەبێت دەنـگ نـزم بکات دەنگـی نـزم بکـات، ئـامین بکـات دوای تـەواو بوونی فاتحە.** (٢)

(١) ئەوانەش ئـەم نوێژانـەن: نوێـژی بـەیانی دووڕکاتـەی یەکـەمی شـێوانو خـەوتنان، هەینـی، دووجەژنکە، مـانگ گـیران، نوێژەبارانـە، تـەراویح، ویـتری ڕەمـەزان، نوێـژی تـەواف لەشەوو بەیانیدا، شەونوێژ مام ناوەندی دەبێت نوێژەکانی تر هەموویان بەدەنگی نزم دەکرێن.

بوخاری (٧٣٥) موسلیم (٤٦٣) عـن جبـیر بـن مطعـم (ﷺ) قـال: ((سمعـت رسـول الله (ﷺ) قرأ في المغرب بالطور)).

بوخـاری (٧٣٣) موسـلیم (٤٦٤) عـن الـبراء (ﷺ) قـال: ((سمعـت النـبي (ﷺ) يقـرأ: ﴿والتين والزيتون﴾ في العشاء وما سمعت أحدا أحسن صوتا منه أو قراءة)).

بوخاری (٧٣٩) موسلیم (٤٤٩) ((من حديث إبن عباس (ﷺ) في حضور الجن واستماعهم القرآن من النبي (ﷺ) وفيه: وهو يصلي بأصحابه صلاة الفجر فلما سمعوا القرآن أستمعوا له)).

ئـەو حەدیسـانە هـەموو بەڵگـەن لەسـەر ئـەوەی کـە پێغەمبـەر دەنگـی بەرزکردۆتـەوە ئەوانیش گوێیان لێ بووە.

بوخاری (٧٣٨) موسـلیم (٣٩٦) عـن أبـي هريـرة (ﷺ) قـال: ((في كـل صلاة يقـرأ فمـا أسمعنا رسول الله (ﷺ) أسمعناكم وما أخفى عنا أخفينا عنكم)).

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت): دەڵێت: ((ئەوەی کە گوێ مان لێ بوو بێـت پێمـان وتن هەروەها ئەوانی تر کە گوێمان لێ نەبوو).

(٢) أبوداود (٩٣٤) عن أبي هريرة (ﷺ) قال: ((كان رسول الله (ﷺ) إذا تلا: ﴿غـــــير المغضوب عليهم ولا الضالين﴾ قال: آمين حتى يسمع من يليه من الصف الأول)).

((پێغەمبەر (ﷺ) دوای تەواو بوونی فاتحە بە دەنگێکی بەز دەی فەرموو (ئامین).

بوخاری (٧٤٩) موسلیم (٤١٠) عن أبي هريرة (ﷺ) أن رسول الله (ﷺ) قال: ((إذا قال الإمام: ﴿غير المغضوب عليهم ولا الضالين ﴾ فقولـوا: آمـين فإنـه مـن وافـق قولـه قـول الملائكة غفرله ما تقدم من ذنبه)).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((کاتێك ئیمام وتی: ﴿ولا الضـــــالين﴾ هـەموو بڵێـن: ((ئامین)) چونکە فریشـتەکانیش وا ئـەڵێنو هەرکـەس لەگـەڵ فریشـتەکاندا بڵـێ ئـامین خـوا لەگوناهی پێشوی خۆش دەبێت. أبوداود (٩٣٦) ((إذا أمن الإمام فأمنوا))،کـەئیمام وتـی: ئامین ئێوەش بڵێن: ((آمین)).

**وَقِراءَةُ السّوَرَةِ بعدَ الفاتِحةِ، وَالتَّكبيراتُ عِنـدَ الرّفعِ وَالخَفضِ، وَقَـولُ سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَهُ ربَّنا لَكَ الحَمدُ، والتَّسبيحُ في الرّكوعِ وَالسّجودِ، وَوَضعُ اليَدَينِ على الفَخِذَينِ في الجُلوسِ.**

**سوورەتێکی قورئان دوای فاتحە بخوێنێ، (١) لەگەڵ دابەزین یان بەرز بوونەوە لە کردارەکان (الله أکبر) بڵێ، (٢) لەکاتی هەڵسانەوە لە ڕکوع بڵێ: ((سمع الله لمن حمده ربنا لك الحمد))، لە ڕکوع وسجودا دوعای تایبەتی بکات، (٣) لەکاتی دانیشتندا هەردوو دەستی بخاتە سەر ڕانەکانی.**

(١) لە دووڕکاتی یەکەم دا.

بوخاری (٧٤٥) موسلیم (٤٥١) عن أبي قتادة (ﷺ) ((أن النبي (ﷺ) كان يقرأ بأم الكتاب وسورة منها في الركعتين الأوليين من صلاة الظهر وصلاة العصر)).

((پێغەمبەر (ﷺ) لەدووڕکاتەی یەکەمی عەسرونیوەڕۆدا فاتحە وسوڕتێکی لەگەڵدا دەخوێند. لەونوێژانەدا کەبەدەنگی بەرز دەخوێندرێن نابێت مەئمومی سوورەت بخوێنێت)).

أبوداود (٨٢٣/٨٢٤) النسائي (١٤١/٢) ((عن عبادة بن الصامت (ﷺ) قال: كنا خلف رسول الله (ﷺ) في صلاة الفجر فثقلت عليه القراءة فلما إنصرف قال: ((لعلكم تقرؤون خلف أمامكم)) قال: فقلنا: إي والله قال: ((لاتفعلوا إلا بأم القرآن فإنه لاصلاة لمن لم يقرأ بها)) -وفي رواية- ((فلا تقرؤا بشيء من القرآن إذا جهرت به إلا بأم القرآن)).

((پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (( (مأموم) نابێت بێجگە لەفاتحە هیچ سورەتێکی تر بخوێنێت)).

(٢) بوخاری (٧٥٢) موسلیم (٣٩٢) عن أبي هريرة (ﷺ) ((أنه كان يصلي بهم فيكبر كلما خفض ورفع فإذا إنصرف قال: إني لأشبهكم صلاة برسول الله (ﷺ))).

((لە کاتێکدا ئەوبوهورەیرە ئیمامەتی دەکرد لەهەموو بەرز بوونەوەو دابەزینێکدا تەکبیری دەکرد پاشان دەی فەرموو: ئەمە لە نوێژ کردنی پێغەمبەرەوە وەرم گرتووە)).

(٣) موسلیم (٧٧٢) عن حذيفة (ﷺ) قال: ((صليت مع النبي (ﷺ) ذات ليلة وفيه: ثم ركع فجعل يقول: ((سبحان ربي العظيم)) ثم سجد فقال: ((سبحان ربي الأعلى)).

حوزەیفە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: ((شەوێك لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) نوێژم دەکرد لەرکوع دادەی فەرموو: ((سبحان ربي العظيم)) ولە سوجدەشدا دەی فەرموو: ((سبحان ربي الأعلي)).

وَيَبسَطُ اليُسرىٰ وَيَقبِضُ اليُمنيٰ إلاّ المُسَبِّحَةَ فَإنَّهُ يُشِيرُ بِهَا مُتَشَهِّداً وَالإفتِرَاشُ فِي جَمِيعِ الجَلَسَاتِ، وَالتَّوَرُّكُ فِي الجَلسَةِ الأَخِيرَةِ، وَالتَّسلِيمَةُ الثَّانِيَةُ.

دەستی چەپەی پان ئەکاتەوەو دەستی ڕاستی خڕدەکاتەوە وە وەك كوڵە مست بێجگە لە پەنجەی شایەتی کەلە کاتی ووتنی شایەتو ئیمان دا ئیشارەی پێ دەکات، [1] لە هەموو دانیشتنە کاندا شێوەی (افتراش) بەکاربهێنێ بێجگە لەدوا دانیشتن کە شێوەی (تورك) بەکاردێنێ، [2] سڵاودانەوەی دووەم. [3]

---

(١) موسليم (٥٨٠) عن إبن عمر (ﷺ) في صفة جلوسه (ﷺ) قال: ((كان إذا جلس في الصلاة وضع كفه اليمنى على فخذه اليمنى وقبض أصابعه كلها وأشار باصبعه التي تلي الإبهام ووضع كفه اليسرى على فخذه اليسرى)).

إبن عمر (خوای لێ ڕازی بێت) باسی شێوەی دانیشتی پێغەمبەری لە نوێژدا کردو ووتی: ((دەستی ڕاستی دەخستە سەرڕانی ڕاستیو پەنجەکانی هەموو خڕ دەکردەوە بێجگە لە پەنجەی شایەتی کەئیشارەتی پێ دەکردو دەستی چەپی دەهستە سەرڕانی چەپی.

(٢) بوخاری (٧٩٤) من حديث أبي حميد الساعدي (ﷺ) قال: ((أنا كنت أحفظكم لصلاة رسول الله (ﷺ)...و فيه: فإذا جلس في الركعتين جلس على رجله اليسرى ونصب اليمنى وإذا جلس في الركعة الأخيرة قدم رجله اليسرى ونصب الأخرى وقعد على مقعدته)).

((ئەصحابەیەك دەڵێت: من لە هەمووان باشتر شێوەی نوێژی پێغەمبەرم (ﷺ) لە بیرماوە لە دانیشتنی یەکەم دا لەسەر قاچی چەپی دادەنیشت، وقاچی ڕاستی هەڵدەسپارد بەڵام لەدوا دانیشتن دا قاچی چەپی دەخستە ژێر قاچی ڕاستی وقاچی ڕاستی هەڵدەسپارد)).

موسليم (٥٧٩) عن عبدالله بن الزبير (ﷺ) ((كان رسول الله (ﷺ) إذا قعد في الصلاة جعل قدمه اليسرى بين فخذه وساقه وفرش قدمه اليمنى)).

((پێغەمبەر کە لە نوێژدا دادەنیشت قاچی چەپی دەخستە نێوان ڕانو قاچیيەوە)).

(٣) موسليم (٥٨٢) عن سعد (ﷺ) قال: ((كنت أرى رسول الله (ﷺ) يسلم عن يمينه وعن يساره حتى أرى بياض خده))

سعد (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێ: ((کاتی سەلام دانەوە پێغەمبەر (ﷺ) بەلای ڕاستو چەپ دا سەلامی ئەدایەوە تەنانەت سپیایی ڕوومەتیم ئەبینی)).

أبوداود (٩٩٦) ((عن إبن مسعود (ﷺ) : ((أن النبي (ﷺ) كان يسلم عن يمينه وعن شماله حتى يرى بياض خده: ((السلام عليكم ورحمة الله السلام عليكم ورحمة الله)).

(إبن مسعود) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) بەلای ڕاستو چەپدا سەلامی ئەدایەوە تەنانەت سپیایی ڕوومەتی دەردەکەوت دەی فەرموو: ((السلام عليكم ورحمة الله — السلام عليكم ورحمة الله))؟ الترمذي (٢٩٥) دەڵێت ئەم حەدیسە ڕاستە.

(فَصل) والمَراةَ تُخالِفُ الرَّجُلَ في خَمسَةِ أَشياءَ: فَالرَّجُلُ يُجافي مِرفَقَيهِ عَنْ جَنبَيهِ، وَيُقِلُّ بَطنَهُ عَن فَخِذَيهِ في الرّكوعِ والسُّجودِ، وَيَجهَرُ في موضِعِ الجَهرِ، وَإذا نابَهُ شَيْءٌ في الصَّلاةِ سَبَّحَ، وَعَورةُ الرَّجلِ مابينَ سُرَّتِه وَرُكبَتِه.

(باس) ئافرەت لەپێنج شت دا لەگەڵ پیاودا جیاوازە: پیاو هەردوو ئانیشکی لەکەلەکەی دووردەخاتەوە [1]، لەرکوعو سجوددا وورگی لەڕانی دوور دەگرێت [2]، لەنوێژە جەهرییەکاندا دەنگی بەرزدەکاتەوە، ئەگەر شتێکی کتوپڕ ڕووی‌دا دەڵێت: ((سبحان الله)) [3]، عەورەتی پیاو نێوان ناوك و هەردوو ئەژنۆیەتی. [4]

(١) بوخاری (٣٨٣) موسلم (٤٩٥) (عن عبدالله ابن مالك ابن بحينة (ﷺ) ان النبي (ﷺ) كان اذا صلى فرج بين يديه حتي يبدو بياض ابطيه)).

عبدالله ابن مالك خ دەڵێت: پێغەمبەر د.خ لەکاتی نوێژدا دەستەکانی بەشێوەیەك لەیەکتر دووردەخستەوە کەسپیایی بنەگلی دیاربوو.

ابو داود (٧٣٤) عن ابى حميد (ﷺ) ((نحى يديه عن جنبيه ووضع كفيه حذو منكبيه)).

هەردوو دەستی لەکەلەکەی دوور دەخستەوە هەردوو بەری دەستی بەرامبەر دوشانی دائەنا.

(٢) ابوداود (٧٣٥) عن أبي حميد (ﷺ) في صفة صلاة رسول الله (ﷺ) قال: ((واذا سجد فرج بين فخذيه غير حامل بطنه على شيء من فخذيه))

ابی حمید لەباسی شێوەی نوێژی پێغەمبەردا (ﷺ) دەڵێت: لەکاتی سوجدەدا بۆشایی دەخستە نێوان ڕانەکانی‌یەوە سکی نەدەخستە سەر ڕانەکانی.

(٣) واتە ئەگەر شتێك لەئیمامەوە ڕوویدات و بیەوێت ئاگاداری بکاتەوە دەڵێت (سبحان الله) بوخاری (٦٥٢) موسلم (٤٢١) (عن سهل بن سعد (ﷺ) ان رسول الله (ﷺ) قال: ((من رابه شيء في صلاته فليسبح فإنه اذا سبح التفت اليه وانما التصفيق للنساء))

ئەگەر نوێژکەر لەنوێژدا لەئیمام کەوتە گومانەوە لەشتێکدا ئەوا تەسبیح ئەکات ئافرەتیش چەپڵە لێئەدات. چەپڵەکەش بەم جۆرەیە: بەری دەستی ڕاستی ئەکێشێ بەپشتی دەستی چەپی‌دا.

(٤) الدارقطني (٢٣١/١) (( مافوق الركبتين من العورة وماأسفل من السرة من العورة))

سەرووی هەردوو ئەژنۆ عەورەتەو خوار ناوکیش عەورەتە.

بخاری (٣٤٦) عن جابر (ﷺ) ((انه صلى في ثوب واحد وقال: رأيت النبي (ﷺ) يصلي في ثوب واحد.

جابر (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەرم بینی کەیەك جلی لەبەردابوو ناوەڕاستی لەشی داپۆشیبوو.

**وَالمَرأةُ تَضُمُّ بَعضَها إلىٰ بعضٍ، وَتَخفِضُ صَوتَها بِحَضرَةِ الرِّجالِ الأجانِبِ، وَإذا نابَها شَيءٌ في الصَّلاةِ صَفَّقَتْ، وَجَميعُ بَدَنِ الحُرَّةِ عَورَةٌ إلا وَجهَها وَكَفَّيها. وَالأَمَةُ كالرَّجُلِ.**

---

**ئافرەت ئەندامەکانی دەنووسێنێ بەیەکترەوە،[1] ئەگەر پیاوی بێگانەی لێبێت دەنگی نـزم ئەکاتـەوە،[2] ئەگـەر شتێك ڕووی‌دا چەپڵـە لێئـەدات، هـەموو لەشـی ئافرەتی حوڕ عەورەتە بێجگە لـەدەموچاو و هـەردوو دەستی.[3] کۆیلـەی ئافرەت وەك پیاوە.[4]**

---

(١) البهيقي (٢/٢٢٣) (انه (ﷺ) مر على امرأتين تصليان فقال: ((اذا سجدتما فضما بعض اللحم الى الأرض فان المرأة ليست في ذالك كالرجل)) ).

پێغەمبەر بەلای دوو ئافرەتدا تێپەڕی نوێژیان دەکرد فەرمووی: کاتێ دەچنە سوجدە لەشتان بەزەوی‌یەکەوە بنووسێنن ئافرەت لەمەدا وەك پیاو نی‌یە.

(٢) ئایەتی ﴿فلا تخضعن بالقول فيطمع الذي في قلبه مرض﴾ (الأحزاب: ٣٢)

واتە: باناافرەتان دەنگیان ناسك نەکەنەوە نەوەك فاسـق و کەم باوەڕەکان تەماعیان تێبکەن. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەدەنگی ئافرەت هۆی فیتنەیە لەبەرئەوە ئەبێت لای پیاوی بێگانە دەنگ بەرزنەکاتەوە.

(٣)ئایەتی: ﴿ولايبدين زينتهن الا ماظهر منها﴾ (النور: ٣١).

واتە: باناافرەتان لەشیان دەرنەخەن بێجگە لەدەمو چاوو دەستیان

ابوداود (٦٤٠) عن ام سلمه (رضي الله عنها) أنها سألت النبي (ﷺ): (أتصلي المرأة في درع وخمار وليس عليها ازار؟ قال: ((اذا كان الدرع سابغا يغطي ظهور قدميها)) ).

(ام سلمه) (رضي الله عنها) لەپێغەمبەری (ﷺ) پرسـی: ئایـا ئـافرەت دەتوانێـت بـەکراس و چارۆکەوە نوێژ بکات؟ فەرمووی: بەڵێ بەمەرجێك کراسەکەی قاچی داپۆشێت.

ئاشـکرایە کەئەگـەر لەڕاوەسـتان دا پشـتی قـاچ دا بپۆشـێت لـەکاتی سـوجدەدا بەری قاچ دائەپۆشێت.

(٤) واتـە لەداپۆشـینی عـەورەت لـەنوێژدا بـەڵام لەغـەیری ئـەم حاڵەتـەدا وەك ئافرەتی حوڕوایە.

(فَصلٌ) وَالّذي يُبطِلُ الصَّلاةَ أَحَدَ عَشَرَ شَيئاً: الكَلامُ العَمدُ، وَالعَمَلُ الكَثيرُ، وَالحَدَثُ، وَحدوثُ النَّجاسَةِ، وَانكِشافُ العَورَةِ، وَتَغييرُ النِّيَّةِ، وَاستِدْبارُ القِبلَةِ، وَالأَكلُ وَالشُّربُ، وَالقَهقَهةُ، وَالرِّدَّةُ،

(فَصلٌ) وَرَكَعاتُ الفَرائِضِ سَبعَةَ عَشَرَ رَكعَةً: . فيها أَربعٌ وَثَلاثونَ سَجدَةً، وَأَربعٌ وتِسعونَ تكبيرةً وتِسعُ تَشَهُّداتٍ،وَعَشرُ تَسليماتٍ.

(باس) ئەوانەی نوێژیان پێ بەتاڵ دەبێتەوە یانزە شتن: بەعەمدی قسەبکات [1]، جموجوولی زۆر [2]، بێدەستنوێژی، پەیابوونی پیسی، دەرکەوتنی عەورەت، نیەت گۆڕین [3]، پشت بکاتە قیبلە، خواردن‌و خواردنەوە، قاقای پێکەنین، کافربوون. [4]

(باس) ژمارەی ڕکاتەکانی نوێژە فەرزەکان حەڤدەن، سی‌وچوار سوجدەیان تیایە، نەوەدو چوار (الله اکبر)، نۆ تەحیات دەجار سەلام دانەوە.

(١) بوخاری (٤٢٦٠) موسلم (٥٣٩) (( عن زيد بن أرقم (ﷺ) قال: كنا نتكلم في الصلاة يكلم احدنا أخاه في حاجته حتى نزلت هذه الآية: ﴿وحافظوا على الصلوات والصلاة الوسطى وقوموا لله قانتين﴾ (البقرة: ٢٣٨) فأمرنا بالسكوت)).

(زيد بن أرقم) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت لەنوێژدا قسەمان دەکردو چی‌مان بویستایە لەگەڵ یەکدا دەمان ووت تاناْیەتی: ﴿وحافظوا على الصلوات والصلاة الوسطى وقوموا لله قانتين﴾ (البقرة: ٢٣٨) نازڵ بو ئیتر فەرمانمان پێکرا کەلەنوێژدا بێ دەنگ بین.

مسلم (٥٣٧) ((عن معاوية بن الحكم السلمي (ﷺ) عن رسول الله (ﷺ) قال: ((ان هذه الصلاة لايصلح فيها شيء من كلام الناس انما هو التسبيح والتكبير وقراءة القرآن)).

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: لەنوێژدا هیچ جۆرە قسەکردنێك دروست نی‌یە چونکە ئەمە تایبەتە بەتەسبیح‌و تەکبیرو قورئان خوێندن.

(٢) لەگەڵ دەستوری نوێژدا ناگونجێت.

(٣) واتە نیەتی لەنوێژ دەرچوون بهێنێ.

(٤) چونکە ئەمانە هەندێکیان لابردنی مەرجێکی نوێژن یان ڕوکنێکی نوێژ.

وَمِاْةُ وثَلاثُ وَخَمسونَ تَسبيَحةً. وجُملـةُ الأَركانِ في الصَّلاةِ مِاْةُ وسِتَّةُ وَعشرونَ ركناً: في الصُّبحِ ثلاثونَ ركناً، وفي المَغرِبِ إثنانِ وَأَربعونَ ركناً، وفي الرُّباعيةِ أربعةُ وخَمسونَ ركناً. وَمَن عَجَزَ عنِ القِيامِ في الفَريضَةِ صَلّىٰ جالِسًا، وَمَن عَجَز عنِ الجُلوسِ صَلّىٰ مُضطَجِعاً.

(فَصلٌ) والمَتروكُ مِنَ الصَّلاةِ ثلاثةُ أشياءَ: فَرضٌ، وَسُنّةٌ، وهَيئَةٌ. فالفَرضُ: لايَنوبُ عَنهُ سُجودُ السَّهوِ، بَل إن ذَكَرَهُ والزَّمانُ قَريبُ أتىٰبه، وَبنىٰ عَليهِ وَسَجَدَ لِلسَّهوِ.

سەدو سیو پێنج جار سبحان الله. سەرجەمی ڕوکنەکانی نوێژەکان سەدو بیستو شەش ڕوکنن: بەیانی سی ڕوکن، شێوان چلو دوو نوێژە چوار ڕکاتی‌یەکان پەنجاو چوار ڕوکن. ئەگەر یەکێك لەنوێژە فەرزەکاندا توانای وەستانی نەبوو بەڕاکشانەوە دەی‌کات. [1]

(باس) ئەو شتانەی لەنوێژدا لەبیر دەکرێن سی‌شتن: فەڕز، سوننەت، شێوە. ئەگەر فەرزبوو ئەوا بەسوجدەی سەهو قەرەبوو ناکرێتەوە بەڵکو ئەگەر بیری هاتەوەو ماوەکەی زۆر نەبوو ئەوا دەگەڕێتەوە سەری دەی‌کاتو بەردەوام دەبێت پاشان سوجدەی سەهو دەبات. [2]

(١) حەدیسی پێشوو کەلە(عمران بن حصین)ەوە ڕیوایەت کراوە:

بەپێوە نوێژبکەو ئەگەر نەت توانی بەدانیشتنەوە ئەگینا لەسەر لاتەنیشت.

(٢) بوخاری (١١٦٩) (عن ابی هریرة (ﷺ) قال: صلى النبي (ﷺ) الظهر أو العصر فسلم فقال ذواليدين: الصلاة يارسول الله أنقصت؟ فقال النبي (ﷺ) لأصحابه: ((أحق مايقول))؟ قالوا: نعم، فصلى ركعتين أخريين ثم سجد سجدتين)) ).

أبوهریرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە: جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی نیوەڕۆی دەکرد پاش دووڕکات سەلامی دایەوە یەکێك لێی پرسی: ئایا نوێژ کەمی‌کردووە؟ ئەویش لەخەڵکەکەی پرسی ئایا ڕاست دەکات؟ ووتیان بەڵێ. ئیتر دووڕکاتی‌تری کردو دوو سوجدەی برد.

**وَالسَّنةُ لايَعودُ إِلَيها بعدَ التَّلَبُّسِ بالفَرضِ، لكِنَّهُ يَسجُدُ للسَّهوِ عَنها. وَإِذا شَكَّ في عَدَدِ ماأتىٰ بهِ مِن الركعاتِ بَنىٰ عَلىٰ اليَقينِ وهو الأقَلُّ وَسَجَدَ لِلسَّهوِ. وَسُجودُ السَّهوِ سُنَّةٌ؛ وَمَحَلُّهُ قَبلَ السَّلامِ.**

بەڵام بۆ سوننەت ئەگەر دەستی بەفەرزکردبوو ئەوا ناگەڕێتەوە سەری و سوجدەی سەهو لەبری ئەبات [1]. بۆ شێوە: پاش تەرك كردنی جارێكی تر ناگەڕێتەوە سەری و سوجدەی سەهویشی بۆ نابات [2] ئەگەر كەوتە گومانەوە لەژمارەی ڕكاتەكان ئەوا ئەو ژمارەیە دابنێ كەڵێ ی دڵنیابە واتە كەمترین ژمارە پاشان سوجدەی سەهو ببات [3]. سوجدەی سەهو سوننەتەو [4] دەبێت پێش سەلام دانەوە بێت [5].

---

(١) بوخاری (١١٦٦) موسلم (٥٧٠): ((عن عبدالله بن بحینة (ﷺ) انه قال: صلى لنا رسول الله (ﷺ) ركعتين من بعض الصلوات... في رواية قام من اثنتي من الظهر ثم قام فلم يجلس فقام الناس معه فلما قضى صلاته ونظرنا تسليمه كبر قبل التسليم فسجد سجدتين وهو جالس ثم سلم))

پێغەمبەر (ﷺ) لەنوێژێكی چوار ڕكاتیدا پاش دووڕكات (تحیات)ی نەخوێندو هەڵسایەوە كەلێبۆوە چاوەڕوان بوون سەلام بداتەوە كەچی دوو سوجدەی برد ئینجا سەلامی دایەوە.

(ابن ماجه) (١٢٠٨) (ابوداود) (١٠٣٦) عن المغيرة ابن شعبة قال: (قال رسول الله (ﷺ): ((اذا قام احدكم من الركعتين فلم يستتم قائما فليجلس واذا استتم قائما فلا يجلس ويسجد سجدتى السهو)).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر دوای دوو ڕكات هەڵسانەوە بەتەولوەتی ئەوا دامەنیشنەوەو دوو سوجدەی سەهوببەن ئەگەر تەواو ڕاست نەبیوونەوە ئەوا دابنیشنەوە بۆ (تحیات)).

(٢) چونكە ئەمانە زۆر گرنگ نین و كەس سوجدەی لەبری نەبردوون.

(٣) مسلم (٥٧١) عن ابی سعید (ﷺ) قال: (قال رسول الله (ﷺ): ((اذا شك احدكم في صلاته فلم يدركم صلى ثلاثا أم أربعا؟ فليطرح الشك وليبن على ما استيقين ثم يسجد سجدتين قبل ان يسلم فان صلى خمسا شفعن له صلاته وان كان صلى اتماما لأربع كانتا ترغيما للشيطان)) ).

پێغەمبەر فەرموویەتی: ئەگەر یەكێك لەنوێژدا كەوتە گومانەوە داخوا سێ ڕكاتی كردووە یان چوار ئەوا واز لەگومان بێنێ لەچەند دڵنیایە لەسەر ئەوە تەواوی بكات پاشان دوو سوجدەی سەهو ببات.

(٤) چونكە بۆ ئەركی واجب دانەنراوە كەواتە سوننەتە.

(٥) هەروەك لەحەدیسەكاندا وا ڕیوایەت كراوە.

**(فَصلٌ) وَخَمسةُ أَوقاتٍ لايُصَلىٰ فيها إلاّ صَلاةٌ لَها سَبَبٌ: بعدَ صَلاةِ الصّبحِ حتىٰ تَطلعَ الشمسُ، وعندَ طلوعِها حَتىٰ تَتَكامَلَ وتَرتَفِعَ قَدرَ رُمحٍ، وإذا استَوَتْ حَتىٰ تَزولَ، وبعدَ صلاةِ العصرِ حتىٰ تغرُبَ الشمسُ، وعندَ الغُروبِ حَتىٰ يَتَكامَلَ غُروبُها.**

**(باس) پێنج كات هەن كەبێجگە لەنوێژی خاوەن هۆنابێت نوێژیان تیابكرێت: پاش نوێژی بەیانی تاخۆرهەڵدێت: كاتی خۆرهەڵات تابەتەواوی هەڵدێتو بەقەدەر رمێك بەرزدەبێتەوە. كاتی نیوەڕۆ تابەتەواوی لەناوەڕاستی ئاسمان لائەدات، پاش نوێژی عەسر تارۆژئاوا دەبێت، كاتی خۆرئاوا تابەتەواوی ئاوا دەبێت.**[1]

(١) بوخاری (٥٦١) موسلم (٨٢٧) (عن ابی سعيد الخدری (ﷺ) قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: ((لاصلاة بعد الصبح حتى ترتفع الشمس ولا صلاة بعد العصر حتى تغيب الشمس)).

پێغەمبەر فەرموویەتی: پاش نوێژی بەیانی نابێت نوێژ بكرێت تاخۆر بەرز دەبێتەوە پاش عەسریش تاخۆرئاوا دەبێت.

موسلم (٨٣١) عن عقبة بن عامر (ﷺ) قال: ((ثلاث ساعات كان رسول الله (ﷺ) ينهانا ان نصلی فيهن وان نقبر موتانا حين تطلع الشمس بازغة حتى ترتفع وحين يقوم قائم الظهيرة حتى تزول وحين تضيف الشمس للغروب))

(ئەبو سعيد الخدری) دەگێڕێتەوە: سێ‌كات هەن پێغەمبەر نەهی ئەكرد كەنوێژیان تیابكەین یان مردوویان تیابخەینە گۆڕەوە: خۆرهەڵات تابەتەواوی بەرزدەبێتەو. نیوەڕۆ تالەناوەڕاستی ئاسمان لائەدات، كاتی خۆرئاوا بوون.

بەڵام ئەو نوێژانەی كەهۆی تایبەتی‌یان هەیە چ سوننەت چ فەرز ئەوا لەهەموو كاتێك دا دەكرێن: بوخاری (٥٧٢) موسلم (٦٨٤) عن انس (ﷺ) عن النبی (ﷺ) قال: ((من نسی صلاة فليصل اذا ذكرها لاكفارة لها الا ذلك ﴿وأقم الصلاة لذكری﴾)) (طه: ١٤).

لە(انس)ەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر یەكێك نوێژێكی لەبیرچوو بوو هەركاتێك بیری هاتەوە بابی‌كات بێجگەلەوە هیچ كەفارەتێكی‌تری نیە ﴿أقم الصلاة لذكری﴾ (طه: ١٤).

بوخاری (١١٧٦) موسلم (٨٣٤) عن ام سلمة (ﷺ) انه: ((ﷺ) صلى ركعتين بعد العصر فسألته عن ذلك فقال: ((يابنت أبي أمية سألت عن الركعتين بعد العصر وانه أتاني ناس من عبد القيس فشغلوني عن الركعتين اللتين بعد الظهر فهما هاتان)) ).

(ام سلمة) دەڵێت: جارێكیان پێغەمبەر (ﷺ) پاش عەسر دوو ڕكات نوێژی كرد منیش لێم پرسی فەرمووی: چەند كەسێك مەشغووڵیان كردم دووڕكاتەكەی دوای نیوەڕۆم نەكردبوو ئەمە لەبری ئەوانەیە.

(فَصلٌ) وَصَلاةُ الجَماعَةِ سُنَّةٌ مُؤَكَّدةٌ وعلىٰ المَأمومِ أن يَنوي الإئتِمامَ دونَ الإمامِ. وَيجوزُ أَن يَأتَمَّ الحُرُّ بِالعَبدِ، والبالِغُ بِالمُراهِقِ، ولاتَصِحُّ قُدوَةُ رَجُلٍ بِامرَأةٍ، ولاقارِيءٍ بِأُمِّيٍّ.

(باس) نوێژکردن بەجەماعەت سونەتێکی گەورەیە [1]، مەئموومی پێویستە نیەتی (اقتداء) بهێنێت [2] بەڵام بۆ ئیمام پێویست نییە. حور بۆی هەیە (اقتدا) بەکۆیلە بکات هەروەها باڵق بە نەباڵق [3] بەڵام نابێت پیاو (اقتدا) بەئافرەت بکات [4] هەروەها نابێت خوێندەوار بەنەخوێندەواری بکات [5].

(١) جیاوازی پیاوو ئافرەت نییە. بوخاری (٦١٩) موسلم (٦٥٠) ((عن عبدالله بن عمر (ﷺ): ان رسول الله (ﷺ) قال: ((صلاة الجماعة تفضل صلاة الفذ بسبع وعشرين درجة)).

پێغەمبەر فەرموویەتی: نوێژی بەجەماعەت بیستو حەوت دەرەجەی بەسەر نوێژی تەنیاییەوە هەیە واتە گەورەترە.

جەماعەت بۆ ئەوانەی کەنیشتەجێی شوێنێکن فەرزی کیفایەیە تاکو ئەو شیعارە ئاشکرا ببێت (ابوداود) (٥٤٧) (ابن حیان) (٤٢٥) ((مامن ثلاثة فی قریة أو بدو لاتقام فیهم الجماعة وفي روایة —الصلاة— إلا إستحوز علیهم الشیطان)).

پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر سێکەس لەگوندێك دا یان لەبیابان دا جەماعەت نەکەن شەیتان بەسەریان دا زاڵ دەبێت...

(٢) تاکو خێری جەماعەتی بکاتێ ((إنما الأعمال بالنیات)).

(٣) مەبەست ئەو منداڵەیە کە نزیکی باڵق بوون بۆتەوە بوخاری (٤٥٠١) (إن عمرو بن سلمة (ﷺ) کان یؤم قومه وهو إبن ست أو سبع سنین).

(عمرو بن سلمە) لەتەمەنی حەوتساڵیدا ئیمامەتی بۆ خەڵکەکە دەکرد.

(٤) أبو داود (٥٩٦) عن مالك بن الحویرث (ﷺ) قال: سمعت رسول الله (ﷺ) یقول: ((من زار قوما فلا یؤمهم ولیؤمهم رجل منهم)).

پێغەمبەر فەرموویەتی: ((یەکێك بەسەردان چووە لای خەڵکانێك نابێت ئەو ئیمامەت بکا دەبێت پیاوێك لەوان ئیمامەت بکات؟ واتە: نابێت ئافرەت ئیمامەت بۆ پیاوان بکات.

(٥) خوێندەوار بەوکەسە دەڵێن: کەبەبێ هەڵە بتوانێت سوورەتی فاتحە بخوێنێت، نە خوێندەواریش ئەو کەسەیە کە هەڵە لەحەرفێکیدا بکات چونکە لەوەپێش ووتمان کە خوێندنی ئەو سوورەتەبە تەواوی ڕوکنێکی نوێژە. بەڵام بۆ خۆی قەیدی نییە.

وَأيُّ مَوضِعٍ صَلّىٰ في المَسجِدِ بِصَلاةِ الإمامِ فيه، وهُو عالِمٌ بِصَلاتِه أجزَأه مالَم يَتَقَدَّمْ عَليهِ. وَإن صَلىٰ في المَسجِدِ وَالمأمومُ خارِجَ المسجِدِ قَريبًا مِنه وهو عالِمٌ بِصَلاتِهِ، وَلاحائِلَ هُناكَ جازَ.

(فَصلٌ) ويجوزُ لِلمُسافِرِ قَصرُ الصَّلاةِ الرُّباعيّةِ بِخَمسِ شَرائِطَ:

لەناو مزگەوت دا لەهەر شوێنێکەوە ئیقتیدا بەئیمام بکات و ئاگای لەونوێژەی هەبێت ئەوا بەجەماعەت بۆی دائەنرێت بەمەرجێك پێش ئیمام نەکەوێت [1] ئەگەر ئیمام لەناو مزگەوت دا بوو وەمەئموم لەدەرەوە بوو لەنزیکەوەو ئاگای لەنوێژەکەی بوو وەهیچ شتێك نەکەوتبووە نێوانیانەوە [2] ئەوەش دروستە.

(باس) یەکێك لەسەفەردا بێت بۆی هەیە نوێژی چوار ڕکاتی کورت بکاتەوە [3] ئەگەر ئەم پێنج مەرجە بێنەدی:

(١) واتە نوێژی ئیمامەکە. بەم شێوە گوێی لێبێت یان چاوی لێ بێت یان گوێی لەیەکێك بێت کەرووتەکانی ئیمام دووبارە دەکاتەوە یان چاوی لەڕیزەکان بێت.

(٢) واتە شتێك کەڕێگای بینینی یان چوونە لای ئیمامی لێبگرێت.

(٣) ئایەتی :﴿وإذا ضربتم في الارض فليس عليكم جناح أن تقصروا من الصلاة﴾ (النساء: ١٠١) واتە ئەگەر لەسەفەردا بوون ئەوا بۆتان هەیە نوێژ کورت بکەنەوە وەگوناح تان ناگات.

موسلم (٦٨٦) عن يعلى بن أمية قال: (قلت لعمر بن الخطاب (ﷺ) ﴿ليس عليكم جناح أن تقصروا من الصلاة ان خفتم ان يفتنكم الذين كفروا﴾ فقد أمن الناس؟ فقال: عجبت مما عجبت منه فسألت رسول الله (ﷺ) عن ذالك فقال: ((صدقة تصدق الله بها عليكم فاقبلوا صدقته)) ).

ئەسحابەیەك لەئیمامی (عمر)ی پرسی: خۆ ئێستا ترسی دوژمن مان نی یە چۆن نوێژ کورت بکەینەوە؟ ئیتر لەپێغەمبەرمان پرسی ئەویش فەرمووی: ئەمە ڕەحمەتێکی خوایە بۆچی قبوڵی ناکەن؟ کەواتە ئەمە پەیوەندی بەمەترسی یەوە نی یە.

بوخاری (١٠٣٩) موسلم (٦٩٠) ((عن أنس (ﷺ) قال: صليت الظهر مع النبي (ﷺ) بالمدينة أربعاً والعصر بذى الحليفة ركعتين))

نوێژی عەسرمان لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) کرد لەسەفەردا تەنها دووڕکات.

**أَن يكونَ سفرُهُ في غَيرِ معصيَةٍ، وَأَن تكونَ مَسافَتُهُ سِتَةَ عشَرَ فرسَخاً، وَاَن يكونَ مُؤدِّيًا لِلصَّلاةِ الرباعيّةِ، وان يَنوي القَصرَ معَ الإحرام، وَان لايَأتَمَّ بِمُقيمٍ وَيَجوزُ لِلمُسافِرِ أن يَجمَعَ بينَ الظهرِ والعَصرِ في وَقتِ إيّهما شاءَ، وبينَ المَغرِب وَالعِشاءِ في وَقت إيِّهما شاءَ.**

**سەفەرەکەی بۆ کارێکی گوناح نەبێت، ماوەکەی شانزە فرسەخ بێت [1]، کاتی تایبەتی نوێژەکە بێتو قەرز نەبێت.[2]**

**ولەگەڵ نوێـژ دابەسـتن دا نیـەتی کـورت کردنـەوە بێنێـت، ونـابێت ئیقتیـدا بەئیمامێك بكات كەلەسەفەردا نەبێت.[3]**

**بۆ ئەو کەسەی کەلەسەفەردایە دروستە نوێـژی عەسـرو نیـوەڕۆ كۆبكاتـەوە بەیەکەوە لەکاتی هەر کامێکیان دا بێت دروستە، هەروەها نوێژی شێوانو خەوتنان بەیەکەوە لەکاتی هەرکامێکیان دا بێت [4] كۆبكاتەوە**

(١) بریتیـیە لـە (٨١) کیلۆمـەتر......... بـەڵام خـاوەنی کتێبـی (تنویـر القلـوب) ئەفـەرموێت: ئەندازەکـەی بریتیـە لـە ٨٠/٦٤٠ کم لەبـەر حەدیسـی عبداللـە کـوڕی عبـاسو عبدالله کوڕی عمر خوایان لێڕازیبێـت کەئەفـەرمووێ: (ابن عمر وابن عباس (ﷺ) عنـهما يقصران ويفطران فی اربعة برد وهی: ستة عشر فیرسخا) (رواه البخاری).

بڕوانە کتێبی (متن الغاية والتقريب فی الفقة الشافعی) (لاپەڕە: ٨٢).

(٢) واتە نوێژی قەرز بەهیچ جۆرێك کورت ناکرێتەوە چ هی ماڵەوە لەسـەرفەداو چ هـی سەفەر لەماڵەوەدا.

(٣) لە(ابن عباس)ەوە لێیان پرسی: بۆچی سەفەری ئەگەر تەنـها بێت دووڕکات دەکات کـەچی کەلەگەڵ جەماعەت بێت چوار ڕکات دەکات؟ فەرمووی: ئەوە سوننەتو عادەتەو دەستکاری ناکرێت.

(٤) بوخاری (١٠٥٦) (عن ان عباس (ﷺ) قال: کان رسول الله (ﷺ) یجمـع بـین صـلاة الظهر والعصر اذا كان ظهر سیر ويجمع بين المغرب والعشاء)).

((پێغەمبەر (ﷺ) لەسەفەردا نوێژی نیوەڕۆو عەسری بەیەکەوە کۆدەکردەوە هەروەها شێوان وخەوتنان)).

أبـوداودا (١٢٠٨) الـترمذي (٥٥٣) عـن معـاذ (ﷺ) ((أن النـبي كـان في غـزوة تبـوك إذا إرتحل قبل أن تزيغ الشمس أخر الظهر حتى يجمعها إلى العصـر يصليـهما جميعـا وإذا إرتحـل بعد زيغ الشمس صلى الظهر والعصر جميعا ثم سار وكان إذا إرتحل قبل المغرب أخر المغرب حتى يصليها مع العشاء وإذا إرتحل بعد المغرب عجل العشاء فصلاها مع المغرب)).

((پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر پێش نیوەڕۆ بکەوتایەتەڕێ ئەوا نوێژی نیوەڕۆی دوا دەخست لەگەڵ عەسردا بەیەکـەوە دەی کردن وەئەگـەر پـاش نیـوەڕۆ بکەوتایـە تـەڕێ ئـەوا نیـوەڕۆو عەسـری بەیەکەوە دەکرد ئینجا دەکەوتەڕێ هەروەها بۆ نوێژی مەغریب وعیشاهەمان شێوەی دەکرد)).

وَيجوزُ لِلحاضِرِ في المَطَرِأَن يَجمَعَ بَينَهُما في وَقتِ الأُولى مِنهُما .

(فَصلٌ) وشَرائِطُ وجوبِ الجُمعةِ سَبعةُ أَشياءَ: الإِسلامُ، والبُلوغُ، والعَقلُ، والحُرِّيةُ، والذكورِّيةُ، وَالصِحةُ والإستيطانُ.

. دروستە بۆ ئەو كەسەی كەلەسەفەردا نىیە بەلاّم كاتی باران بێت ئەو دوانە كۆبكاتەوە لەكاتی یەكەمیان دا. [1]

(باس) مەرجەكانی واجب بوونی جمعە[2] حەوت شتن: ئیسلامەتی، بالّق بوون، ئەقلْ، حوڕیەت، نێربێت، تەندروستی باش بێت، نیشتەجێی شوێنەكەبێت [3].

(١) بوخاری (٥١٨) موسلم (٧٠٥) عن ابن عباس (ﷺ): ((ان النبی (ﷺ) صلی بالمدینة سبعاً وثمانیا الظهر والعصر والمغرب والعشاء - زاد مسلم - من غیر خوف ولاسفر - أیوب: لعله فی لیلة مطیرة؟ قال: عسی.))

ابن عباس (خوای لیّ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) لەمەدینە حەوت ڕكاتو هەشت ڕكاتی بەیەكەوە دەكرد واتە: نیوەڕۆو عەسرو شێوانو خەوتنان بیّئەوەی مەترسی هەبێت یان لەسەفەردا بێت. دیارە كاتەكەی باران بووە. مەرجە ئەبێت ئەو كۆكردنەوە بەجەماعەتو لەمزگەوت دابێت. نابیّ لەكاتی دووەمیان دا كۆیان بكاتەوە چونكە لەوانەیە تا ئەوكاتە بارانەكە نەمێنێت نابێت بەخۆڕایی نوێژەكەی دوابخات

(٢) ئایەتی ﴿یاأیها الذین أمنوا اذا نودی للصلاة من یوم الجمعة فاسعوا الی ذكر الله وذروا البیع ذلكم خیرلكم ان كنتم تعلمون﴾ (الجمعة: ٩) موسلم (٨٦٥) ((عن ابی هریره (ﷺ) وابن عمر (ﷺ) انهما سمعا النبی یقول علی أعواد منبره ((لینتهین أقوام عن ودعهم الجمعات او لیختمن الله علی قلوبهم ثم لیكونن من الغافلین)).

پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر مینبەر دەی فەرموو: ئەوانەی كەجمعە ناكەن یان ئەبێت واز لەوكارە بێنن یان دەكەونە بەر غەزەبی خوا.

(٣) واتە سەفەری نەبێت الدارقطنی (٣/٢) (عن جابر (ﷺ) عن النبی (ﷺ) ((من كان یؤمن بالله والیوم الأخر فعلیه الجمعة الا امرأة ومسافراً وعبداً ومریضاً))

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ئەوەی ئیمانی بەخواو پێغەمبەر هێناوە لەسەریەتی جومعە بكات. بێجگە لە كۆیلە - ئافرەت - مندالّ - نەخۆش.

َوشَـرائِطُ فعلِها ثَلاثَةٌ: أَن تكـونَ البَلَدُ مِصـراً أو قَريـةً، وأَن يكـونَ العَـدَدُ أربعينَ مِن أهلِ الجمعةِ، وأَن يكـونَ الوقـتُ باقِيًا، فإِن خَرَجَ الوقـتُ أَو عُدِمَـت الشّروطُ صُلِّيَتْ ظُهراً.

َوفَرائِضُها ثلاثةٌ: خُطبتانِ يَقومُ فيهما وَيجلِسُ بَينَهُما،

مەرجی بەئەنجامدانی سیّشتن: ئەبێت ئەو شوێنە شارۆچکە یان گوندبێت [1]، ئەبێت ژمارەی ئەوانەی کەجومعەیان لەسەرە لەچل کەس کەمتر نەبێت [2]، کاتی نوێژی نیوەڕۆ بەسەرنەچووبێت [3]. ئەگەر کات بەسەرچووبوو یان مەرجەکان نەمان ئەوا نوێژی نیوەڕۆ دەکرێت.

فەرزەکانی جومعە سیّشتن: دوو وتار بەوەستانەوەو لەنێوانیان دا دابنیشیت [4]،

(١) شارۆچکە: ئەوەیە کەبازارو هەندێك دائیرەی حکومەتی تێدابێت لەسەردەمی پێغەمبەردا چەند تیرەیەك لەدەوری مەدینە بوون جومعەیان نەدەکرد.

(٢) واتە لەو کەسانەی کەئەو مەرجانەی پێشوویان تیابێت بەڵگە لەسەر ئەو ژمارەیە: الدارقطني (٤/٢) البيهقي (١٧٧/٣) (عن جابر (ﷺ) قال: ((مضت السنة ان في كل أربعين فما فوق ذلك جمعة))

جابر (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: وابڕیار دراوە کەلەچل کەس‌و زیاتر جومعە واجب دەبێت.

ابوداود (١٠٦٩) عن كعب بن مالك (ﷺ) : (ان أول من جمع بهم أسعد بن زرارة (ﷺ) وكانوا يومئذ أربعين).

یەکەم کەس کەجومعەی کرد (أسعد بن زرارة)بوو لەوکاتەدا چل کەس بوون.

(٣) بوخاری (٣٩٣٥) موسلم (٨٦٠) عن سلمة بن الأكوع (ﷺ) قال: ((كنا نصلي مع النبي (ﷺ) الجمعة ثم ننصرف وليس للحيطان ظل نستظل فيه ـ ماكنا نقيل ولانتغذى الا بعد الجمعة)).

(سلمة بن الأكوع) دەگێڕێتەوە: کەلەجومعە دەگەڕاینەوە دیوارەکان سێبەریان نەبوو هەروەها نانی نیوەڕۆمان نەخواردبو و خەوی نیوەڕۆمان نەکردبوو واتە کاتەکەی سەرەتای نیوەڕۆ بووە.

(٤) بوخاری (٨٧٨) موسلم (٨٦١) عن ابن عمر (ﷺ) قال: كان النبي (ﷺ) يخطب قائما ثم يقعد ثم يقوم كما تفعلون الآن)

پێغەمبەر (ﷺ) بەوەستانەوە وتاری جومعەی دەخوێندەوە دادەنیشت ئینجا هەڵدەستایەوە.

وَاَن تُصَلّىَ رَكعتَين، في جَماعَةٍ. وَهَيأتُها اَربعُ خِصالٍ: الغُسلُ و تَنظيفُ الجَسَدِ، وَلُبسُ الثِّيابِ البيضِ، واَخذُ الظُّفُرِ، والطّيبُ، وَيُستَحَبُّ الانصاتُ في وَقتِ الخُطبة،

دوورِكات بكرێت(1)، بەجەماعەت بێت(2).

بۆكردنی جومعە چوار سیفەت رەچاو دەكرێت: خۆشۆردن و لەش پاككردنەوە، لەبەركردنی جلی سپی، نینۆك كردن، بۆنی خۆش لەخۆدان، واباشە لەكاتی (خطبە) ووتارەكەدا بێدەنگ بێت(3)،

(1) ئیجماعی لەسەرە واتە یەك دەنگی ئیمامەكان النسائی (111/3) (إبن عمر (ﷺ) انه قال: صلاة الجمعة ركعتان.... على لسان محمد (ﷺ))

عومەر (خوای لێ رازی بێت) دەفەرموێت: نوێژی جومعە دوو ركاتە لەسەر زمانی محمد (ﷺ).

(2) لەسەردەمی پێغەمبەرو خولەفای راشدین وەها كراوە ابوداود/ 1067 ((طارق بن شهاب (ﷺ) عن النبی (ﷺ) قال: الجمعة حق واجب على كل مسلم فی جماعة)).

لەپێغەمبەرەوە ریوایەت كراوە: جومعە واجبە لەسەر هەموو موسولمانێك بەجەماعەت دەكرێت.

بوخاری (843) (عن سلمان الفارسی (ﷺ) قال: قال النبی (ﷺ) ((لایغتسل رجل یوم الجمعة ویتطهر ماستطاع من طهر ویدهن من دهنه أو یمس من طیب بیته ثم یخرج فلا یفرق بین اثنین ثم یصلی ماكتب له ثم ینصت اذا تكلم الامام الاغفر له مابینه وبین الجمعة الأخری)).

سلمان الفارسی (خوای لێ رازی بێت) پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: هەر كەسێك رۆژی هەینی خۆی بشوات و تابتوانێت خۆی پاك بكاتەوەو بۆنی خۆش لەخۆی بداتو بروات بۆ جومعەو نەبێت بەئەرك بەسەر كەسەوەو نوێژێكاتو پاشان بێدەنگ گوێ لەئیمام بگرێت ئەوا خوا لەتاوانەكانی تاهەینی داهاتو خۆش دەبێت.

الترمذی (994) ((البسوا من ثیابكم البیاض فانها من خیر ثیابكم وكفنوا فیها موتاكم))

جلی سپی لەبەربكەن چونكە باشترین جلەو مردووەكانیشتان لەو رەنگەدا كفن بكەن.

پێغەمبەر (ﷺ) نینووكی دەكردو سمێلی موبارەكی كورت دەكردەوە لەرۆژانی هەینیدا.

(3) بوخاری (892) موسلم (851) عن ابی هریرة (ﷺ) ان النبی (ﷺ) قال: ((اذا قلت لصاحبك یوم الجمعة: أنصت والامام یخطب فقد لغوت)).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەگەر لەكاتی ووتاری جومعەدا بەهاورێكەت بڵێیت بێدەنگ بە ئەوا قسەیەكی ناشیرین دەكەیو خێری جومعەكەت ناگاتێ)).

**وَمَن دَخَلَ والإمامُ يَخطُبُ صَلَّىٰ ركعتَين خَفيفَتَين ثُمَّ يَجلِسُ.**

**(فَصلٌ) وَصلاةُ العيدَين سُنَّةٌ مُؤَكَّدةٌ، وهِيَ رَكعتانِ يُكَبِّرُ في الأولىٰ سَبعًا سِوىٰ تكبيرةِ الاحرامِ وفي الثانيةِ خَمساً سِوىٰ تكبيرَةِ القِيام.**

**ئەگەر یەکێك ئامادەی جومعە بوو لەوکاتەدا ئیمام ووتاری ئەدا ئەوا دوورکات نوێژی خێرا دەکاتو دادەنیشێت.[1]**

**(باس) نوێژی جەژنەکان سوننەتێکی گەورەیە[2]، بریتین لەدوو ڕکات[3] لەرکاتی یەکەم دا بێجگە لە(الله اکبر)ی ئیحرام حەوت جاریتر (الله اکبر) دەکاتو وەلەرکاتی دووەم دا بێجگە لە(الله اکبر)ی هەڵسانەوە پێنج جار (الله اکبر) دەکات.[4]**

(١) موسلم (٨٧٥) عن جابر (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ): ((اذاجاء احدكم يوم الجمعة والامام يخطب فليركع ركعتين وليتجوز فيهما))

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان ئامادەی جومعەبوو لەوکاتەدا ئیمام ووتاری ئەدا بادووڕکاتی خێرابکات بخاری (٨٨٨)

(٢) بوخاری (٩١٣) موسلم (٨٨٩) عن ابی سعید الخدری (ﷺ) قال: ((كان رسول الله (ﷺ) يخرج يوم الفطر والأضحى الى المصلى فأول شيء يبدأ به الصلاة ثم ينصرف فيقوم مقابل الناس والناس جلوس على صفوفهم فيعظم ويوصيهم ويأمرهم فان كان يريد ان يقطع بعثا قطعه أويأمر بشيء امر به ثم ينصرف))

ابو سعید الخدری (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژانی جەژنی ڕەمەزانو قوربان ڕووی دەکردە شوێنی نوێژ یەکەمجار نوێژی دەکرد ئینجا ڕووی دەکردە خەڵکەکە دەستی دەکرد بەئامۆژگاری کردن یان ئەوانیش بەدانیشتنەوە گوێیان بۆ شل دەکرد جائەگەر بیویستایە کۆمەڵێك بۆغەزا بنێرێت ئەوا پێی ڕائەگەیاندن.

(٣) النسائی (١١١/٣) من حدیث عمر (ﷺ) انه قال: ((وصلاة الفطر ركعتان وصلاة الأضحى ركعتان ثم قال: على لسان محمد (ﷺ)).

عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێ: نوێژی جەژنی ڕەمەزان دووڕکاتە هەروەها نوێژی جەژنی قوربان ئەمەش ووتەی پێغەمبەرە (ﷺ).

(٤) الترمذی (٥٣٦) عن عمرو بن عوف المزني (ﷺ): ((ان النبي (ﷺ): كبر فی العيدين: فی الأولى سبعا قبل القراءة وفی الأخرة خمسا قبل القراء)).

پێغەمبەر (ﷺ) لەنوێژی جەژنەکان دا تەکبیری دەکرد ڕکاتی یەکەم حەوت جارپێش فاتحەو لەڕکاتی دووەمیش پێنج جار پێش فاتیحە.

**وَيخطُبُ بعدَها خُطبتَينِ يُكَبِّرُ في الأولىٰ تِسعاً وفي الثّانِيَةِ سَبْعاً.**

**وَيُكَبِّرُ مِن غُروبِ الشَّمسِ مِن لَيلةِ العيدِ إلىٰ أن يَدخُلَ الإمامُ في الصَّلاةِ وفي الأضحىٰ: خلفَ الصَّلَواتِ المفروضاتِ مِن صُبحِ يَومِ عَرَفَةَ إلىٰ العصرِ من آخِرِ أيّامِ التَّشريقِ.**

**پاش نوێژەکە دوو وتار دەخوێنێتەوە لەیەکەم دا نۆجار (الله اکبر) دەڵێـت و لەدووەم دا حەوت جار (الله اکبر) دەڵێت.[1]**

**شەوی جـەژنی ڕەمـەزان هەرلـەئێوارەوە (تکبیـر) دەکـات تائەوکاتـەی ئیمـام دەست ئەکات بەنوێژ،[2] لەجەژنی قوربان دا دوای هـەموو نوێـژە فەرزەکان (تکبیر) دەکات هەر لەبەیانی ڕۆژی عەرەفەوە تاعەسری ئاخر ڕۆژی (أیام التشریق) واتـە یانزەو دوانزەو سیانزەی مانگی ذوالحجة.[3]**

(١) بوخاری (٩٢٠) موسلم (٨٨٨) عن ابن عمر (ﷺ) قال: ((كان النبی (ﷺ) وابوبكـر وعمر (ﷺ) يصلون العيدين قبل الخطبة)).

پێغەمبەر (ﷺ)و ئەبوبەکرو عمر (خوایان لێ ڕازی بێت) پێش خوتبەکان نوێژیان دەکرد.

بوخاری (٩٣٢) عن ابن عباس (ﷺ) قال: ((خرجت مع النبی (ﷺ) يوم فطر أو اضحى فصلی ثم خطب)).

ابن عباس (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر بووم ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان نوێژی دەکردو پاشان ووتاری دەخوێندەوە.

(الأم ٢١١/١) روی الشافعی رحمه الله عن عبيدالله ابن عبدالله بن عتبه قال: ((السنة ان يخطب الامام فی العيدين خطبتين يفصل بينهما بجلوس))

ئیمامی شافعی (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: سوننەت وایە کەئیمام لەجەژنـەکان دا دوو وتار بخوێنێتەوەو لەنێوانیاندا دابنیشێت.

البيهقی (٢٩٩/٣) ((السنة ان تفتتح الخطبة بتسع تكبيرات تترى والثانية بسبع تكبيرات تترى))

واباشە سەرەتای ووتارەکان نۆ (الله اکبر)و دووەم بەحەوت (الله اکبر) دەست پێبکات.

(٢) ئایەتی ﴿ولتكملوا العدة ولتكبروا الله على ماهداكم ولعلكـــم تشـــكرون﴾ (البقرة: ١٨٥) ئەڵێن ئەمە بۆ جەژنی ڕەمەزانەو جەژنی قوربانیش وەك ئەو دانراوە.

(٣) الحاكم (٢٩٩/١) عن علی وعمار (ﷺ): ((ان النبی (ﷺ) كان يجهر فی المكتوبـات بسم الله الرحمن الرحيم وكان يقنت فی صلاة الفجـر وكـان يكـبر مـن يـوم عرفـة صـلاة الغداة ويقطعها صلاة العصر آخر أيام التشريق)).

(فَصلٌ) وَصلاةُ الكُسوفِ سُنّةٌ مؤكَدةٌ فإنْ فاتَت لَم تُقْضَ، وَيُصَلّي لِكسوفِ الشمسِ وَخسوفِ القمرِ ركعتَينِ في كُلِ ركعةٍ قيامانِ يُطيلُ القراءَة فيهما، وَركوعانِ يُطيلُ التسبيحَ فيهما دونَ السجودِ،

(باس) ،نوێژی خۆرگیران سوننەتێكی گەورەیە، بەڵام ئەگەر لەكاتی خۆیدا نەكرا ئەوا قەزا ناكرێتەوە، نوێژی خۆرگیرانو مانگ گیران دوورکاتن لەهەر ڕكاتێك دا دوو وەستانی تیایەو قورئیانی زۆری تیائەخوێنریٚو دوو ڕكوعیان تیایە تەسبیحاتی زۆریان تیا ئەكات بەڵام ماوەكە لەهی سوجدە كەمترە،[1]

— علی (خوای لیٚ ڕازی بێت): پێغەمبەر (ﷺ) لەنوێژە فەرزەكاندا بەدەنگی بەرز دەیوت: ((بسم الله الرحمن الرحیم))و لەنوێژی بەیانیدا (قنوت)ی دەخوێندو لەڕۆژی عەرەفەدا هەر لەنوێژی بەیانیەوە تاعەسری دوا ڕۆژی (أیام التشریق) تەكبیری دەكرد.

بوخاری دەفەرموێت: ئیمامی عومەر (خوای لیٚ ڕازی بێت) لەناو خێوەتەكەیدا لە(منی) تەكبیری دەكردو خەڵكەكەش هەموو دووبارەیان دەكردەوە بەشێوەیەك كەهەموو (منی) دەنگی ئەدایەوە.

(١) بوخاری (٩٩٧) موسلم (٩٠١) عن عائشة (ﷺ) قالت: ((خسفت الشمس فی عهد رسول الله (ﷺ) فصلی رسول الله (ﷺ) بالناس فقام فأطال القیام ثم ركع فأطال الركوع ثم قام فأطال القیام وهو دون القیام الأول ثم ركع فاطال الركوع وهو دون الركوع الاول ثم سجد. فاطال السجود ثم فعل فی الركعة الثانیة مثل مافعل فی الاولی ثم انصرف وقد انجلت الشمس فخطب الناس فحمدالله واثنی علیه ثم قال: ((ان الشمس والقمر آیتان من ایات الله لاینخسفان لموت احد ولالحیاته فاذا رایتم ذالك فادعوا الله وكبروا وصلوا وتصدقوا)) )).

عائیشه (خوای لیٚ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە: ((لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) خۆرگیرا ئەویش نوێژی بەخەڵكەكە كرد، زۆر وەستا ئینجا ركوعی بردو زۆر مایەوە لەركوع دا پاشان هەڵسایەوە زۆر مایەوە بەڵام لەهی یەكەم كەمتر ئینجا جارێكیتر چووە ركوع زۆر مایەوە بەڵام لەیەكەم كەمتر پاشان چووە سوجدەو زۆر مایەوە لەڕكاتی دووەمیش دا هەمان شێوەی كرد ئینجا ڕووی‌كردە خەڵكەكە - ڕۆژەكە بەربوو - ئیتر وتاری بۆ خوێندنەوەو فەرمووی: ((خۆرو مانگ دوو نیشانەی خواین نەبەمردنی كەسو نەبەژیانی كەس ناگیرێن هەركاتیٚ ئەوەتان بینی لەخوا بپاڕێنەوەو تەكبیربكەنو نوێژبكەنو خێربكەن. ئەم ڕووداوە ڕێكەوتی مردنی ئیبراهیمی كوڕیبوو)) )). سەردەمی جاهلیەت وایان ئەزانی كەهۆی گیرانی خۆر مردنی پیاوێكی گەورەیە.

وَيَخْطُبُ بعدَها خُطبتَين يُسِرُّ في كسوفِ الشمس، وَيَجهَرُ في خسوفِ القَمر.

(فَصلٌ) وصلاةُ الإستِسقاءِ مَسنونَةٌ فَيَأمُرُهُم الإمامُ بالتَّوبَةِ وَالصَّدَقَةِ وَالخُروجِ مِنَ المَظالِمِ وَمصالَحَةِ الأعداءِ، وَصِيامِ ثلاثةِ أيامٍ ثمَّ يَخرُجَ بِهِم في اليومِ الرابعِ في ثِيابِ بذلَةٍ واستِكانَةٍ وتَضَرُّعٍ.

پاشان دوو وتار دەخوێنێتەوە نوێژی خۆرگیران دەنگی تیابەرز ناکرێتەوە بەڵام نوێژی مانگ گیران بەدەنگی بەرزەوە دەکرێت...[1]

(باس)نوێژە بارانە سوننەتە[2]، ئیمام فرمان بەخەڵکەکە دەکات: تۆبەبکەن و خێراتی زۆر بکەن، دەست لەزوڵم و زۆر هەڵبگرن و لەگەڵ نەیارەکانیاندا ئاشت ببنەوەو سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بن[3] پاشان لەڕۆژی چوارەم دا ئەیان باتە دەرەوە جلێکی شڕ لەبەردەکەن و[4] بەزەلیلی دەپاڕێنەوە[5].

(١) الترمذی (٥٦٢) عن سمرة بن جندب (ﷺ) قال: ((صلی بنا النبی (ﷺ) فی کسوف لانسمع له صوتا))

سمره بن جندب (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: لەنوێژی خۆر گیران دا گوێمان لەدەنگی پێغەمبەر نەبوو

بوخاری (١٠١٦) موسلم (٩٠١) عن عائشة (ﷺ) : ((جهر النبی (ﷺ) فی صلاة الخسوف بقراءته))

عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: لەنوێژی مانگ گیران دا پێغەمبەر (ﷺ) بەدەنگی بەرز قورئانی دەخوێند. ئەوەش لەبەرئەوە کەخۆرگیران لەڕۆژدایەو مانگ گیران لەشەودایە. واتە: وەك نوێژەکانی تر سەیر دەکرێت..

(٢) بوخاری (٩٦٦) موسلم (٨٩٤) عن عبدالله بن زید بن عاصم (ﷺ): ((ان النبی (ﷺ) خرج الی المصلی فاستسقی فاستقبل القبلة وقلب رداءه وصلی رکعتین))

عبدالله بن زەید (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە: ((پێغەمبەر (ﷺ) چووە دەرەوە بۆ نوێژە بارانە ڕوویکردە قیبلەو عەباکەی هەڵگێڕایەوە دووڕکات نوێژی کرد بەدەنگی بەرز)).

(٣) دیارە ئەم کارانە کاریگەری زۆریان هەیە بۆ قبوڵبوونی پاڕانەوە.

(٤) واتە: وەك جلی ئیش کە دەمارگیری و لووت بەرزی تیانەبێت.

(٥) ابن ماجه (١٢٦٦) (عن ابن عباس (ﷺ) قال: ((خرج رسول الله (ﷺ) متواضعا متبذلا متخشعا مترسلا متضرعا فصلی رکعتین کما یصلی فی العید))

ابن عباس (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) لەنوێژە بارانەدا زۆر بەتەوازوعەوە ئەپاڕایەوەو دووڕکاتی وەك جەژنەکان دەکرد.

وَيُصلّي بِهِم رَكعتَينِ كَصَلاةِ العيدَينِ ثُمَّ يخطُبُ بعدَهُما وَيُحَوِّلُ رِداءَهُ وَيُكثِرُ مِن الدعاءِ وَالإستِغفارِ.

وَيَدعو بِدُعاءِ رَسولِ اللهِ صلى الله عليهِ وسَلم وهو: ((اللّهمَّ اجعَلها سُقيا رَحمَةٍ ولا تَجعلها سُقيا عَذابٍ ولامَحقٍ ولابَلاءٍ ولاهَدمٍ ولاغَرَقٍ اللهم علىٰ الظِراب والآكام ومَنابت الشَجَرِ وَبُطونِ الأودِيَةِ

پاشان نوێژەكە دەكەن كەدوو ڕكاتە وەك نوێژى جەژنەكان[1] پاشان ووتاريان بۆ ئەدات و جلەكانى هەڵدەگێڕێتەوە دوعاو استغفارێكى زۆر دەكات.[2]

واباشە ئەم شێوە پاڕانەوەى پێغەمبەر بەكاربهێنێت: خوايە بيكە بەبارانى ڕەحمەت نەك عەزاب و لەناوچوون و بەلاّو ڕوخان و خنكان، خوايە بۆ سەرچياو گردۆلكەو ژێر درەخت و شيوەكان،[3]

(١) واتە: لەيەكەم دا حەوت جارو لەدووەم دا پێنج جار تەكبير (الله اكبر) بكات. ابوداود (١١٦٥) الترمذى (٥٥٨) عن ابن عباس (رضي الله عنه) وقد سئل عن صلاته (ﷺ): ((الاستسقاء فقال: وصلى ركعتين كما يصلى فى العيد)).

له (ابن عباس)يان پرسى دەربارەى شێوەى نوێژە بارانە ئەويش فەرمووى: دووڕكات بوو هەروەك نوێژى جەژن.

(٢) ابن ماجه (١٢٦٨) عن ابى هريرة (رضي الله عنه) قال: ((خرج رسول الله (ﷺ) يوما يستسقى فصلى بنا ركعتين بلا اذان ولا اقامة ثم خطبنا ودعا الله وحول وجهه نحو القبلة رافعا يديه ثم قلب رداءه فجعل الايمن على الايسر والايسر على الايمن)).

ابوهريره (خواى لىٚ ڕازى بێت) دەڵێت: ((جارێكيان پێغەمبەر (ﷺ) ئێمەى برد بۆ نوێژەبارانە دوو ڕكات مان كرد بىٚ ئەوەى بانگو قامەت بدرىٚ پاشان ووتارى بۆداين و ڕووىكردە قيبلەو هەردوو دەستى بەرزكردەوە پاشان عەباكەى هەڵگێڕايەوە لاى ڕاست بۆلاى چەپ و لاى چەپ بۆلاى ڕاست)).

لەباتى تەكبيركردن لەخوتبەى ئەم نوێژەدا استغفار دەكات ئايەتى: ﴿واستغفروا ربكم انه كان غفارا يرسل السماء عليكم مدرارا﴾ (نوح: ١٠ - ١١)

(٣) بوخارى (٩٦٧) موسلم (٨٩٧)

اللهمّ حَوالَينا ولاعلَينا اللّهم اسْقِنا غَيثًا مغيثًا هنيئًا مَريئًا مَريعا سَحّاً عامًا غَدَقًا طَبقًا مُجَلِلاً دائمًا الىٰ يوم الدّينِ اللهُمّ اسْقِنا الغَيثَ ولاتَجعلنا مِنَ القانِطين اللهم إنَّ بِالعِبادِ وَالبِلادِ مِنَ الجَهْدِ والجوعِ والضَنَكِ مالانَشكو إلّا إلَيكَ اللّهم انبِتْ لَنا الزرعَ وأدِرّلَنا الضَرّعَ وانزِل علَينا مِن بَركاتِ السَماءِ وانبِتْ لَنا من بَركاتِ الأرضِ واكشِفْ عَنّا مِنَ البَلاءِ مالايَكْشِفُهُ غَيرُكَ، اللّهمَّ إنّا نَستَغفِرُكَ إنَكَ كُنتَ غَفّارًا فارسِلِ السَماءَ علَينا مِدرارًا)).

وَيغتَسِلُ فى الوادي إذا سالَ،

خوايه ئيقليم گيربىٰ، خوايه بارانێك بێت فريامان بكەوێت، خاوێن بێت، شت مان بۆ پێبگەيەنێت،و بەبەرەكەت بێت، بەخوڕبێت، زۆر بێت، هەموو شوێنێك بگرێتەوە، تێراومان بكات، بەقەدەر پێويستيمان بێت،[1] خوايە تێراومان بكەو ناهومێدمان مەكە، خوايە خەڵكەكە تووشى برسىيەتىو هەژارىو دەست كورتى هاتوون بەشێوەيەك لەتۆ بەولاوە كەس نىيە پەناى بۆ ببەين، خوايە سەوزايىمان بۆ بڕوێنەو گوانى ئاژەڵەكانمان پڕ شيربكە.

خوايە: بەرەكەتى ئاسمان مان بۆ بنێرەو لەبەرەكەتى زەوىمان بۆ بڕوێنە، بەڵاو تەنگانەمان لەسەر لابەرە چونكە لەتۆ زياتر كەس تواناى ئەو كارەى نىيە، خوايە هەر لەتۆ ئەپاڕێينەوە چونكە هەرتۆ دەتوانيت گوناهمان بپۆشى، خوايە بارانێكى بەخوڕو پەيتا پەيتامان بۆ بنێرە))

باش وايە لەكاتى باران بارينو لافاودا خۆى پىٰبشوات بەتايبەتى بارانى سەرە پەڵە[2]

---

(١) ابوداود (١١٦٩)

(٢) موسلم (٨٩٨) ((عن انس (رضي الله عنه) قال: اصابنا ونحن مع رسول الله (ﷺ) مطر قال: فحسر ثوبه حتى اصابه من المطر فقلنا: لم صنعت هذا؟ قال: ((لانه حديث عهد بربه تعالى)) )).

انس (خواى لىٰ ڕازى بێت) دەگێڕێتەوە:لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بووين باران داىكرد ئەويش جلەكانى هەڵماڵىو خۆى بەبارانەكە تەڕكرد لێمان پرسى بۆ وادەكەيت؟ فەرمووى: چونكە ئەمە بارانێكى تازەيەو بەرەكەتو ڕەحمەتى خوايە بۆ ئێمەى دروست كردووە.

وَيُسَبّحُ لِلَّرعدِ وَالبرقِ.

(فَصلٌ) وَصَلاةُ الخوفِ عَلىٰ ثَلاثَةِ اَضرُبٍ:

اَحدُهما: اَن يكونَ العدوُّ في غيرِ القِبلةِ، فَيُفَرِّقَهُم الإمامُ فِرقَتَينِ: فِرقَةٌ تَقِفُ في وَجهِ العَدوّ، وَفِرقَةٌ خَلفَهُ.

فَيُصلّي بِالفِرقَةِ التي خلفَهُ ركعةً ثُمّ تُتِمُّ لِنَفسِها، وتَمضي إلىٰ وَجهِ العَدُوِّ، وَتَاتي الطائفةُ الأُخرىٰ، فيُصَلّي بها ركعةً وَتُتِمُّ لِنفسِها وَيُسَلِّم بها.

و لەکاتی گرمەو بروسکەی هەوردا تەسبیحات بکات.[1]

(باس) نوێژی کاتی مەترسی (الخوف) سێ جۆرە:

یەکەم: دوژمن لەلای قیبلەوە نی یە: لەم حاڵەتەدا ئیمام نوێژکەرەکان دەکات بەدوو بەشەوە: بەشێکیان بەرامبەر دوژمن دەوەستن و بەشەکەی تر دوای ئیمامەوە دەوەستن.

یەك ڕکات بەوانە دەکات کەلەدوایەوە وەستابوون ئینجا ئیمام دەوەستێ ئەوان خۆیان تەواوی دەکەن و دەچن بۆ بەرامبەری دوژمن ئینجا بەشەکەی تر دێن ڕکاتێك لەگەڵ ئیماما دەکەن و خۆیان تەواوی دەکەن. ئیتر ئیمام لەگەڵ ئەوان سەلام ئەداتەوە.[2]

(١) مالك فی (الموطأ) ٢/٩٩٢ (عن عبدالله بن الزبير (ﷺ) انه كان اذا سمع الرعد ترك الحديث وقال: سبحان الذی يسبح الرعد بحمده والملائكة من خيفته. ثم يقول: ان هذا لوعيد لاهل الارض شديد))

عبداللەی کوڕی زوبێر (خوای لێ ڕازی بێت) هەرکە گوێی لەگرمەی هەور ببوایە قسەی دەبڕی و دەی ووت: ﴿سبحان الذی يسبح الرعد بحمده والملائكة من خيفته﴾ (الرعد: ١٣)

پاشان دەی ووت: ئەمە هەڕەشەیە بۆ دانیشتوانی زەوی.

(٢) بوخاری (٣٩٠٠) موسلم (٨٤٢) عن صالح بن خوات عمن شهد رسول الله (ﷺ): ((صلى يوم ذات الرقاع صلاة الخوف ان طائفة صفت معه وطائفة وجاه العدو فصلى بالتی معه ركعة ثم ثبت قائما واتموا لانفسهم ثم انصرفوا فصفوا وجاه العدو وجاءت الطائفة الاخرى فصلى بهم الركعة التی بقيت من صلاته ثم ثبت جالسا واتموا لانفسهم ثم سلم بهم)).

((پێغەمبەر (ﷺ) لەشەڕی (ذات الرقاع)دا نوێژی ترسیکرد، کۆمەڵێك لەگەڵ خۆیدا ڕیزبوون ئەوانیتر بەرامبەر دوژمن وەستان لەگەڵ ئەوانەی یەکەم ڕکاتێکی کرد ئینجا وەستا ئەمان خۆیان تەواویان کردو بەرامبەر دوژمن وەستان ئینجا کۆمەڵەکەی تر هاتن ئەو ڕکاتەی مابوو لەگەڵ ئەوان کردی ئیتر دانیشت تائەوان خۆیان تەواویان کردو لەگەڵ ئەوان سەلامی دایەوە)).

والثَّاني: أن يكونَ في جهةِ القِبلَةِ فَيَصُفُّهُم الإمامُ صَفَّين وَيُحرِمُ بِهِم فَإذا سَجَد سَجَدمَعَه أَحَدُ الصَّفَّين، وَوَقَفَ الصَّفُّ الآخَرُ يَحرُسُهُم فإذا رَفَعَ سَجَدوا وَلَحِقوهُ.

والثالثُ: أن يَكونَ في شِدَّةِ الخَوفِ وَالتِحامِ الحَربِ فَيُصَلّي كَيفَ أَمكَنَه، راجِلًا أو راكباً، مُستَقبِلَ القِبلَةِ وغيرَ مُستقبِلٍ لَها.

دووەم: دوژمن لەلای قیبلە وەبێت: لەم حاڵەتەدا ئەیان كات بەدوو ڕیزو هەموویان نوێژ دادەبەستن كاتێك دەچێتە سوجدە تەنها یەك ڕیزیان لەگەڵیا سوجدە دەبەن، ڕیزەكەی تر بە پێوە دەوەستن دەیان پارێزن كەهەستانەوە ئیتر ئەمانیش سوجدە دەبەن‌و پێی دەگەنەوە.[1]

سێیەم: مەترسی ئێجگار زۆربێت‌و بەیەكا پژابن: لەم حاڵەتەدا چۆنی بوێ بەوشێوە نوێژ دەكات بەپیادەیی، بەسواری ڕووەو قیبلە یان ڕووی لەقیبلە نەبێت.[2]

(١) بوخاری (٩٠٢) عن ابن عباس (رضي الله عنه) قال: ((قام النبی (ﷺ) وقام الناس معه فكبر وكبروا معه وركع ناس منهم ثم سجد وسجدوا ثم قام للثانية فقام الذين سجدوا وحرسوا لاخوانهم واتت الطائفة الاخرى فركعوا وسجدوا معه والناس كلهم في صلاة ولكن يحرس بعضهم بعضا)).

ابن عباس (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: ((هەموان لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) وەستان‌و نوێژیان دابەست لەگەڵ بەشێكیان چووە ركوع‌و سجود بەشەكەی‌تر وەستابوون كەهەستانەوە ئینجا ئەو بەشەی‌تر چوونە سوجدە بەم شێوەیە هەموویان لەنوێژدابوون‌و لەلایەكی‌تریشەوە هەندێكیان پاسەوانی ئەوانی‌تر بوون)).

(٢) ئایەتی: ﴿حافظوا على الصلوات والصلاة الوسطى وقوموا لله قانتين فان خفتم فرجالا او ركبانا فاذا امنتم فاذكروا الله كما علمكم مالم تكونوا تعلمون﴾ (البقرة: ٢٣٨ - ٢٣٩)

بوخاری (٤٢٦١) عن ابن عمر (رضي الله عنه) في وصفه صلاة الخوف: (فان كان خوف هو اشد من ذلك صلوا رجالا قياما على اقدامهم او ركبانا مستقبلي القبلة او غير مستقبليها).

ابن عمر (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: لەباسی نوێژی ترس دا: (لەم كاتەدا بەهەموو شێوەیەك دروستە: بەپیادەیی‌و سواری ڕووەو قیبلە یان ڕووی لەقیبلە نەبێت).

(فَصْلٌ) وَيَحرُمُ علىٰ الرِّجالِ لُبسُ الحَريرِ وَالتَخَتُّمُ بالذَّهَبِ، وَيَحِلُّ لِلنِّساءِ، وَقَليلُ الذَّهَبِ وكَثيرُهُ في التَّحريمِ سَواءٌ. وَإذا كانَ بَعضُ الثَّوبِ إبريسَماً وَبعضُهُ قُطنًا اوكَتانًا جازَ لُبسُهُ مالَم يَكُن الابرَيسَمُ غالبًا.

(فَصلٌ) وَيلزَمُ في المَيّتِ أَربَعةُ أَشياءَ: غُسلُهُ، وَتَكفينُهُ، وَالصَّلاةُ عَلَيهِ، وَدَفنُهُ.

(باس) حەرامە پیاو جلی ئاوریشم لەبەربكات، یان ئەنگوستیلەی ئاڵتون لەپەنجەبكات، بەڵام بۆ ئافرەت حەلاڵە، بۆ حەرامی ئاڵتوون كەم و زۆر فەرقی نییە.[1] ئەگەر بەشێكی جل ئاوریشم بێت و بەشەكیتری لۆكە یان كەتان بێت ئەوە لەبەركردنی دروستە بەمەرجێك بەشە زۆرەكەی ئاوریشم نەبێت.[2]

(باس) ئەگەر یەكێك مرد پێویستە چوارشتی بۆ بكرێت:

بشۆرێت، كفن بكرێت، نوێژی لەسەربكرێت، بخرێتە گۆرەوە.[3]

---

(١) بوخاری (٥١١٠) موسلم (٢٠٦٧) عن حذیفة (ﷺ) قال: سمعت النبی (ﷺ) یقول: ((لاتلبسوا الحریر ولا الدیباج)) ).

((پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ئاوریشم و دیباج لەبەرمەكەن)).

بوخاری (٥٥٢٦) موسلم (٢٠٨٩) عن ابی هریرة (ﷺ) عن النبی (ﷺ): ((انە نهی عن خاتم الذهب)).

((پێغەمبەر (ﷺ) نەهیكردووە لەئەنگوستیلەی ئاڵتون بكرێتە پەنجەوە)).

الترمذی (١٧٢٠) ان رسول الله (ﷺ) قال: ((حرم لباس الحریر والذهب علی ذكور امتی واحل لاناثهم))

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((حەرامە بۆ پیاوانی ئوممەتی من جلی ئاوریشم و ئاڵتون لەپەنجەكردن بەڵام بۆ ژنان حەلاڵن)).

(٢) بوخاری (٥٤٩٠) موسلم (٢٠٦٩) عن عمر (ﷺ): ((ان رسول الله نهی عن لبس الحریر الا هكذا واشار باصبعیه اللتین تلیان الابهام))

عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) نەهیكردووە لەلەبەركردنی ئاوریشم مەگەر ئەوەی كەقەراخی جلەكەی پێجوان بكرێت.

(٣) موسوڵمانان هەموو یەك ڕان لەسەرئەوەی كەئەم چوار شتە واجبن بەفەرزی كیفایە. بەڵگەش (اجماع)ی موسوڵمانانە.

وَاثنـانِ لايُغسَـلانِ وَلايُصَلّـى عَلَيـهما: الشَّـهيدُ فـي مَعرَكَـةِ المُشـرِكينَ، وَالسِّقطُ الذي لَم يَستَهِلَّ صارِخًا وَيُغسَلُ المَيِّتُ وِترًا، وَيكونُ في أَولِ غُسلِهِ سِدرٌ، وفي آخرِهِ شَيءٌ مِن كافورٍ.
وَيُكَفَّنُ في ثَلاثَةِ أثوابٍ بيضٍ، لَيسَ فيها قَميصٌ وَلاعَمامَةٌ.

دووكەس هەن نەئەشۆررێن و نەنوێژیان لەسەر دەكرێت: شەهید كەلە شەڕی كافران دا كوژرابێت [1]، منالێك كەلەبارچووبێت و لەكاتی لەدایكبونیا هیچ دەنگی لێ نەبیسترابێت، [2]

كەرەتـەكانی شـۆردنی مـردوو ئـەبێت تـاك بێـت یەكـەمیان بەئەسـپۆن و دواجاریش كەمێك كافووری تیا بەكار بێت. [3]

مردوو لەسێ پارچە قوماشی سپیدا كفن دەكرێت بێجگە لەكراس و مێزەر. [4]

(١) بوخاری (١٢٧٨) عن جابر (ﷺ) ان النبی (ﷺ): ((امر فی قتلی احـد بدفنـهم فـی دمائهم ولم یغسلوا ولم یصل علیهم))

جابر (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: ((پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانیدا كەكوژراوەكانی شەڕی ئوحود بەخوێنەوە دفن بكرێن و نوێژیشی لەسەر نەكردن)).

(٢) الترمذی (١٠٣٢) عن جـابر (ﷺ) عـن النبـی (ﷺ) قـال: ((الطفـل لایصلـی علیـه ولایرث ولایورث حتی یستهل))

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((منالێك كەلەكاتی بوونیا دەنگـی لێ هەڵنەسێ و بمرێـت نەنوێژی لەسەر ئەكرێ و نەمیرات ئەگرێ و نەمیراتی لێئەگیرێت)).

(ابن ماجة) ١٥٠٨) عن جـابر (ﷺ) قـال: قـال رسـول الله (ﷺ): ((اذا اسـتهل السـقط صلی علیه وورث))

پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمویـەتی: ئەگـەر ئـەو منالـەی دوای لـەدایكبوون دەمرێـت دەنگـی لێهەڵسا ئەوە نوێژی لەسەر ئەكرێ و میراتیشی لێئەگیرێت.

(٣) بوخاری (١٦٥) موسلم (٩٣٩) (عن ام عطیة الانصاریة قالت: دخل علینا رسول الله (ﷺ) ونحن نغسل ابنته فقال: ((اغسلنها ثلاثا او خمسا او اكـثر مـن ذلـك ان رایـتن بمـاء وسدر واجعلن فی الاخرة كافورا او شیئا من كافور وابدأن بیمامینها ومواضع الوضوء منها)) ).

ام عطیة الانصاری(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: كاتێـك ئێمـە كچەكـەی پێغەمبـەرمان دەشۆرد كەوەفاتی كردبوو خۆی هاتە لامان و فەرمووی: سێجار یاپێنج جار یان زیاتر بەئاو ئەسپوون بیشۆن دواجار هەندێك كافوور بەكاربێنن و پێشان لای ڕاستی و شوێنی دەستنوێژ.

كافوور: گوڵی دارخورمایە.

(٤) بوخاری (١٢١٤) موسلم (٩٤١) عن عائشة (ﷺ) قالت: ((كفن رسول الله (ﷺ) فـی ثلاثة اثواب بیض سحولیة لیس فیها قمیص ولا عمامة)).

عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێـت: ((پێغەمبـەر لـەناو سـێ پارچـە قوماشـی سـپی مێخەوشی لەلۆكە دروستكراودا كفن كرا بێجگە لەكراس و مێزەر)).

وَيكَبِّرُ عَلَيهِ أَربعَ تَكبراتٍ، يَقرأُ الفاتِحَةَ بعدَ الاولىٰ، وَيُصَلّي عَلىٰ النَّبيِّ (ﷺ) بَعدَ الثانِيَةِ، وَيَدعو لِلمَيِّتِ بعدَ الثَّالِثَةِ فَيَقولُ: ((اَللّهُمَّ هٰذا عَبدُكَ وَابنُ عَبدِكَ، خَرَجَ مِن روحِ الدُّنيا وَسِعَتِها وَمحبوبُهُ وأَحِبّاؤُهُ فيها، إِلىٰ ظُلمَةِ القَبرِ وما هو لاقيهِ كانَ يَشهَدُ أَن لاإِلٰهَ إِلاّ انتَ وَحدَكَ لاشَريكَ لَكَ وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبدُكَ وَرَسولُكَ وأَنتَ أَعلَمُ بِهِ مِنّا..

بۆ نوێـژی مـردوو دەبێـت چـوار جـار (اللـه اكـبر) بكـات[1] دوای یەكـەمیان سورەتی (فاتحه) بخوێنێت[2] و دوای دووەم درووود بۆ پێغەمبەر بنێرێت [3] و دوای سێیەم دوعا بۆ مردووەكە بكات و بڵێت:

((خوایـە ئـەمــە بـەندەی تۆیـەو لەبـەندەی تۆبـووە، دنیـای پـان و بـەرینی بەجێهێشـت كەخۆشەویسـتەكان تیـانی، بـەرەو تـاریكی گـۆڕو ئـەو شـتانەی كەتووشـی دەبن. بڕوای وابـوو كەلـەتۆ زیـاتر هیـچ خوایـەكی تـر نی‌یـەو تـاكی و بێهاوتای و كە (محمد)یش عەبدو نێرراوی تۆیە. دیارە تۆ لەئێمە باشتر ئاگات لەم بەندەیەت هەیەو لەئێمە زاناتری بەحاڵی.

(١) بوخاری (١١٨٨) موسلم (٩٥١) عن ابـی هریـرة (ﷺ) ان رسـول الله (ﷺ): ((نعـی النجاشی فی الیوم الذی مات فیه خرج الی المصلی فصف بهم وكبر اربعا)).

((پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی مردنی (نجاشـی) دایـێ لـەوڕۆژەدا كـەتیامردبوو لـەدەرەوە خەڵكەكەی ڕیزكردوو نوێژی لەسەركرد چوارجار (الله اكبر)ی كرد)).

(٢) بوخاری (١٢٧٠) عن طلحة بن عبدالله بـن عـوف قـال: ((صلیـت خلـف ابـن عبـاس (ﷺ) علی جنازة فقرأ بفاتحة الكتاب فقال: لیعلموا انها سنة)) (الأم ٢٦٥/٦) ، النسائي (٧٥/٤).

طلحه (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: ((لەدوای (ابن عباس)ەوە نوێژی مردووم كرد پاش (الله اكبر)ی یەكەم (فاتحه)ی خوێندو ووتی: بابزانن كەئەمە سوننەتە)).

(٣) ئیمـامی شـافیعی (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەڵێــت: (ئەسـحابەیەك گێڕاویەتیــەوە: كەلەنوێژی مردوودا سوننەتە كەئیمام دوای تەكبیری یەكەم لەبەرخۆیەوە (فاتحه) بخوێنێـت پاشان درووود بۆ پێغەمبەر (ﷺ) بنێرێت، بۆ مردووەكە بپاڕێتەوەو قورئان نەخوێنێت پاشان لەبەرخۆیەوە سەلام بداتەوە).

عن ابی امامة بن سهل (ﷺ) انه اخبره رجل من اصحاب النبـی (ﷺ): ((ان السـنة فـی الصلاة علی الجنازة ان یكبر الامام ثم یقرا بفاتحه الكتاب بعد التكبرة الاولی سرا فی نفسـه ثـم یصلـی علـی النبی (ﷺ) ویخلص الدعاء للجنازة فی التكبیرات ولایقرا فی شیء منهن ثم یسلم سرا فی نفسه)).

((اللهمَّ إنهُ نَزَلَ بِكَ وأنتَ خيرُ منزولٍ بِه، وأصبحَ فقيراً إلىٰ رحمتِكَ وأنتَ غنيٌّ عَن عذابِه، وقد جئناكَ راغبينَ إليكَ شُفعاءَ لَهُ، اللهمَّ إن كانَ مُحسناً فزِدْ في إحسانِه، وإن كانَ مُسيئاً فتجاوزْ عنهُ، ولقِّهِ برحمتِكَ رضاكَ وقِهِ فتنةَ القبرِ وعذابَهُ وافسَحْ لَه في قبرِهِ وجافِ الأرضَ عَن جنبَيهِ ولقِّهِ برحمتِكَ الأمنَ مِن عذابِكَ حَتىٰ تبعَثَهُ آمِناً إلىٰ جَنّتِكَ برحمَتِكَ ياأرحَمَ الرّاحمينَ))

خوایە ئێستا میوانی تۆیە دیارە تۆش چاکترین خانە خوێی، هەژاری بەردەرگای بەزەییتەو دیارە تۆش پێویستیت بەئازاردانی نییەو ئێمەش ڕوومان کردۆتە بارەگای تۆو شەفاعەتی بۆ دەکەین، خوایە ئەگەر لەچاکەکەرانە ئەوا چاکەکانی بۆ زیادبکەو ئەگەر خراپەکاریشە ئەوا لێی ببورەو لێی ڕازیبەو لەبەڵاو ئازاری گۆڕ بیپارێزەو گۆڕەکەی بۆفراوان بکەو کارێك مەکە زەوی بیگوشێت دڵنیای بکە کەئازاری نادەیت تائەو کاتەی کەزیندووی دەکەیتەوەو دەی نێریت بۆ بەهەشتی بەرینت خوایە! بۆ خاتری ڕەحم و بەزەییت. ئەی ئەوکەسەی کەلەهەموان بەبەزەییتری[1]

(١) ئەم دوعایە ئیمامی شافعی (خوای لێڕازیبێت) لەچەند حەدیسێکەوە وەریگرتووە وەك حەدیسی موسلم (٩٦٣) عن عوف بن مالك قال: ((صلى رسول الله (ﷺ) على جنازة فسمعته يقول: اللهم......))

لە(عوف بن مالك)ەوە (خوای لێڕازی بێت) دەڵێت گوێم لێبوو کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی مردوویەکی دەکرد دەی فەرموو: ((اللهم اغفرله وارحمه وعافه واعف عنه واكرم نزله ووسع مدخله واغسله بماء وثلج وبرد ونقه من الخطايا كما ينقى الثوب الابيض من الدنس وابدله دارا خيرا من داره واهلا خيرا من اهله وزوجا خيرا من زوجه وقه فتنة القبر وعذاب النار)) (عوف) دەڵێت حەزم دەکرد من ئەو مردووە بومایەو ئەو پاڕانەوەیە بۆمن بوایە.

الترمذی (١٠٢٤) ابوداود (٣٢٠١) عن ابی هريرة (ﷺ) قال: (كان رسول الله (ﷺ) اذا صلى على جنازة قال: ((اللهم اغفر لحينا..)) ).

ابوهريرە (خوای لێڕازی بێت) دەڵێت: کەپێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر مردوویەك بکردایە دەی فەرموو ((اللهم اغفر لحينا وميتنا، وشاهدنا وغائبنا، وصغيرنا وكبيرنا، وذكرنا وانثانا، اللهم من احييته منا فاحيه على الاسلام، ومن توفيته منا فتوفه على الايمان))

وَيَقولُ في الرّابِعَةِ: اللهُمّ لاتَحْرِمْنا أَجْرَهُ وَلاتَفْتِنّا بَعْدَهُ، إغفِرلَنا وَلَهُ. وَيُسَلِمُ بَعْدَ الرّابِعَةِ.

وَيُدفَنُ في لَحدٍ مُستَقبِلَ القِبلَةِ، وَيُسَلُّ مِن قِبَلِ رَأسِهِ بِرِفقٍ وَيَقولُ الّذي يلحِدُهُ: بسمِ اللهِ وَعلىٰ مِلّةِ رَسولِ اللهِ (ﷺ) .

دوای تەکبیری چوارەم ئەڵێت خوایە لەپاداشتی ئەو بێبەشمان مەکەو پاش ئەم تووشی فیتنەو ناخۆشیمان مەکە، لەئێمەو لەوخۆش بە[1] ئینجا سەلام ئەداتەوە [2] لەناو گۆڕێکدا ڕووەو قیبلە دفن دەکرێت[3] لەکاتی خستنە ناو گۆڕەکەدا لەلایەن سەریەوە بەهێمنی ڕائەکێشرێت.[4] ئەو کەسەی ئەی خاتە گۆڕەکەوە دەڵێت بەناوی خواو لەسەر ئاینی ئوممەتی محمد (ﷺ) [5]

(١) ابوداود (٣٢٠١)

(٢) البيهقى (٤٣/٤) عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) قال: ((كان النبى (ﷺ) يفعل التسليم على الجنازة مثل التسليم فى الصلاة)).

پێغەمبەر (ﷺ) لەنوێژی مردوودا هەروەك نوێژیتر سەلامی ئەدایەوە.

(٣) موسلم (٩٦٦) عن سعد بن وقاص (ﷺ) انه قال فى مرض موته: ((الحدوالى لحدا وانصبوا علي اللبن نصبا كما صنع برسول الله (ﷺ)))

کاتێك (سعد بن وقاص) (خوای لێڕازیبێت) لەنەخۆشی مردن دابوو ووتی: گۆڕچکەم بۆ هەڵبکەنو بەخشت دام بپۆشن وەکو بۆ پێغەمبەر (ﷺ) کرا. گۆڕچکە: بریتییە لەهەڵکەندنی شوێنێکی تایبەت لەگۆڕەکەدا لەلای قیبلەوە)).

(٤) ابوداود (٣٢١١) ((ان عبدالله بن يزيد الخطمى ادخل الحارث القبر من قبل رجلي القبر وقال: هذا من السنة)

عبدالله بن يزيد (خوای لێڕازیبێت)س مردوویەکی لەلای قاچی گۆڕەکەوە خستە ناوی.

(٥) ابوداود (٣٢١٣) الترمذى (١٠٤٦) ((عن ابن عمر (رضي الله عنه) ان النبى (ﷺ) كان اذا وضع الميت فى القبر قال: ((بسم الله وعلى سنة رسول الله)) )).

ابن عمر (خوای لێڕازیبێت) دەڵێت: هەرکاتێك پێغەمبەر (ﷺ) مردووی بخستایەتە گۆڕەوە دەی فەرموو: ((بسم الله وعلى سنة رسول الله)).

**وَيُضْجَعُ فِي القَبرِ بَعدَ أَن يُعمَّقَ قامةً وَبسْطةً.**
**وَيُسَطَّحُ القَبرُ، وَلايُبنىٰ عَلَيهِ وَلايُجَصَّصُ.**

**ئینجا لەگۆڕەکەدا ڕادەکێشرێت دەبێت ئەو گۆڕە بەقەدەر ئەوەندە قووڵ بکرێت کەبالاّ پیاوێك و ئەوەندەش بێت کەدەستی هەڵبڕێت.[1]**

**سەری گۆڕەکە تەخت دەکرێتەوە، نابێت هیچ جۆرە بینایەکی لەسەر دروست بکرێت و گەچی تیابەکاربێت واتە سپی‌کاری ناکرێت.[2]**

(۱) واتە ئەوەندە بێت کەئەگەر پیاوێکی مام ناوەندی نەزۆر کورت و نەزۆر درێژ تیابوەستێ و دەست بەرزبکاتەوە. ابوداود (۳۲۱٥) الترمذی (۱۷۱۳) ((عن هشام بن عامر (ﷺ) عن رسول الله (ﷺ) قال فی قتلی احد: ((احفروا واوسعوا واحسنوا)) )).

پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی دفن کردنی کوژراوەکانی ئوحوددا فەرمووی: بۆیان هەڵبکەنن و فراوانی بکەن بەجوانی ڕێکی بخەن.

(۲) موسلم (۹٦۹) (ان علی بن ابی طالب (ﷺ) قال لابی الهیاج الاسدی: الا ابعثك علی مابعثنی علیه رسول الله (ﷺ): ((ان لاتدع تمثالا الاطمسته ولاقبرا مشرفا الاسویته)) ).

علی بن ابی طالب (خوای لێڕازیبێت) کاتێك نێرراوێکی نارد بۆ یەکێك لەویلایەتەکان پێی فەرموو: ئەو ئامۆژگاری‌یەت دەکەم کەکاتی خۆی پێغەمبەر (ﷺ) دەی فەرموو: هەرپەیکەرێکت دی تەختی بکەو هەر گۆڕێکی بەرزت بینی لەگەڵ زەویدا یەکسانی بکەوە.

موسلم (۹۷۰) (عن جابر (ﷺ) قال: ((نهی رسول الله (ﷺ) ان یجصص القبر وان یقعد علیه وان یبنی علیه))

جابر (خوای لێڕازیبێت) دەڵێت: ((پێغەمبەر (ﷺ) نەهی کردووە لەوەی کەگۆڕ گەچکاری بکرێت یان بکرێنە شوێنی دانیشتن یان بینای لەسەر دروست بکرێت چ جای مەرمەڕو شتی‌تری تیابەکاربێت. واتە ئەمانە هەمووی حەرامن سەرەڕای ئەوەی کەئەمە پارە بەفیڕۆدانێکی ئاشکرایەو جێی هیچ ناگرێت)).

**وَلاَبأْسَ بالبُكاءِ عَلىٰ المَيّت، مِن غَيرِ نَوحٍ ولاشَقّ جَيْبٍ.**

**گریان لەسەر مردوو خراپ نییە،[1] بەمەرجێك شین و شەپۆرو خۆکوتان و یەخە دادڕینی تیانەبێت،[2]**

(۱) بوخاری (۱۲٤۱) موسلم (۲۳۱۵ ـ ۲۳۱٦) ((انه (ﷺ) بكى على ولده ابراهيم قبل موته لما راه يجود بنفسه وقال: ((ان العين تدمع والقلب يحزن ولانقول الا مايرضي ربنا وانا بفراقك ياابراهيم لمحزونون)) )).

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ئیبراهیمی کوڕی بینی کەلەگیانەلاودا بوو دەستیکردە گریان و فەرمووی: ((چاو فرمێسك دەڕێژێ و دڵ پەژارە دایئەگرێ ئێمە هەرگیز شتێك نالێین کەخوا ناڕازی بکات بەلام ئەی ئیبراهیم بەبەجێهێشتنت تەواو خەمبارین)).

موسلم (۹۷٦) عن ابی هریرة (ﷺ) قال: ((زار النبی (ﷺ) قبر امه فبكى وابكى من حوله))

ابوهریره (خوای لێڕازیبێت) دەڵێت: ((کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) سەردانی گۆڕی دایکی کرد دەستی کردە گریان و خەڵکەکەش هەموو گریان)).

(۲) واتە هەرکردەوەیەك کەئەوە بگەیەنێت کەبەکاری خوا ناڕازییەو نیشانەی سەبرو ئارام و ڕازیبوون بەکاری خوای تیانەبێت وەکو: قوڕپێوان، لەخۆدان ـ قژڕنینەوە...

موسلم (۹۳۵) عن ابی مالك الاشعری (ﷺ) ان النبی (ﷺ) قال: ((النائحة اذا لم تتب قبل موتها تقام يوم القيامة وعليها سربال من قطران ودرع من جرب)).

ئەبومالك الاشعری (خوای لێڕازیبێت) دەڵێت: پێغەمبەر فەرموویەتی: ئەوەی کەبۆ مردوو ئەلاوێنێتەوە، ئەگەر پێش مردنی تۆ بەنەکات لەکاتی زیندووبوونەوەدا بەگەڕی و گولی زیندوو دەکرێتەوە بەشێوەیەك کەئەو گەڕییە هەموو لەشی ئەگرێتەوە.

بوخاری (۱۲۳۲) عن عبدالله بن مسعود (ﷺ) قال: النبی (ﷺ) قال: ((ليس منا من لطم الخدود وشق الجيوب ودعا بدعوى الجاهلية))

عبدالله بن مسعود (خوای لێڕازیبێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر فەرموویەتی: ((هەرکەس لەخۆی بداو یەخەی دابدڕێ و مردووی بلاوێنێتەوەو باسی مردووەکە بکات ئەمە لەڕیزی ئێمە نییەو بەئوممەتی من حساب ناکرێت)).

وَيُعَزّىٰ أَهلُهُ إِلىٰ ثَلاثَةِ أَيّامٍ مِن دَفنِهِ ، وَلايُدفَنُ إِثنانِ فِى قَبرٍ إِلّا لِحاجَةٍ.

پــاش دفــن كردنــی مردووەكــە تاســێ ڕۆژ سەرەخۆشــی لەكــەس وكاری مردووەكە دەكرێت.(١)

بەناچاری نەبێت نابێت دووكەس بخرێنە گۆڕێكەوە(٢)

(١) (ابن ماجه) (١٦٠١) (عن النبی (ﷺ) انه قال: ((مامن مسلم يعزی اخاه بمصيبة الاكساه الله من حلل الكرامة يوم القيامة))

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: هەر موسوڵمانێك دڵخۆشی برا موسوڵمانەكەی بداتەوە ئەوا خوای گەورە لەڕۆژی زیندووبوونەوەدا بەپۆشاكی كەرامەت دایئەپۆشێت.

سەرەخۆشی دوای سێ ڕۆژ كەراهەتی هەیە مەگەر یەكێك لەسەفەرێت ئەوەش لەبەرئەوەیە چونكە نابێت خەمەكەی بۆ تازەبكرێتەوە. باشتروایە سەرەخۆشی دوای دفن كردن بێت تاكەس وكاری مردووەكە خەریكی كفن و دفنی بن مەگەر زۆریان پەرۆش بێت ئەو كاتە پێش دفنیش دروستە.

(٢) بوخاری (١٢٨٠) ((عن جابر بن عبدالله (ﷺ): ان النبی (ﷺ) كان يجمع الرجلين من قتلى احد))

جابر بن عبدالله (خوای لێڕازیبێت) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) كوژراوەكانی ئوحودی دوو دوو دەخستە گۆڕێكەوە.



# كِتابُ الزَّكاةِ

تَجِبُ الزكـاةُ فـي خَمسَـةِ اشياءَ وهِـيَ: المَواشـي، وَالأثمـانُ، والـزّروعُ، وَالثِّمارُ، وَعُروضُ التِّجارَةِ.

فَأمّا المَواشي: فَتَجِبُ الزكاةُ في ثَلاثَةِ أجناسٍ منها: وهِيَ الإبلُ، والبَقَرُ وَالغَنَمُ.

وَشَرائطُ وُجوبِها سِتَّةُ أشياءَ: الإسلامُ، والحُرِّيةُ، وَالملكُ التّامُ وَالنِّصابُ،

## باسی زەكات

زەكات دان لەپێنج شت دا واجيبە ئەوانەش: مەڕو مالاَت، پارەی نەختينە، بەرهەمی كشتوكالْ، ميوە، مالّی بازرگانی. زەكاتی مەڕومالاَت: لەسێ جۆر مالاَت دا زەكات واجبە: حوشتر، گاومانگا، مەڕو بزن.[1]

بەم شەش مەرجە زەكات لەمالاَت دا واجب دەبێت ئيسلام، حوريەت، بەتەواوەتي خاوەني بێت، بگاتە حەددی نيساب،[2]

(١) ئايەتی: ﴿خذ من اموالهم صدقة تطهرهم وتزكيهم بـهـا﴾ (التوبه: ١٠٣)

واتە: زەكاتی ماڵەكەيان لێوەربگـرە تابـەو هۆيـەوە ژيانيـان بـاش بێـتو لـە ڕەوشـتی بەدی ڕژدی بەدووربن.

بوخاری (١٣٣١) موسليم (١٩) ((قوله (ﷺ) لمعاذ (رضي الله عنه) عندما وجهه الى اليمن: ((فاعلمهم ان الله افترض عليهم صدقة تؤخذ من اغنيائهم وترد على فقرائهم))

پێغەمبەر (ﷺ) كاتێك (مەعازی) نارد بۆ يەمەن پـێی فـەرموو: پـێيان ڕابگەيەنـە كـەخوای مـەزن زەكـاتی لەسـەر فـەرزكردوون كەلەدەوڵەمەندەكان وەردەگـيرێتو بەسـەر هەژارەكان دابەش دەكرێتەوە.

بوخاری (١٣٨٦) ((عن انس بن مالك (رضي الله عنه): ان ابابكر (رضي الله عنه) كتب له كتابا وبعثه به الى البحرين وفي اوله: بسم الله الرحمن الرحيم هذه فريضة الصدقة التى فرضها رسول الله (ﷺ) على المسلمين فمن سالها من المسلمين على وجهها فليعطها ومن سال فوقها فلا يعط)).

انس ابن مالك (خوای لێڕازیبێت) ئەبوبەكر (خـوای لێڕازیبێـت) نـاردی بـو (البحرين) نامەيەكی بۆ نووسی كەلەسەرەتادا نووسيبووی: ((فەرزی زەكـات پێغەمبـەر (ﷺ) ديـاری كـردووە هـەر كەسێك بەوشێوە داوای كرد ئەی درێتێ بەلاَم لەوە زياتر داوابكاتئەوا نای درێتێ)).

(٢) واتـە: ئـەوەندە بێت كـەزەكاتی تيـاواجب ببێـت كەلەمـەودوا ئـەو ميقـدارە بـۆ هەريەكێكيان باس ئەكەين بەبەڵگەوە.

وَالحَولُ، وَالسَومُ.
وَأَمّا الأَثمانُ فَشيئانِ: الذَّهَبُ وَالفِضَّةُ.
وَشَرائِطُ وُجوبِ الزكاةِ فيها خَمسَةُ أَشياءَ: الإِسلامُ وَالحُرِّيَّةُ، وَالمِلكُ التّامُ وَالنِّصابُ، وَالحَولُ.

ساڵێكی تەواو بەسەریدا تێپەڕبكات،[1] بەدەمی خۆی بلەوەڕێت[2]

نەختینە دووشتن: ئاڵتوون، زیـو[3]. مەرجەكانی واجب بوون لـەمان دا پێنـج شتن: ئیسلام . حوریـەت، موڵكایـەتی تـەواو، بگاتـە حـەددی دیاریكراو (النصـاب) ساڵێك تێپەڕبكات.

(١) ابوداود (١٥٧٣) ((لیس فی مال زكاة حتی یحول علیه الحول))

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((پێش تێپەڕبونی ساڵێك بەسەر ماڵەكەدا زەكات واجـب نابێت مەبەست ساڵی (قەمەری)یە واتە ئەوەی كەبەمانگی (محرم) دەست پێدەكات)).

(٢) واتـە: لـە لەوەڕگایـەكی حـەلاڵ دا هـەموو مـاوەی سـاڵەكەیان بەشـی زۆری وەك لەنامەكەی ئەبوبەكردا ئاماژەی بۆكراوە: زەكاتی ماڵات لەوەدایە خۆی بلەوەڕێت.

(٣) ئایەتی: ﴿والذین یكنزون الذهب والفضة ولاینفقونـــها فی سبیل الله فبشــرهم بعذاب الیم﴾ (التوبة: ٣٤).

بوخاری (١٣٣٩) عن ابن عمر (رضی الله عنه): (من كنزها فلم یؤد زكاتها فویل له).

(هاوار بۆ ئەوەی كەپارە خڕ دەكاتەوەو زەكات نادات).

موسلیم (٩٨٧) عن ابی هریرة (رضی الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): ((مامن صاحب ذهـب ولا فضة لایؤدی حقها الا اذا كان یوم القیامة صفحت له صفائح مـن نـار فـاحمی علیـها فی نار جهنم فتكوي بـها جنبـه وظـهره كلمـا بـردت اعیـدت لـه فـی یـوم كـان مقـداره خمسین الف سنة حتی یقضی بین العباد فیری سبیلها اما الی الجنة واما الی النار)).

ئەبوهورەیرە (خو لێیڕازیبێت) لەپێغەمبەرەوە (ﷺ): ((هەر خاوەنی ئاڵتوون و زیوێـك زەكاتی لێنەدات ئەوا لەوە دنیادا بۆی دەكرێنە پارچە ئاگرو كەلەكەو پشتی پێداخ دەكرێت هەركە سارد بۆوە گەرم دەكرێتـەوە لـەڕۆژێكدا كەبەقـەدەر پـەنجا هـەزار سـاڵە دوای ئـەوە حیسابیان لەگەڵ دەكرێ یان بۆ بەهەشت یان دۆزەخ))..

وَأَمَّا الزَرعُ فَتَجِبُ الزَكَاةُ فِيهَا بِثَلَاثَةِ شَرَائِطَ: أَن يَكُونَ مِمَّا يَزرَعُهُ الآدَمِيُّونَ، وَأَن يَكُونَ قُوتاً مُدَّخَراً، وَأَن يَكُونَ نِصَاباً، وهُوَ: خَمسَةُ أَوسُقٍ لا قِشرَ عَلَيهَا.

وَأَمَا الثِمَارُ: فَتَجِبُ الزكَاةُ فِي شَيئَينِ مِنهَا: ثَمَرَةُ النَخلِ، وَثَمَرَةُ الكَرمِ.

وَشَرَائِطُ وجوبِ الزكَاةِ فِيهَا أَربعةُ أَشيَاءَ: الإِسلامُ والحُريةُ، والمِلكُ التَّامُ، وَالنِصَابُ.

وَأَمَا عُرُوضُ التِجَارَةِ: فَتَجِبُ الزَكَاةُ فِيهَا بِالشَرَائِطِ المَذكُورَةِ فِي الأَثمَانِ.

---

بەرهەمی كشتوكاڵ ((دانەوێڵە)) بەسێ مەرج زەكاتی تیاواجب دەبێت: لەوانە بێت كەمرۆڤ دەیچێنن، خواردن و بژێوی زوربەی خەڵك بێت و بتوانرێت هەڵبگیرێت و خراپ نەبێت تاماوەیەكی زۆر [1]، بگاتە حەددی دیاریكراو (نصاب) كەئەویش پێنج ویسقە بێ توێكڵەكەی.[2]

لەمیوەدا تەنها زەكات لەدووان یان دا هەیە: بەری دارخورما، بەری داری ترێ

مەرجەكانی واجب بوونی زەكات لەمانەدا چوارشتە: ئیسلام . حورییەت، موڵكداری تەواو، بگاتە حەددی دیاریكراو.

ماڵی بازرگانی: زەكاتی تیاواجبە بەومەرجانەی كەلەنەختینەدا باس كرا.[3]

---

(١) واتە بەهەڵگرتنی بۆماوەیەك هیچی بەسەرنەیەت و تێك نەچێت. مەبەست لـەبژێوی خەڵك: ئەوەیە كەخواردنی زوربەی خەڵك بێت وەك گەنم، جۆ، نۆك...

(٢) ابوداود (١٦٠٣) الترمذی (٦٤٤) عن عتاب بن اسید (ﷺ) قال: ((امر رسول الله (ﷺ) ان یخرص العنب كما یخرص النخل وتؤخذ زكاته زبیبا كما تؤخذ زكاة النخل تمرا))

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دەكرد: ((كەترێ وەك خورما تەخمین بكرێت ئینجا زەكاتی ترێ بەمێوژو زەكاتی خورمای فەریك بەخورما بدرێت. مەبەست لەتەخمین ئەوەیە داخوا چەند ترێ ئەبێتە مێوژ واتە حەدێكی دیاریكراو)).

(٣) ئایەتی ﴿انفقوا من طیبات ماكسبتم﴾ (البقرة: ٢٦٧)

(مجاهید) دەڵێت: مەبەست ماڵی بازرگانییە (نسفی) لەتەفسیرەكەیدا دەڵێت: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كەماڵی بازرگانی زەكاتی تیا واجبە.

ابوداود (١٥٦٢) عن سمرة بن جندب (ﷺ) قال: ((اما بعد فان رسول الله (ﷺ) كان یامرنا ان نخرج الصدقة من الذی نعد للبیع))

(سمره بن جندب) دەڵێت: ((پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێدەكردین كەزەكات لەوشتانە دەربكەین كەبۆ فرۆشتن مان دائەنا.

(فَصلٌ) وَاَولُ نِصابِ الإبلِ خَمسٌ وفيها شاةٌ، وفي عشرٍ شاتانِ، وفي خَمسةَ عشَرَ ثَلاثُ شِياهٍ، وفي عشرينَ اربعُ شِياه، وَفي خَمسٍ وَعشرينَ بنتُ مَخاضٍ، وفي سِتٍّ وثلاثينَ بنتُ لبونٍ، وفي سِتٍّ واربعينَ حِقّةٌ، وفي إحدىٰ وَستينَ جِذعَةٌ، وفي سِتٍ وسَبعينَ بنتا لَبونٍ، وفي احدىٰ وتِسعينَ حِقّتانِ، وفي مِئَة وإحدىٰ وَعشرينَ ثلاثُ بَناتِ لَبونٍ. ثمّ في كلِ اَربعينَ بنتُ لبونٍ وفي كُلِّ خمسينَ حِقّةٌ.

(فَصلٌ) وَاولُ نصابِ البَقَرِ ثلاثونَ، وفيها تَبيعٌ، وفي اَربعينَ مُسِنّةٌ، وعلىٰ هٰذا اَبدًا فَقِسْ.

(باس) حوشترکەبوون بەپێنج زەکاتی تیاواجب دەبێتو زەکاتەکەی بریتی‌یە لەیەك کاوڕ. کەبوون بەدە، دوو کاوڕ، لەپانزەدا سێ‌کاوڕ، لەبیست دا چوار کاوڕ، کەگەیشتنە بیستوپێنج ئەبێت وشترە مێیەکی یەك ساڵە بدرێت، لەسی و شەش دا مێیەکی دووساڵە لەچل و شەش دا دوومێی دووساڵە لەنەوەدویەك دا دوومێی سێ‌ساڵەو لەسەدو بیستویەك دا سێ‌مێی دووساڵە لەمەزیاتر هەر چل حوشتر مێیەکی دووساڵە بدات یان هەر پەنجا حوشتر مێیەکی سێ‌ساڵە بدات.[1]

(باس) نیسابی گاو مانگا سی سەرە کەبوو بەسی ئەبێت گوێرەکەیەکی یەك ساڵە بدرێت کەبوون بەچل سەر ئەبێت گوێرەکەیەکی دووساڵە بدرێت، دوای ئەوە بەم شێوەیە حیساب دەکرێت یان سی سی یان چل چل.[2]

(١) نامەکەی ئیمامی ئەبوبەکر (خوای لێ‌ڕازی‌بێت) کەبۆ (انس بن مالك)ی (خوای لێ‌ڕازی‌بێت) نووسی کەبەدرێژی هەموو نیسابەکانی زەکاتی تیاڕوون کردبۆوە کەبوخاری (١٣٨٦) بەتەفسیل حەدیسەکەی نقلّ کردووە.

(٢) الترمذي (٦٢٣) ابوداود (١٥٧٦) عن معاذ بن جبل (ﷺ) قال: ((بعثني النبي (ﷺ) الى اليمن فامرني ان اخذ من كل ثلاثين بقرة تبيعا او تبيعة ومن كل اربعين مسنة ومن كل حالم دينارا او عدله معافر))

معاز بن جبل (خوای لێ‌ڕازی‌بێت) دەڵێت: ((کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ناردمی بۆیەمەن فەرمانی پێ‌دام کە: لەهەرسی سەرێك گوێرەکەیەکی یەك ساڵەو لەهەر چل سەر دووساڵەیەك وەریگرم لەهەموو بالقێك دینارێك یان بەقەدەر ئەوە جل وەریگرم)).

(فَصلٌ) وَأولُ نِصابِ الغَنَمِ اربعونَ، وفيها شاةٌ جَذَعَةٌ مِن الضَّانِ أو ثَنِيَّةٌ من المَعزِ، وفي مِاةٍ واحدىٍ وعشرينَ شاتانِ، وفي مِاتينِ وَواحِدَةٍ ثلاثُ شياهٍ، وَفي أربعمِاةٍ اربعُ شياهٍ، ثمَّ في كلِّ ماةٍ شاةٌ.

(فصل) والخَليطانِ يُزكيانِ زكاةَ الواحِدِ بسَبعِ شَرائطَ: إذا كانَ المَراحُ واحِدًا، والمَسرحُ واحِدًا، والمَرعىٰ واحدًا، والفَحلُ واحِدًا، والمَشرَبُ واحِدًا، وَالحالِبُ واحِدًا، ومَوضِعُ الحَلبِ واحِدًا.

(فصلٌ) ونِصابُ الذَّهَبِ عشرونَ مِثقالاً، وفيهِ رُبعُ العُشرِ وهو نِصفُ مثقالٍ، وفيما زادَ بحِسابهِ.

---

(باس) مەڕو بزن تانەبنە چل زەكاتيان نىيە لەچل سەردا كاوڕێكى يەك ساڵە يان بزنێكى دووساڵە ئەدرێت، لەسەدو بيستويەك سەردا دووكاوڕ لەدووسەدو يەك سەردا سىٛكاوڕ لەچوار سەددا چوار كاوڕ پاشان هەر سەد سەر يەك كاوڕ دەدرێت.[1]

(باس) ئەگەر دووكەس بەشەراكەت ماڵاتيان هەبوو ئەوا وەك ئەوەى كەهىيەك كەس بىٛ زەكاتى ئەدرێت بەم مەرجانەى خوارەوە:[2]

يەك گەوڕيان هەبێت، لەيەك شوێن كۆبكرێنەوە، يەك لەوەڕگايان هەبێت، يەك نێرىيان هەبێت، لەيەك شوێن ئاو بخۆنەوە، يەك كەس بيان دۆشێت شوێنى دۆشينيان يەك بێت.

(باس) نيسابى ئاڵتون بيست ميسقاڵە زەكاتەكەى چل يەكە واتە نێو ميسقاڵ، لەوەزياتريش هەر بەو پىٛيە حيساب دەكرێت.[3]

---

(١) نامەكەى ئيمامى ئەبوبەكر (خواى لێڕازىبێت) كەتيا هاتبوو: زەكاتى مەڕ ئەگەر بەدەمى خۆى ئەلەوەڕا لەچل سەرەوە تاسەدوبيست سەر يەك كاوڕ دەدرێت لەوە زياتر هەر سەد سەريەك كاوڕ دەدرێت. لەچل سەر كەمتر زەكاتى نىيە مەگەر خاوەنەكەى خۆى ئارەزوو بكات.

(٢) نامەكەى ئەبوبەكر (خواى لێڕازىبێت) دەڵێت: ماڵاتى دوو كەسى جيا، ناكرێنە يەك بۆ ئەوەى زەكاتى لێبكەوێت، هەروەها ماڵاتى دوو هابەش جياناكرێتەوە تا زەكات نەدەن.

(٣) ابوداود (١٥٧٣) عن على (ﷺ) عن النبى (ﷺ) قال: ((وليس عليك شىء - يعنى فى الذهب - حتى يكون لك عشرون دينارا فاذا كان لك عشرون دينارا وحال عليها الحول ففيها نصف دينار فمازاد فبحساب ذلك)).

عەلى (خواى لێڕازىبێت) دەغەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتى: ئاڵتون تانەبێتە بيست ميسقاڵ زەكاتى نىيە كەبوو بەبيستو ساڵى بەسەردا هاتەوە ئەوا نيو ميسقاڵ ئەدرێت بەزەكات. لەوەش زياتر هەربەو پىٛيە حساب دەكرێت.

ميسقاڵ بريتىيە لەنيو ليرەى ئينگليزى.

وَنِصابُ الوَرَقِ مِأَتا دِرهَمٍ وفيهِ رُبعُ العُشرِ وهو خَمسةُ دَراهِمَ وفيما زادَ بِحسابِهِ، ولاتَجِبُ في الحُلِيِّ المُباحِ زَكاةٌ.

(فصلٌ) ونِصابُ الزُروعِ والثِمارِ خَمسةُ أَوسُقٍ، وهيَ أَلفٌ وَسِتُّمِأَةِ رِطلٍ بِالعِراقيِّ، وَفيما زادَ بِحسابِهِ، وفيها إِن سُقِيَتْ بِماءِ السَماءِ أو السَيحِ العُشرُ وإِن سُقِيَتْ بِدولابٍ أَونَضْحٍ نِصفُ العُشرِ.

---

نیسابی زیویش دووسەد درەمە[1]، چل یەکی دەدرێت واتە پێنج درەم لەوە زیاتر بەوپێیە حساب دەکرێت. خشڵی حەڵاڵ زەکاتی نییە.[2]

(باس) نیسابی بەرهەمی کشتوکاڵو میوە پێنج ویسقە[3]

کە دەکاتە هەزارو شەش سەدرەتڵی عێراقی، لەوە زیاد بەو پێیە حیساب دەکرێت. جائەگەر بەئاوی باران یان ڕووبارو سەرچاوە ئاودرابوو ئەوا ئەبێت دەیەکی بدرێت[4]، خۆ ئەگەر بەدۆڵاب یان هەڵێنجانەوە ئاودرابوو ئەوا نیوەی دەیەك دەدرێت.

---

(١) بوخاری (١٤١٣) موسلم (٩٨٠) ((لیس فیما دون خمس اواق من الورق صدقة))

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((کەمتر لە (٢٠٠) دووسەد درەم زیو زەکاتی نییە)).

(٢) البیهقی (١٣٨/٤) عن جابر (ﷺ) قال: رسول الله (ﷺ): لازکاة فی الحلی))

جابر (خوای لێڕازیبێت) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((خشڵ زەکاتی نییە)) وەك ئەنگوستیلەی زیو بۆ پیاو یان بازنو شتیتر بۆ ئافرەتان.

(٣) بوخاری (١٣٤٠) موسلم (٩٧٩) ((لیس فیما دون خمسة اوسق صدقه))

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((کەمتر لەپێنج ویسق زەکاتی تیانییە)). ویسق بەکێشان بریتییە لە(٧١٥) کیلۆگرام.

(٤) بوخاری (١٤١٢) عن ابن عمر (ﷺ) عن النبی (ﷺ) قال: ((فیما سقت السماء والعیون او کان عشریا العشر وما سقی بالنضح نصف العشر))

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەوەی بەهۆی بارانو سەرچاوەوە ئاودرابێت دەیەکی ئەدرێت بەزەکات بەڵام ئەگەر بەئامێری ئاو هەڵێنجانەوە ئاو درابێت نیوەی دە یەکە)).

زەکاتی میوە بەوشك کراوی دەدرێت واتە ترێ بەمێوژیو فەریکە خورما بەخورمایی.

زەکاتی دانەوێڵەش دوای دروێنەکردن.

ئایەتی: ﴿وآتوا حقه یوم حصاده﴾ (الانعام: ١٤١)

(فصل) وتقوم عروض التجارة عند آخر الحول بما اشتريت به ويخرج من ذلك ربع العشر.
وما استخرج من معادن الذهب والفضة يخرج منه ربع العشر في الحال، ومايوجد من الركاز ففيه الخمس.
(فصل) وتجب زكاة الفطر بثلاثة أشياء: الإسلام، وبغروب الشمس من آخر يوم من شهر رمضان، ووجود الفضل عن قوته وقوت عياله في ذلك اليوم، ويزكي عن نفسه وعمن تلزمه نفقته من المسلمين صاعاً من قوت بلده،

(باس) ماڵی بازرگانی كەساڵی بەسەردا تێپەڕی دەكرێتەوە بەو پارەیەی كەپێی كڕابوو[1] وەزەكاتەكەی چواریەكی دەیەكە (چل یەك).
ئەو ئاڵتون و زیوەی كەلەزەوی دەردەهێنرێت دەبێت دەست بەجێ چل یەكی بدرێت بەزەكات، بەڵام ئەگەر ئاڵتون و زیوی دۆزییەوە كەلەكۆنەوە لەژێر زەویدا شاردرابۆوە ئەوە ئەبێت پێنج یەكی بدات.[2]
(باس) سەرفیترە بەم سێشتە واجب دەبێت: ئیسلامەتی، ئاوابوونی خۆری دواڕۆژی مانگی ڕەمەزان، ئەوەندەی هەبێت كەلەبژێوی خۆی و خێزانەكەی زیادبێ لەو ڕۆژەدا، زەكاتی خۆی و ئەوانەی كەنەفەقەیان لەسەریەتی ئەدات، ئەویش یەك ڕبەیە لەبژێوی زۆربەی خەڵكەكە،[3]

(1) واتە بەپارە ئەگەر بەئاڵتون كڕابوو ئەوا دەكرێتەوە بەئاڵتون ئەگەر بەزیو كڕابوو دەكرێتەوە بەزیو.
تێبینی: بەڕواڵەت ئەبێت ئەو پارەیەی ئێستا موعامەلەی پێدەكرێت زەكاتی تیانەبێت بەڵام زۆر لەزانایان پێیان وایە كەهیچ جیاوازییەكی نییە لەگەڵ ئاڵتوون و زیودا بۆ ئاگاداری لەم مەسەلەیە بڕوانە كتێبی (شەریعەتی ئیسلامی) مامۆستای مدرس بەرگی یەكەم لاپەڕە: (215).
(2) بوخاری (1428) موسلم (1710) (ابوهريرة) (خوای لێڕازیبێت) دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((وفی الركاز الخمس)).
(3) بوخاری (1433) موسلم (984) (ابن عمر) (خوای لێڕازیبێت) ((ان رسول الله (ﷺ) فرض زكاة الفطر من رمضان على الناس صاعاً من تمر او صاعا من شعير على كل حر أو عبد ذكر أو أنثى من المسلمين)).
بوخاری (1432) ((وأمربها ان تؤدی قبل خروج الناس الى الصلاة.))
بوخاری (1439) (ابو سعيد الخدری) (خوای لێڕازیبێت) دەڵێت: (كنا نخرج فی عهد رسول الله (ﷺ) يوم الفطر صاعا من الطعام، وكان طعامنا الشعير والزبيب والاقط والتمر).

وَقَدرُهُ خَمسَةُ أَرطالٍ وَثُلثٍ بِالعِراقِيِّ.

(فَصلٌ) وَتُدفَعُ الزَّكاةُ إِلىٰ الأَصنافِ الثَّمانِيَةِ الَّذينَ ذَكَرَهُمُ اللهُ تَعالىٰ في كِتابِهِ العَزيزِ في قَولِهِ تَعالىٰ: ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلفُقَرَاءِ وَالمَسَاكِينِ وَالعامِلِينَ عَلَيهَا وَالمُؤَلَّفَةِ قُلوبُهُم وَفِي الرِّقَابِ وَالغارِمينَ وَفِي سَبيلِ اللهِ وَابنِ السَّبيلِ﴾ وَإِلىٰ مَنْ يُوجَدُ مِنهُم، وَلاَ يَقتَصِرُ عَلىٰ أَقَلَّ مِن ثَلاثَةٍ مِن كُلِّ صِنفٍ إِلاَّ العامِلَ.

كەدەكاتە پێنج ڕەتڵو سێیەكی ڕەتڵێكی عێراقی.[1]

(باس) زەكات دەدرێت بەو هەشت تاقمەی كەخوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا ناوی هێناون [2] كەبریتین لە: فەقیر، مسكین، زەكات كۆكەرەوە، تازە موسڵمان بوو، بەندەی نامەپێدراو ، قەرزدار، سنوور پارێزانی وڵات، ڕێبوار. چەند لەمانە حازربن زەكاتیان دەدرێتێ. لەهەر تاقمێك بەلایەنی كەمەوە ئەبێ بەشی سێكەس بدرێت. بەڵام بۆ زەكات كۆكەرەوە بەیەك كەسیش دروستە.

(١) بەكێشانی ئێستا دەكاتە (٢٤٠٠) گرام.

(٢) (التوبة:٦٠) بۆ زیاتر ڕوون كردنەوەی ئەم تاقمانە دەڵێین:

١ ـ فەقیر: لات: ئەوكەسەیە كەهیچی وای نییە پێی بژیت وەك ئەوەی كەپێویستی بە(١٠) دینار هەبێت بەڵام تەنها دوو دیناری دەست بكەوێت یان هیچی دەست نەكەوێت.

٢ ـ مسكین: گەدا: بەوكەسە دەڵێن كەدەستكەوتەكەی بەشی نەكات بۆ نموونە دە دیناری بوێت بەڵام هەشت دیناری دەست بكەوێت.

٣ ـ العاملین: بەوانە دەڵێن كەئەركی زەكات كۆكردنەوەو دابەشكردنیان لەئەستۆدایە.

٤ ـ المؤلفة قلوبهم: ئەو كەسەیە كەتازە ئیسلام دەبێتو دڵی تەواو جێگیر نییە.

٥ ـ وفي الرقاب: كۆیلەی نامەپێدراو ((ئێستا ئەمە نەماوە)).

٦ ـ الغارمین: قەرزدارنو پارەیان نییە قەرزەكە بدەنەوە.

٧ ـ في سبیل الله: سنور پارێزانی وڵات كەمووچەی تایبەتییان نەبێت.

٨ ـ ابن السبیل: سەفەری، كەبیەوێت بگەڕێتەوە بۆ شوێنی خۆی، بەڵام پارەی پێنەماوە.

وَخَمسَةٌ لايَجوزُ دفعُها إليهم: الغَنِيُّ بِمالٍ أوكَسبٍ، وَالعَبدُ، وَبنوهاشِمٍ وَبنو المُطَّلِبِ، وَالكافِرُ، وَمَن تلزَمُ المُزَكِّيَ نَفقَتُهُ لايدفعُها إليهم باسْمِ الفُقَراءِ وَالمَساكينِ.

پێنج تاقم هەن زەكاتیان نادرێتێ: دەوڵەمەند چ پارەی هەبێت یان توانای كاسپی هەبێت[1]، كۆیلە، بنەماڵەی هاشمو بنەماڵەی (المطلب)[2]، كافر[3]، ئەو كەسەی كەنەفەقەی لەسەر زەكات دەرەكەیە، نابێت بەناوی فەقیرو مسكێنەوە بیداتێ[4].

(١) الترمذی (٦٥٢) ابوداود (١٦٣٤) ((لاتحل الصدقة لغنی ولالذی مرة سوی)).

(٢) موسلم (١٠٧٢) ((ان هذه الصدقات انما هی أوساخ الناس، وانها لاتحل لمحمد ولا لآل محمد))

بوخاری (١٤٢٠) موسلم (١٠٦٩) (أخذ الحسن بن علی تمرة من تمر الصدقة فجعلها فی فیه فقال النبي (ﷺ): ((كخ كخ ـ لیطرحها ـ ثم قال: أما شعرت أنا لانأكل الصدقة؟))

ئەمانە لەبری زەكات لەتالآنی (خمس الخمس) یان دەدرێتێ.

(٣) حەدیسی ((فأعلمهم ان علیهم صدقه تؤخذ من اغنیائهم فترد علی فقرائهم)) واتە: دەوڵەمەندو فەقیری موسوڵمان. كافر نەزەكاتی لێوەردەگیرێ نەزەكاتی دەدرێتێ.

(٤) واتە ئەگەر فەقیرو مسكین بوون نابێت زەكاتیان بداتێ چونكە نەفەقەیان لەسەریەتی ئەبێ نەفەقەیان بداتێ بەلآم ئەگەر سیفەتی تاقمەكانی تریان تیابوو ئەوا دەتوانێت بەوناوەوە بیان داتێ وەك ئەوەی قەرزدارین.

# كتابُ الصِّيام

وشَرائِطُ وُجوبِ الصِّيامِ ثلاثةُ أشياءَ: الإسلامُ والبلوغُ والعَقلُ، والقُدرَةُ علىٰ الصَّومِ.

وفرائِضُ الصَّومِ أربعةُ اشياءَ: النِّيَّةُ، والإمساكُ عَنِ الأكلِ والشُّربِ والجماعِ وتَعَمُّدِ القَيْءِ.

## باسی ڕۆژوو

مەرجی واجب بوونی ڕۆژوو [1] سێشتە: ئیسلامەتی، باڵقی و ئەقل[2]، توانای بەڕۆژووبوون[3].

فەرزەکانی ڕۆژوو چوارشتن: نیەت هێنان[4]، دوورکەوتنەوە لەخواردن و خواردنەوەو کاری شەرعی[5] و بەئەنقەست خۆرشاندنەوە[6].

(١) ئایەتی ﴿يأيها الذين آمنوا كتب عليكم الصيام كما كتب على الذين من قبلكم لعلكم تتقون﴾ (البقرة :١٨٣) ئایەتی: ﴿شهررمضان الذى انزل فيه القرآن هدى للناس وبينات من الهدى والفرقان فمن شهد منكم الشهر فليصمه﴾(البقرة: ١٨٥)

بوخاری (١٧٩٢) موسلم (١١) قوله (ﷺ) للاعرابى الذى سأله: أخبرنى ماذا فرض على الله من الصوم؟ فقال: ((صيام رمضان)).

(٢) حەدیسی ((رفع القلم عن ثلاثة..))

(٣) ئایەتی: ﴿وعلى الذين يطيقونه فدية﴾(البقرة: ١٨٤)

بوخاری (٤٢٣٥) (عطاء) گوێی لە ئبن عباس بووە کەبەم شێوەیە خوێندویەتیەوە: ﴿وعلى الذين يطوّقونه﴾ وتویە: مەبەست پیاوو ژنی پیرە ناتوانن بەڕۆژوو بن.

(٤) واتە بۆ هەموو ڕۆژێك پێش ڕۆژ بوونەوە.

البيهقى (٢٠٢/٤) الدارقطنى (١٧٢/٢) ((من لم يبيت الصيام قبل الفجر فلا صيام له))

(٥) ئایەتی ﴿وكلوا واشربوا حتى يتبين لكم الخيط الابيض من الخيط الاسود من الفجر ثم اتموا الصيام الى الليل ولاتباشروهن وانتم عاكفون فى المساجد﴾(البقرة: ١٨٧)

(٦) ابوداود (٢٣٨٠) الترمذى (٧٢٠) ((من ذرعه قيئ وهو صائم فليس عليه قضاء وان استقاء فليقض))

وَالَّذي يُفطِرُ بِهِ الصّائِمُ عَشَرَةُ أَشياءَ: ماوَصَلَ عَمداً إِلىٰ الجَوفِ وَالرّاسِ، وَالحُقنَةُ في أَحدِ السَّبيلَين، وَالقَيئُ عَمداً، وَالوَطءُ عَمداً في الفَرجِ، وَالإِنزالُ عَن مُباشَرَةٍ، والحَيضُ، وَالنِفاسُ، وَالجُنونُ، وَالرِّدَّةُ. وَيُستَحَبُّ في الصَّومِ ثلاثَةَ أَشياءَ: تَعجيلُ الفِطرِ، وَتاخيرُ السُّحورِ، وتَركُ الهُجرِ مِنَ الكَلامِ.

وَيَحرُمُ صِيامُ خَمسَةِ أَيام: العيدان،

---

ئەوانەی ئەبنە هۆی بەتاڵبوونەوەی ڕۆژوو دەشتن: هەر شتێك بەئەنقەست بگاتە بۆشایی لەشی مرۆڤ و سەری، هەڵگرتنی شاف چ لەپێش یان لەپاش، خۆڕشاندنەوە بەئەنقەست، کاری شەرعی لەگەڵ خێزانی خۆی بەنقەست، هاتنەوەی (مەنی) بە نزیکی لەئافرەتەوە[1]، حەیز، منالبوون، شێتی، کافربوون.[2]

سێ شت لەڕۆژوودا خێریان زۆرە: ئێواران زوو ڕۆژوو بشکێنی[3]، پارشێو دەرنگ بکات، واز لەوتەی ناشیرین و بێکەڵك بێنێت.[5]

ڕۆژوو گرتن لەپێنج ڕۆژدا حەرامە: دوو جەژنەکە[6]

---

(١) واتە بەهۆی ماچکردن یان دەست لێدان (مەنی) بێتەوە.

(٢) چونکە ئەمانە ئەهلیەتی عیبادەتیان تێدا نییە.

(٣) بوخاری (١٨٥٦) موسلم (١٠٩٨) ((لايزال الناس بخير ماعجلوا الفطر)) باش وایە پێش نوێژی شێوان بەچەند خورمایەك یان کەمە ئاوێك ڕۆژووەکەی بشکێنێ ئینجا نوێژ بکات پاشان نان بخوات.

ابن حيان: ( انه (ﷺ) كان اذا كان صائما لم يصل حتى يؤتى برطب أو ماء فيأكل أو يشرب واذا كان فى الشتاء لم يصل حتى نأتيه بتمر أو ماء)).

(٤) (احمد) (١٤٧/٥) ((لاتزال أمتى بخير ماعجلوا الافطار وأخروا السحور)) ابن حيان: ((ان تأخير السحور من سنن المرسلين)) بوخاری (٥٥٦) ((ان النبى (ﷺ) وزيد بن ثابت تسحرا فلما فرغا من سحورهما قام النبى (ﷺ) الى الصلاة فصلى. قلنا لأنس: كم كان بين فراغهما من سحورهما ودخولهما فى الصلاة؟ قال: قدر مايقرأ الرجل خمسين آية)).

(٥) بوخاری (١٨٠٤) ((من لم يدع قول الزور والعمل به فليس لله حاجة فى أن يدع طعامه وشرابه))

(٦) موسلم (١١٣٨) بوخاری (١٨٩٠) ((ان رسول الله (ﷺ) نهى عن صيام يومين: يوم الأضحى ويوم الفطر))

وَأيّامَ التَشريقِ الثلاثَةِ وَيكرَهُ صَومُ يومِ الشَكِ إلاّ أَن يُوافِقَ عادَةً لهُ.

وَمَن وَطِئَ في نَهارِ رَمضانَ عامِداً في الفَرجِ فَعَليهِ القَضاءُ وَالكفّارَةُ وهيَ: عِتقُ رَقَبةٍ مُؤمِنَةٍ، فإن لَم يَجِدْ فَصِيامُ شَهرينِ مُتَتابِعَينِ،

و سێ ڕۆژەی (ایام التشریق) واته سێ ڕۆژ دوای جەژنی قوربان.[1]

بەڕۆژوو بوون لەو ڕۆژەدا کەگومانی تیایە[2] داخوا ڕەمەزانە یان نا، کەراهەتی هەیەو باش نی‌یە مەگەر یەکێك عادەتی وابێت کەلەوەپێش لەو ڕۆژەدا بەڕۆژوو بووبێت.[3]

ئەگەر یەکێك لەڕەمەزاندا بەڕۆژکاری شەرعی لێ‌قەوما ئەوا ئەبێت هەم ڕۆژووەکەی بگرێتەوە هەم کەفارەتیش بدات. کەفارەتەکە بریتی‌یە لە: ئازادکردنی کۆیلەیەکی موسلمان، ئەگەر نەی‌بوو ئەوا ئەبێت دوو مانگ لەسەریەك بەڕۆژوو بێت،

(١) موسلم (١١٤٢) ((لايدخل الجنة الا مؤمن وأيام منى أيام أكل وشرب)) ابوداود (٢٤١٨) ((هذه الأيام التى كان (ﷺ) يأمرنا بافطارها وينهانا عن صيامها قال مالك: وهى أيام التشريق.))

(٢) مەبەست ڕۆژی سی‌هەمی مانگی شەعبانە خەڵکی نازانن داخوا بەشێکە لەشەعبان یان یەکەم ڕۆژی ڕەمەزانە ابوداود (٢٣٣٤) الترمذى (٦٨٦) ((من صام اليوم الذى يشك فيه الناس فقد عصى أبا القاسم)) ڕاستتر وایە کەحەرامە نەك مەکروهە.

هەروەها بەڕۆژووبوون لەنیوەی دووەمی شەعبان دا حەرامە ابوداود (٢٣٣٧) الترمذى (٧٣٨) ((اذا انتصف شعبان فلا تصوموا)) ابن ماجة (١٦٥١) ((اذا كان النصف من شعبان فلا صوم حتى يجيئ رمضان))

(٣) بوخارى (١٨١٥) موسلم (١٠٨٢) ((لاتقدموا رمضان بصوم يوم ولا يومين الا رجل كان يصوم صوما فليصمه)) واته: ئەگەر عادەتی وابوو کەئەو ڕۆژانە لەمانگەکانی تردا بەڕۆژوو دەبو ئەوە بۆ ئەو کەسە حەرام نی‌یە.

فَإن لَم يَستَطِعْ فَإطعامُ سِتِّينَ مسكينًا لِكُلِّ مِسكينٍ مُدٌّ.
وَمَن ماتَ وَعليهِ صِيامٌ مِن رَمَضانَ أُطعِمَ عنهُ لِكُلِّ يومٍ مُدٌّ. وَالشَّيخُ: إن عَجَزَ عنِ الصَّومِ يُفطِرُ ويُطعِمُ عَن كلِّ يَومٍ مُدًّا .

ئەگەر نەیتوانی ئەبێت خواردنی شەست فەقیر بدات هەریەکە یان مستێکی بداتێ.(١)
ئەگەر یەکێك مردوو ڕۆژووی ڕەمەزان قەرزاربوو ئەوا ئەبێت بەرامبەر هەر ڕۆژێك مستێك خواردن بدرێت بەهەژران لەبری ئەو ڕۆژووانە.(٢)
ئەو پیرەی کەتوانای ڕۆژوو گرتنی نییە بەڕۆژوو نابێت بەڵام لەبری هەر ڕۆژێك مستێك خواردن دەدات بەهەژاران.

(١) بوخاری (١٨٣٤) موسلم (١١١١) (بينما نحن جلوس عند النبی (ﷺ) اذ جاءه رجل فقال: يارسول الله هلكت قال: ((مالك؟)) قال: وقعت على امرأتي وأنا صائم - فی رواية فی رمضان - فقال رسول الله (ﷺ): ((هل تجد رقبة تعتقها؟)) قال: لا. قال: ((فهل تستطيع أن تصوم شهرين متتابعين؟)) قال: لا، قال: ((فهل تجد اطعام ستين مسكينا؟)) قال: لا. قال: فمكث النبی (ﷺ) فبينا نحن على ذلك أتي النبی (ﷺ) بعرق فيه تمر والعرق المكتل قال: ((أين السائل)) فقال: أنا قال: ((خذ فتصدق به)) فقال الرجل: أعلى افقر منی يارسول الله. فوالله مابين لابيتيها يريد الحرتين اهل بيت افقر من أهل بيتی. فضحك النبی (ﷺ) حتى بدت انيابه ثم قال: ((اطعمه اهلك)) ).
ئەمە ڕووداوێکی تایبەتی بووە ئەگینا دروست نییە کەفارەت بدرێت بەخێزانی ئەو کەسەی کەکەفارەت ئەدات.
(٢) لەبژێوی زۆربەی خەڵکەکە وەك گەنم. مستیش بریتییە لەپڕاوپڕی قاپێکی چوارپاڵوو کەدرێژی لایەکی ٩،٢ سم بێت بەکێشانەش ئەکاتە (٦٠٠) گرام. ئەمەش لەسەروەتی مردووەکە دەدرێت ئەگەر نەیبوو ئەوا ئەتوانرێت یەکێك بۆی بدات.
الترمذی (٨١٧) ((من مات وعليه صيام شهر فليطعم عنه مكان كل يوم مسكينا))
ابوداود (٢٤٠١) ((اذا مرض الرجل فی رمضان ثم مات ولم يصم أطعم عنه)) باشتر وایە یەکێك یان لەخزمەکانی یان هەرکەسێك کەمردووەکە دەستنیشانی کردبوو یان وەرەسەکان بۆی بگرنەوە بوخاری (١٨٥١) موسلم (١١٤٧) ((من مات وعليه صيام صام عنه وليه))
بوخاری (١٨٥٢) موسلم (١١٤٨) (جاء رجل الى النبی (ﷺ) فقال: يارسول الله ان أمی ماتت وعليها صوم شهر أفأ قضيه عنها؟ قال: ((نعم فدين الله أحق ان يقضي)) ).
دیارە ئەمە بۆیەکێکە کەلەبەر عوزرێك بەڕۆژوو نەبووبێت پاشان توانای بووە بیان گرێتەوە بەڵام گوێی نەداوەتێ یان هەر لەخۆیەوە بێعوزر نەیگرتووە. ئەگەر یەکێك لەبەر عوزرێك نەیگرتبوو پاشان بۆی نەلوابوو بیگرێتەوە ئەوە قەزای لەسەر نییە.

وَالحامِلُ والمُرضِعُ: إِن خافَتا عَلى انفُسِهما أَفطَرَتا وَعليهِما القَضاءُ، وإِنْ خافَتا عَلى أَولادِهِما أَفطَرَتا وَعليهِما القَضاءُ وَالكَفارَةُ عَن كلِّ يومٍ مُدٌ وَهوَ رِطلٌ وثُلثٌ بِالعراقيّ وَالمريضُ والمُسافِرُ سَفَراً طَويلاً يُفطِران وَيَقضِيانِ.
(فَصلٌ) وَالإعتِكافُ سُنّةٌ مُستَحَبّة

ئافرەتی سك پڕو شیردەر ئەگەر ڕۆژوو زیان بەخۆیان بگەیەنێت ئەوا ئەتوانن بەڕۆژوو نەبن بەڵام دوایی بیگرنەوە[1] بەڵام ئەگەر مەترسی‌یەکە بۆ منالەکەیان بوو ئەوا ئەتوانن بەڕۆژوو نەبن و دەبێت لەگەڵ گرتنەوەی ڕۆژووەکە کەفارەتیشی بدەن[2] بەرامبەر هەر ڕۆژێك مستێك کەبریتی‌یە لەڕەتڵێك و سێ‌یەکی ڕەتڵێك بەهی عراق.[3] ئەگەر یەکێك نەخۆش بوو یان لەسەفەرێکی درێژدا بوو ئەوا ئەتوانن بەڕۆژوو نەبن بەڵام دوایی بیگرنەوە.[4]

(باس) ئیعتیکاف: واتە مانەوە لەمزگەوتدا سوننەتێکی گەورەیە[5]

(١) الترمذي (٧١٥) ابوداود (٢٤٠٨) ((ان الله تعالى وضع عن المسافر الصوم وشطر الصلاة وعن الحامل والمرضع الصوم)).

(٢) ابوداود (٢٣١٨) ((ابن عباس)) (خوای لێ‌ڕازی‌بێت) دەڵێت: ﴿وعلى الذين يطيقونه فدية طعام مسكين﴾ قال: كانت رخصة للشيخ الكبير والمرأة الكبيرة وهما يطيقان الصيام ان يفطرا ويطعما كل يوم مسكينا والحبلى والمرضع اذا خافتا - يعنى على أولادهما - أفطرتا وأطعمتا)).

(٣) لەمەوبەر باسمان کرد کەئێستا چی ئەکات.

(٤) ئایەتی: ﴿من كان منكم مريضا أو على سفر فعدة من أيام أخر﴾ (البقرة: ١٨٥)

واتە: ئەگەر یەکێك لەڕەمەزان دا نەخۆش بوو بەجۆرێك کەنەتوانێ بەهۆی ئەو نەخۆشی‌یەوە بەڕۆژوو بێت یان لەسەفەردا بوو باڕۆژووەکەی بشکێنێ‌و پاشان بەقەدەر ئەو ڕۆژانە لەدوای ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت...

(٥) بوخاری (١٩٢٢) موسلم (١١٧٢) عن عائشة (رضي الله عنها): ((ان النبى (ﷺ) كان يعتكف العشر الاواخر من رمضان حتى توفاه الله ثم اعتكف أزواجه من بعده)).

بوخاری (١٩٣٦) ((انه (ﷺ) اعتكف فى آخر العشر الاواخر)).

وَلَهُ شَرطانِ: النّيّةُ، واللُّبثُ في المَسجِدِ. وَلايَخرُجُ مِن الاعتكافِ المَنذورِ إلاّ لِحاجةِ الإنسانِ أو عُذرٍ: مِن حَيضٍ أو مَرَضٍ لايُمكِنُ المُقامُ مَعَهُ. وَيَبطُلُ بالوَطءِ.

وەدوو مەرجی هەیە: نیەت هێنان، مانەوە لەمزگەوت دا. ئەگەر ئەو ئیعتیكافە نەزربوو ئەوا نابێت مزگەوتەكە بەجێبهێڵیت مەگەر بۆ ئەنجام دانی كاری پێویستی مرۆڤ[1] یان پەیدابوونی عوزرێكیوا كەناچاری بكات بچێتە دەرەوە وەك حەیز یان نەخۆشی یەكی وا كەنەتوانێ لەمزگەوتا بمێنێتەوە. ئیعتیكاف بەكاری شەرعی بەتاڵ ئەبێتەوە.[2]

(١) بوخاری (١٩٢٥) موسلم (٢٩٧) عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: ((وان كان رسول الله (ﷺ) ليدخل على رأسه وهو فى المسجد فأرجله وكان لايدخل البيت الالحاجة اذا كان معتكفا))

(٢) ئایەتی ﴿ولاتباشروهن وانتم عاكفون فى المساجد﴾ (البقرة: ١٨٧) واتە نابێت لەكاتی ئیعتیكافدا كاری شەرعی ئەنجام بدەن.

# كتاب الحجّ

وَشَرائِطُ وجوبِ الحج سَبعة أشياءَ: الإسلامُ، والبلوغُ، والعقلُ والحُرِيَّةُ، ووجودُ الزادِ والرّاحلةِ، وَتخليةُ الطّريقِ، وإمكانُ المَسيرِ.

وَأركانُ الحج خمسةٌ: الإحرامُ مَعَ النّيّةِ، والوقوفُ بعرفَةَ، والطّوافُ بالبَيتِ. وَالسّعيُ بينَ الصّفا وَالمَروَةِ،

## باسی حەج

مەرجەکانی واجب بوونی حەج[1] حەوت شتن: ئیسلامەتی، بالّغی، ئەقلّ، حورِیەت، تێشووی سەفەرو ولآخی سواری[2]، ڕێگا ئەمین بێت، ماوەی ئەوەندە مابێت بگاتە مەککە.[3]

ئەرکانەکانی حەج پێنج شتن: ئیحرام بەستن و نیەت هێنان، وەستان لەکێوی عەرەفات،[4] تەوافی ماڵی خوا،[5] هاتوچۆی نێوان سەفاو مەروە،[6]

---

(١) ئایەتی: ﴿ولله على الناس حج البيت من استطاع اليه سبيلا﴾ (ال عمران: ٩٧) موسلم (١٣٣٧) ((ايها الناس قد فرض الله عليكم الحج فحجوا)) حەدیسی ((بني الاسلام على خمس...)).

(٢) زانایانی تەفسیر وشەی (السبيل) لەئایەتەکەدا بەم شتانە لێك ئەدەنەوە، الحاكم (٤٤٢/١) عن أنس (ﷺ) عن النبي (ﷺ) في قوله تعالى: ﴿ولله على الناس حج البيت من استطاع اليه سبيلا﴾ قال: قيل يارسول الله ماالسبيل؟ قال: ((الزاد والراحلة))

(٣) واتە هیچ هۆیەك نەبێت کەئازاری ئەو کەسەبدات.

(٤) پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((الحج عرفة، من جاء ليلة جمع قبل طلوع الفجر فقد ادرك الحج)) الترمذي (٨٩٩) ابوداود (١٩٤٩).

مەبەست لەوشەی (جمع) مزدە لیفەیە چونکە خەڵکی لەوێدا کۆدەبنەوە.

(٥) ئایەتی ﴿وليطوفوا بالبيت العتيق﴾ ((الحج: ٢٩))

(٦) الدارقطني (٢٧٠/١) ((إنه (ﷺ) استقبل الناس في المسعى وقال: ((اسعوا فان الله كتب عليكم السعي)) )).

بوخاری (١٥٦٥) أبن عمر: ((قدم النبي (ﷺ) مكة فطاف بالبيت ثم صلى ركعتين ثم سعى بين الصفا والمروة ثم تلا: ﴿لقد كان لكم في رسول الله أسوة حسنة﴾ (الاحزاب: ٢١)

وَالحلقُ.

وأركانُ العُمرةِ أربعةٌ: الإِحرامُ، وَالطَّوافُ، وَالسَّعيُ، وَالحلقُ أَو التَّقصيرُ في أَحدِ القَولَين.

وَواجباتُ الحَجِّ غيرُ الأَركانِ ثلاثةُ أشياءَ:

سەرتاشین[1].

ئەركانەكانی عومرە چوارشتن: ئیحرام بەستن، تەواف، هاتوچۆی نێوان سەفاومەروە، سەرتاشین یان كورت كردنەوەی قژی سەر بەپێی یەكێك لەڕاكان كەپێی وایە بەس كورت كردنەوە كافی‌یە.[2]

واجیباتی حەج[3] بێجگە لەروكنەكان سێ‌شتن:

(١) بەشێكی سەریان كورتكردنەوەی. بوخاری (١٦٩) موسلم (١٣٠٥) ((أن رسول الله أتى منى فأتى الجمرة فرماها ثم اتىٰ منزله بمنى ونحر ثم قال للحلاق: ((خذ أواحلق واشار الى جانبه الايمن ثم الايسر ثم جعل يعطيه الناس)) )).

سەرتاشین لەكورتكردنەوە بۆ پیاوان باشترە: بوخاری (١٦٤٠) موسلم (١٣٠١) ((اللهم ارحم المحلقين)) قالوا: والمقصرين يارسول الله قال:((اللهم ارحم المحلقين)) قالوا: والمقصرين يارسول الله قال: ((والمقصرين)).

بۆ ئافرەتان كورتكردنەوە باشترەو سەرتاشین باش نی‌یەو مەكروهە

الترمذی (١٩٨٤ ـ ١٩٨٥) ((ليس على النساء الحلق انما على النساء التقصير))

ابوداود (٩١٤) ((نهى رسول الله (ﷺ) ان تحلق المرأة رأسها)).

(٢) ئەم ڕایە پەسەندترە: بوخاری (١٥٦٨) ((فأمر النبی (ﷺ) أصحابه ان يجعلوها عمرة ويطوفوا ثم يقصروا ويحلوا)).

(١٤٧٠) ((ان يطوفوا بالبيت وبالصفاوالمروة ثم يقصروا من رؤوسهم ثم يحلوا))

(١٦٤٤) موسلم (١٢٢٧) ((ثم يحلوا ويحلقوا أو يقصروا))

(٣) جیاوازی نێوان ئەركان و واجبات لەوەدایە كەواجب تۆڵە دەكرێتەوە بەلاّم كەروكن فەوتا ئەوا حەجەكە بەتاڵ دەبێتەوە.

**اَلإحرامُ مِنَ الميقاتِ، وَرَميُ الجمارِ الثَّلاث، وَالحَلقُ.**

**ئیحرام بەستن لەشوێنی دیاریکراوەوە،[1] بەرد هاویشتن بۆ شوێنە تایبەتی‌یەکان (الجمار) کەسێ شوێنن،[2] سەرتاشین.[3]**

(١) ئەو شوێنەیە کەکاتی خۆی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ شوێنە جیاجیاکانی دیاری‌کردوە دەبێت هەرکەسێك بەنیازی حەج یان عومرە ڕوبکاتە شاری مەککە ئەبێت لەو شوێنانەوە ئیحرام ببەستێ.

بوخاری (١٤٥٤) موسلم (١١٨١) (إبن عباس) (خوای لێ‌ڕازی‌بێت): ((وقت رسول الله (ﷺ) لاهل المدينة ذا الحليفة ولأهل الشام الجحفة ولاهل نجد قرن المنازل ولاهل اليمن بلملم فهن لهن ولمن أتى عليهن من غير اهلهن، لمن كان يريد الحج والعمرة فمن كان دونهن فمهله من اهله وكذالك حتى اهل مكة يهلون منها)).

بوخاری (١٤٥٨) ابن عمر (رضي الله عنه): ((لمافتح هذان المصران أتوا عمر فقالوا: ياأمير المؤمنين ان رسول الله حد لاهل نجد قرنا وهو جور عن طريقنا وانا ان أردنا قرنا شق علينا. قال: فانظروا حذوها من طريقكم فحدلهم ذات عرق))

(٢) ئەم كارە لەڕۆژانی یانزەو دوانزەو سیانزەی ذي الحجةدا دەكرێت تەنها (جمره العقبه) لەڕۆژی جەژن دا دەكرێت.

بوخاری (١٦٦٥) ((ان عبدالله ابن عمر (رضي الله عنهما) كان يرمى الجمرة الدنيا بسبع حصيات ثم يكبر على اثر كل حصاة ثم يتقدم فيسهل فيقوم مستقبل القبلة قياما طويلا فيدعو ويرفع يديه ثم يرمى الجمرة الوسطى كذلك فيأخذ ذات الشمال فيسهل ويقوم مستقبل القبلة قياما طويلا فيدعو ويرفع يديه ثم يرمى الجمرة ذات العقبة من بطن الوادى ولايقف عندها ويقول: هكذا رأيت رسول الله (ﷺ) يفعل))

بەرد هاویشتن لەجەژن دا دوای خۆرهەڵاتە بەڵام ڕۆژەكانی‌تر دوای نیوەڕۆیە. موسلم (١٢٩٩) ((رمى رسول الله (ﷺ) يوم النحر ضحى واما بعد فاذا زالت الشمس)) (ابوداود) ((١٩٧٣) ((ثم رجع الى منى فمكث بها ليالى التشريق يرمى الجمرة اذا زالت الشمس كل جمرة بسبع حصيات))

(٣) ڕاستتر وایە كەسەرتاشین ڕوكنە نەك واجب.

وَسُنَنُ الحَجِّ سَبعٌ: الإِفرادُ، وهـو تَقديـمُ الحَجِّ علـى العُمـرَة، وَالتَّلبيَـةُ، وطوافُ القُدوم. والَمَبيتُ بمزَدلفَةَ، ورَكعتا الطَّوافِ، والَمَبيتُ بمنىً،

سوننەتەکانی حەج حەوت شتن: جیاکردنەوەی حەج لەعومرە واتە حەج پێش عومرە بخات[1]، ووتنی دوعـای (لبیـك)[2]، تـەوافی مـاڵی خـوا کـاتی چوونـە نـاو مەککـە[3]، مانـــەوەی شـــەو لـــەموز دەلیفـــە[4]، دووڕکـات نوێــژی تــەواف[4] شەومانەوە لەمینا[5]،

(١) پێغەمبـەر (ﷺ) لەحـەجی ماڵئـاوایی‌دا وای کـردووە: بوخـاری ((عـن عائشـة (رضي الله عنها) قالت خرجنا مع رسول الله (ﷺ) في حجة الوداع فمنا من اهل بعمرة ومنا مـن اهـل بحجـة ومنـا من اهل بحج وعمرة واهل رسول الله (ﷺ) بالحج فأما من اهل بالحج أو جمع الحج فلـم يحلـوا حتى يوم النحر)).

(٢) باشتر وایە دوعای تایبەتی پێغەمبەر بخوینرێت: بوخـاری (١٤٧٤) موسلم (١١٨٤) ((ان رسول الله (ﷺ) كان اذا استوت بـه راحلتـه قائمـة عنـد مسجد ذى الحليفـة اهـل فقـال: ((لبيك اللهم لبيك لبيك لاشريك لك لبيك ان الحمد والنعمة لك والملك لاشريك لك)).

(٣) بوخاری (١٥٣٦) موسلم (١٢٣٥) ((ان أول شئ بدأبـه النـبي (ﷺ) حـين قـدم مكـة انه توضأ ثم طاف بالبيت)).

(٤) موسلم (١٢١٨) ((ان النبى (ﷺ) اتى المزدلفة فصلى بها المغرب والعشاء واضطجـع حتى اذا طلع الفجر صلى الفجر)).

دانانی ئەمە بەسوننەت ڕایەکی بەهێز نییە ڕاست وایە کەواجبە (المجموع) (١٢٧/٨ ـ ١٢٨).

بوخـاری (١٥٤٤) (( قــدم رسـول الله (ﷺ) فطـاف بـالبيت سـبعاً ثـم صلـى خلـف المقام ركعتين)).

(٥) پێغەمبـەر (ﷺ) شـەومارەتەوە ڕاسـت وایـە کەئـەمـە واجـب بێــت نــەك ســوننەت (المجموع ١٨٨/٨)

بوخـاری (١٥٥٣) موسـلم (١٣١٥) ((استـأذن العبـاس بـن عبدالمطلـب (رضي الله عنه) رسـول الله (ﷺ) ان يبيت بمكة ليالى منى مـن أجـل سقايته فـأذن لـه)) لەمـەوە دەرئەکـەوێت کەئەگەر عوزری نەبێت دروست نییە.

وَطَوافُ الوداعِ.
وَيَتَجَرَّدُ الرَّجلُ عِندَ الإحرامِ مِنَ المَخيطِ وَيلبَسُ إزارًا ورداءً أبيضَين.
(فصلٌ) ويحرُمُ علىَ المُحرِمِ عشرةُ أشياءَ: لُبسُ المَخيطِ، وتغطِيَةُ الرَّأسِ مِنَ الرَّجلِ وَالوجهِ مِنَ المَرأةِ،

تەوافی ماڵئاوایی[1].

ئەبێت پیاو لەکاتی ئیحرام بەستن دا هەر جلێك كەدووررابێت دای بکەنێت و تەنها پەشتەماڵ و سەرشانی سپی لەبەربکات.[2]

(باس) یەکێك ئیحرامی بەست (دە) شتی لێ حەرام دەبێت: لەبەرکردنی دووراو، داپۆشینی سەر بۆ پیاو و دەموچاو بۆ ئافرەت،[3]

(١) راستتر وایە کەئەمیش واجبە: موسلم (١٣٢٧) ((كان الناس ينصرفون فى كل وجه فقال رسول الله (ﷺ): لاينفرن احدكم حتى يكون آخر عهده بالبيت)) ابوداود (٢٠٠٢) ((حتى يكون آخر عهده الطواف بالبيت))

بەڵام ئەمە لەسەر ئافرەتی حەیزدارو نەفساو نییە: بوخاری (١٦٦٨) موسلم (١٣٢٨) ((أمر الناس ان يكون آخر عهدهم بالبيت الا انه خفف عن المرءة الحائض)).

(٢) بوخاری (١٤٧٠) ((إنطلق النبي (ﷺ) من المدينة بعدما ترجل وإدهن ولبس إزاره ورداءه هو وأصحابه فلم ينه عن شيء من الأردية والأزر تلبس)).

حەدیسی: ((البسوا من ثيابكم البياض))

بوخاری (١٤٧٩) ((كان ابن عمر (رضي الله عنه) اذا اراد الخروج الى مكة ادهن بدهن ليس له رائحة طيبة ثم يأتى مسجد ذى الحليفة فيصلي ثم يركب واذا استوت به راحلته قائمة أحرم ثم قال: هكذا رأيت النبى (ﷺ) يفعل))

بوخاری (١٤٦٥) موسلم (١١٨٩) ((عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: كنت اطيب رسول الله (ﷺ) لاحرامه حين يحرم ولحله قبل ان يطوف بالبيت - اى طواف الركن.

(٣) بوخاری (١٤٦٨) موسلم (١١٧٧) (ان رجلا سأل النبى (ﷺ): مايلبس المحرم من الثياب؟ فقال: ((لاتلبسوا من الثياب القمص ولا العمامة ولاالسراويلات ولاالبرانس ولاالخفاف الا احد لايجد النعلين فيلبس الخفين وليقطعهما أسفل من الكعبين ولاتلبسوا من الثياب مامسه الزعفران أو ورس)) ).

بوخاری (١٧٤١) ((ولا تنتقب المرأة ولاتلبس القفازين))

بۆ ئافرەت دروستە هەموو جۆرە جلێك لەبەربکات وەنابێت بێجگە لەدوو دەست و دەموچاوی شوێنی تری دەربخات.

وترجيل الشَعرِ وَحلقُهُ، وَتقليمُ الأظافِرِ، وَالطَيبُ، وَقتلُ الصَيدِ، وَعقدُ النِكاحِ، وَالوَطءُ، والمباشَرةُ بِشَهوَةٍ

وَفي جميعِ ذٰلِكَ الفِديةُ إلاّ عقدَ النِكاحِ فإنّهُ لايَنعَقِدُ.

وَلايُفسِدُهُ إلا الوَطءُ في الفَرجِ، وَلايَخرُجُ منهُ بالفَسادِ.

---

قژی سەرداهێنان و تاشینی، [١] نینۆك كردن، بۆنی خۆش لەخۆدان، [٢] ڕاوكردنی نێچیر، [٣] ژن مارەكردن [٤]، كاری شەرعی [٥]، دەستلێدانی ئافرەت لەگەڵ ئارەزوو شەهوەت.

لەكردنی ئەمانە هەموویان (فدیە) هەیە تەنها ژن مارەكردن نەبێت كە(فدیە)ی ناوێت چونكە عەقدەكە بەتاڵەو دانامەزرێت. ئیحرام تەنها بەكاری شەرعی بەتاڵ دەبێتەوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نابێت وازی لێبهێنیت، ئەبێت حەجەكەی تەواو بكات. [٦]

---

(١) ئایەتی: ﴿ولا تحلقوا رؤوسكم حتى يبلغ الهدى محله﴾ (البقرة: ١٩٦)

واتە: شوێنی سەربڕینی كە(مینا)یە لەڕۆژی جەژن دا.

(٢) بوخاری (١٧٤٢) موسلم (١٢٠٦) (وقصت برجل محرم ناقته فقتلته فأتي به رسول الله (ﷺ) فقال: ((اغسلوه وكفنوه ولاتحلقوا رأسه ولاتقربوه طيبا فانه يبعث يهل)) ).

(٣) ئایەتی: ﴿وحرم عليكم صيد البر مادمتم حرما﴾ (المائدة: ٩٦)

(٤) موسلم (١٤٠٩) ((لاينكح المحرم ولاينكح))

(٥) ئایەتی: ﴿الحج أشهر معلومات فمن فرض فيهن الحج فلارفث ولافسوق ولا جدال في الحج﴾ (البقرة: ١٩٧)

(٦) واتە ئەبێت بەردەوام بێت لەتەواوكردنی حەجەكەیدا واجبە ئەو حەجە قەزابكاتەوە باسوننەتیش بێت.

ئایەتی: ﴿وأتموا الحج والعمرة لله﴾ (البقرة: ١٩٦)

مالك (الموطأ) (١/٣٨١) (ان عمر ابن الخطاب وعلي ابن ابي طالب وابا هريرة (رضي الله عنهم) سئلوا: عن رجل أصاب اهله وهو محرم بالحج؟ فقالوا: ينفذان يمضيان لوجهيهما حتى يقضيا حجهما ثم عليهما حج قابل والهدى)

وَمَن فاتَه الوقوفُ بعرفَة تَحَلَّلَ بِعَمَلِ عُمرةٍ، وَعليه القضاءُ والهَدْيُ، وَمَن تَرَكَ رُكناً لَم يَحِلَّ مِن إحرامِهِ حَتىٰ يَأتي بِه، وَمَن تَركَ واجِبًا لَزِمَه الدَّمُ وَمَن تَركَ سُنةً لَم يَلزَمْهُ بِتَركِها شَيئٌ.

(فَصلٌ) والدِّماءُ الواجِبَةُ في الإحرامِ خَمسةُ أشياءَ:

أحدُهما: الدَّمُ الواجِبُ بِتَركِ نُسُكٍ وهُوَ علىٰ الترتيب: شاةٌ، فإنْ لَم يَجِدْ فَصِيامُ عَشرةِ أيامٍ ثَلاثةٌ في الحَجِ وَسَبعةٌ إذا رَجَعَ إلىٰ أهلِهِ.

---

ئەگەر یەکێك فریا وەستانی عەرەفە نەکەوت و لەدەستی چوو ئەوا ئەبێت حەجەکەی بکات بەعومرەو ساڵێکیتر قەزای بکاتەوە و (هدی)یشی لەسەرە.[1]

ئەگەر یەکێك ڕوکنێکی لەئەرکانی حەج نەکردبوو[2] نابێت ئیحرامەکەی بشکێنێت تائەی کات[3] بەڵام ئەگەر واجبێکی نەکردبوو ئەوا ئەبێت لەبری ئەوە حەیوان سەرببڕێت.[4] ئەگەر سوننەتێکی نەکردبوو ئەوە هیچی لەسەر نییە.

(باس) حەیوان سەربڕین کەپێی ئەوترێت خوێن یان فدیە لە ئیحرام دا پێنج جۆرن:

١. ئەو خوێن کردنەی کەلەبری نەکردنی واجبێکە ئەوەش بەتەرتیبە واتە پێشان ئەبێت کاوڕێك سەربرێت ئەگەر نەیبوو دەڕۆژ بەڕۆژوبێت سیان لەکاتی حەجەکەدا و حەوت ڕۆژیش کەگەڕایەوە ماڵەوە.[5]

---

(١) الدارقطني (٢٤١/٢) ((ومن ادرك عرفة ليلاً فقد أدرك الحج ومن فاته عرفة ليلا فقد فاته الحج فليهل بعمرة وعليه الحج من قابل))

مالك/ الموطأ (٣٨٣/١) ((ان هبار بن الاسود جاء يوم النحر وعمر بن الخطاب ينحر هديه فقال: ياأمير المؤمنين اخطأنا العدة كنا نرى ان هذا اليوم يوم عرفة فقال عمر: إذهب إلى مكة فطف أنت ومن معك وأنحروا هديا إن كان معكم، ثم احلقوا أو قصروا وارجعوا فاذا كان عام قابل فحجوا واهدوا فمن لم يجد فصيام ثلاثة أيام في الحج وسبعة اذا رجع))

(٢) واتە بێجگە لەوەستانی عەرەفات چونکە ئەمەمان باس کرد.

(٣) واتە (فدیە)ی نییە وەحەیوان سەربڕین تۆڵەی ناکاتەوە چونکە حەج لەسەرئەوانە بەندە نابێت ئیحرام بشکێنێ تاتەواویان نەکات هەروەها ئەمانە کاتی دیاریکراویان نییە وەك وەستانی عەرەفات ئەتوانێت هەرکاتێك بیەوێ بیان کات.

(٤) البيهقي: ((من ترك نسكاً فعليه دم)) (المجموع: ١٠٦/٨)

(٥) ئایەتی ﴿فمن تمتع بالعمرة الى الحج فما استيسر من الهدى فمن لم يجد فصيام ثلاثة أيام في الحج وسبعة اذا رجعتم﴾ (البقرة: ١٩٦)

واتە: ئەگەر یەکێك پێشان ئیحرامی بەعەمرە بەست پاشان بەحەج لەمەککەو نەچووە (میقات) ئەوا ئەبێت لەبری ئەوەی کەنەچۆتە میقات ئەو خوێنە بدات وەك وتمان چوونە میقات یەکێکە لەواجباتی حەج.

وَالثَّانِي: الدَّمُ الواجِبُ بالحَلقِ والتَّرَفُّهِ وهو عَلى التَّخييرِ: شاةٌ، أو صومُ ثلاثةِ أيامٍ، أوِ التَّصَدُّقُ بِثلاثةِ آصُعٍ علىٰ سِتةِ مَساكِينَ.
والثالِثُ: الدَّمُ الواجِبُ بِإحصارٍ، فَيَتَحَلَّلُ ويُهدي شاةً والرَّابِعُ: الدَّمُ الواجِبُ بِقتلِ الصَّيدِ وهوَ علىٰ التَّخييرِ: إن كانَ الصَّيدُ مِمَا لَهُ مِثلٌ أخرجَ المِثلَ مِنَ النَّعمِ أو قَوَّمَهُ وَاشترىٰ بقيمَتِهِ طعامًا وَتَصدَّقَ بِهِ أوصامَ عَن كلِّ مُدٍّ يوماً

٢. ئەو خوێنەی کەبەهۆی سەرتاشین یان خۆش ڕابواردنێکیتر واجب دەبێت ئەمەیان بەئارەزووی خۆیەتی یان کاوڕێك سەربرێت یان سیٚ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت یان سیٚ ڕ بەخواردن بکات بەخێر بەسەر شەش هەژاردا.(١)
٣. ئـەو خوێنـەی کەبـەهۆی نەهێشـتنە چـوون بـۆ مەککـە واجـب دەبێـت: ئیحرامەکەی دەشکێنێت و کاوڕێك سەر دەبڕی.(٢)
٤. ئـەو خوێنـەی کەبـەهۆی ڕاوکردنـی نێچـیرەوە واجـب دەبێـت: ئـەوەش بـەئارەزووی خـۆی ئـەیکات: ئەگـەر نێچیرەکـە لەوانـە بـوو کەنموونـەی دەسـت دەکەوت ئەوا ئـەو نموونەیـە لـەئاژەڵ دەکـات بـە(فدیـە)یـان نرخـی بـۆ دائـەنرێ و بەپارەکەی خواردن دەکـڕێ و دەیکـات بـەخێر یـان لـەبری هـەر مستێك خـواردن ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبێت(٣)

(١) ئایەتی: ﴿ولاتحلقوا رؤوسكم حتى يبلغ الهدى محله فمن كان منكم مريضا أوبه أذى من رأسه ففدية من صيام أو صدقة أو نسك﴾ (البقرة: ١٩٦)
بوخاری (١٧١٩) موسلم (١٢٠١) ((أيؤذيك هوام رأسك؟ قال: نعم قال: إحلق رأسك وأنسك شاة أوصم ثلاثة أيام أو اطعم فرقا من الطعام على ستة مساكين)) صاع: واتە ڕیە بریتییە لە(٢٤٠٠) گرام
(٢) ئایەتی: ﴿واتموا الحج والعمرة لله فان أحصرتم فما استيسر من الهدى﴾ (البقرة: ١٩٦)
بوخاری (١٥٥٨) موسلم (١٢٣٠) ((أنه (ﷺ) تحلل بالحديبية لما صده المشركون وكان محرما بعمرة)) پێویستە حەیوان سەربڕینەکە پێش سەرتاشین بێت:
((ولا تحلقوا رؤسكم حتى يبلغ الهدى محله))
بوخاری (١٧١٧) ((خرجنا مع رسول الله (ﷺ) معتمرين فحال كفار قريش دون البيت فنحر رسول الله (ﷺ) بدنة وحلق رأسه)).
(٣) ئایەتی: ﴿ياايها الذين آمنوا لاتقتلوا الصيد وانتم حرم ومن قتله منكم متعمداً فجزاء مثل ماقتل من النعم يحكم به ذوا عدل منكم هديا بالغ الكعبة أو كفارة طعام مساكين أو عدل ذلك صياما ليذوق وبال أمره عفا الله عما سلف ومن عاد فينتقم الله منه والله عزيز ذو انتقام﴾ (المائدة: ٩٥)

وَإِن كانَ الصَّيدُ مِمّا لامِثْلَ لَه، اَخرَجَ بِقيمتِهِ طَعامًا، اَوصامَ عن كُلِّ مُدٍّ يَومًا.

والخامسُ: الدمُ الواجِبُ بِالوطءِ وهو علىٰ التَّرتيب: بَدنَةٌ فإِن لَم يَجدها فبقَرةٌ، فإِن لَم يجدها فسَبعٌ مِن الغنمِ، فإِن لَم يَجدهـا قَوَّمَ البَدنَةَ واشـتَرىٰ بِقيمتِها طعامًا وَتَصَدَّقَ بِهِ فإن لم يَجدْ صامَ عن كلِّ مُدٍّ يَومًا.

وَلا يُجزِئُه الهَديُ ولا الإطعامُ إلاّ بِالحَرَمِ، وَيُجزِئُه أَن يَصومَ حَيثُ شاءَ.

وَلايَجوزُ قتلُ صَيدِ الحَرَمِ وَلاقطعُ شَجَرِه والمُحلُ والمُحرِمُ في ذٰلِكَ سَواءٌ.

ئەگەر نێچیرەکە لەوانە نەبوو نموونـەی دەسـت بکـەوێت ئـەوا بـەنرخی ئـەو نێچیرە خواردن دابەش دەکات یان لەبری هەر مستێك خواردن ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبێت.

٥. ئەو خوێنـەی کەبەهۆی کاری شـەرعی‌یەوە واجب دەبێت: ئەمە بەتـەرتیب دەبێت پێشان: حوشترێك ئەگەر نەی‌بوو مانگایەك ئەگەر نەی بوو: حەوت سەر مەڕ ئەگەر نەی بوو ئەوا بەپارەی حوشترەکە خواردن دەکڕێت‌و دەیکات بەخێر ئەگەر نەی‌بوو ئەوا لەبری هەر مستێك خواردن ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبێت.[1]

کاتێك حەیوان سـەربڕین‌و خواردن دابەش کـردن جێگـە ئـەگرێت‌و لەسـەری لائەچێت کەلە حەرەم واتە لەمەککـەدا بیکـات[2] بـەڵام ڕۆژوو لەهـەر شـوێنێك بـێ جێگە ئەگرێت چ لەحەرەم چ لەماڵی خۆی بێت.

بەهیچ جۆرێك ڕاوکـردن‌و کوشتنی نێچیری حـەرەم دروسـت نی‌یـە هـەروەها دروست نی‌یە درەختی ببڕێتەوە لەوەش دا هیچ جیاوازی‌یەك نی‌یـە لـەنێوان ئـەوەی کەلە ئیحرامدایە لەگەڵ ئەوەی کەلەئیحرامدا نی‌یە.[3]

(١) بەڵگـە لەسـەر واجـب بوونـی فدیـەی حوشـتر فتـوای سـەحابەکانە مـالك (الموطأ(١/٣٨٤) (عن ابن عباس (ﷺ) انه سئل عن رجل وقع بأهله وهو بمنى قبل ان يفيض فأمره ان ينحر بدنة).

(٢) ئایەتی ﴿هديا بـالغ الكعبـة﴾ کەواتـە ئـەبێت گۆشتەکەو خواردنەکە بدرێت بەهەژارانی شاری مەککە چ ئەوانەی کەخەڵکی ئەوێن یان لەوێ میوانن.

(٣) بوخاری (١٥١٠) موسلم (١٣٥٣) ابـن عبـاس قـال (ﷺ): يـوم فتـح مكة ((ان هـذا البلد حرام بحرمة الله لايعضد شجره ولا ينفـر صيـده ولاتلتقـط لقطتـه الا مـن عرفـها ولايختلـى خـلاه)). قـال العبـاس: يارسـول الله الا الاذخـر فانـه لقينـهم وبيوتـهم قـال: ((الا الإذخر)).

# كتابُ البيوعِ وغيرِها من المعاملات

اَلبُيوعُ ثلاثةُ اشياءَ: بيعُ عينٍ مُشاهَدةٍ فَجائِزٌ، وبيعُ شَيٍ مَوصوفٍ في الذِّمةِ فَجائِزٌ إذا وُجِدَت الصِّفةُ علىٰ ماوُصِفَ بِهِ، وبيعُ عينٍ غائبةٍ لم تُشاهَد فلايَجوز.

وَيَصِحُّ بيعُ كُلِّ طاهِرٍ مُنتَفَعٍ بِهِ مَملوكٍ وَلايَصِحُّ بَيعُ عَينٍ نَجِسَةٍ وَلا مالا مَنفَعةَ فيهِ.

(فصل) وَالرِّبا في الذَّهَبِ وَالفِضَّةِ وَالمَطعُومات.

## باسى كرين و فرۆشتن و معامه‌له‌كانى‌تر

كڕين‌و فرۆشتن سىٚ‌جۆرن: فرۆشتنى كالأيه‌كى له‌به‌رچاو: ئه‌وه دروسته[1]، كڕين‌و فرۆشتنى كالأيه‌ك كه‌له‌به‌رچاو نه‌بيٚت به‌لأم له‌عۆده‌ى يه‌كيٚكدا بىٚ‌و به‌ته‌واوى وه‌سف كرابيٚت: ئه‌وه‌ش دروسته ئه‌گه‌ر وه‌سفه‌كان به‌ته‌واوى ڕاست ده‌ربچن، فرۆشتنى كالأيه‌ك كه‌له‌به‌رچاو نه‌بيٚت‌و نه‌بينراوبيٚت: ئه‌وه دروست نى‌يه.[2]

هه‌موو شتيٚكى پاك‌و به‌سوود فرۆشتنى دروسته ئه‌گه‌ر ئه‌وكه‌سه خاوه‌نى بيٚت.[3] شتى پيس‌و بىٚ‌سوود[4] فرۆشتنى دروست نى‌يه.

(باس) سوو . ڕيبا.[5] ته‌نها له‌م شتانه‌دايه: ئالتون، زيو، خوارده‌مه‌نى‌يه‌كان.

---

(١) ئايه‌تى: ﴿وأحل الله البيع وحرم الربا﴾ (البقرة: ٢٧٥)

الحاكم (١٠/٢) سئل رسول الله (ﷺ): أى الكسب أطيب؟ فقال: ((عمل الرجل بيده وكل بيع مبرور)).

(٢) موسلم (١٥١٣): ((نهى رسول الله (ﷺ) عن بيع الغرر)).

(٣) ابوداود (٢١٩٠) ((ولابيع الا فيما تملك))

(٤) واته ئه‌وانه‌ى كه‌له‌شه‌رع دا به‌پيس دانراون وه‌ك: شه‌راب‌و به‌رازو......

بوخارى (١٢٢١) موسلم (١٥١٨) جابر (ﷺ): انه سمع رسول الله (ﷺ) يقول عام الفتح وهو بمكة: ((ان الله ورسوله حرم بيع الخمر والميتة والخنزير والاصنام)) فقيل: يارسول‌الله ((أرأيت شحوم الميتة فانها يطلى بها السفن ويدهن بها الجلود ويستصبح بها الناس؟)) فقال: ((لاهو حرام)) ثم قال: (ﷺ) ((عند ذلك قاتل الله اليهود ان الله لما حرم شحومها جملوه ثم باعوه فأكلوا ثمنه))

(٥) ئايه‌تى: ﴿وأحل الله البيع وحرم الربا﴾ (البقرة: ٢٧٥)

وَلايَجوزُ بيعُ الذَّهَبِ بِالذَّهبِ وِلا الفِضَّةِ كَذٰلِك إلا مُتَماثِلاً نَقداً.
وَلايَبيعُ ماإبتاعَهُ حَتىٰ يَقبِضَه؛
وَلابيعُ اللَّحمِ بالحَيوانِ. ويجوزُ بيعُ الذَّهبِ بالفِضَّةِ مُتَفاضِلاً نَقداً.

فرۆشتنی ئاڵتون بەئاڵتون یان زیو بەزیو کاتێك دروستە کەبەقەدەر یەك بن و یەکسەر تەسلیم بکرێن،[1] ئەگەر یەکێك شتێکی کڕی نابێت بیفرۆشێتەوە تاوەری نەگرێت.[2]

فرۆشتنی گۆشت بەحەیوان دروست نییە[3]. دروستە ئاڵتون بەزیو بفرۆشرێت بازیاتر بێت بەڵام ئەبێت یەکسەر تەسلیم بکرێت[4]

(١) موسلم (١٥٩٨) ((لعن رسول الله (ﷺ) آكل الربا وموكله وكاتبه وشاهديه وقال: هم سواء)).

موسلم (١٥٨٨) ((الذهب بالذهب وزنا بوزن مثلا بمثل والفضة بالفضة وزنا بوزن مثلا بمثل فمن زاد أو استزاد فهو ربا))

وفی روایة (١٥٨٤) ((یداً بید)).

(٢) بوخاری (٢٠٢٨) (ابن عباس (رضي الله عنه)) ((اما الذی نهی عنه النبی (ﷺ) فهو الطعام ان یباع حتی یقبض قال: ولا أحسب كل شیئ الامثله))

البیهقی (٣١٣/٥) حکیم بن حزام (رضي الله عنه) قال: (قلت یارسول الله انی ابتاع هذه البیوع فما یحل لی ومایحرم علی؟ قال: ((یاابن أخی لاتبیعن شیئا حتی تقبضه)) ).

ابوداود (٣٤٩٩) ((ان رسول الله (ﷺ) نهی ان تباع السلع حیث تباع حتی یحوزها التجار الی رحالهم)).

(٣) الحاكم (٣٥/٢): ((ان النبی (ﷺ) نهی عن بیع الشاة باللحم)) مالك /الموطأ (٦٥٥/٢) ((ان النبی نهی عن بیع الحیوان باللحم))

(٤) موسلم (١٥٨٧) ((الذهب بالذهب والفضة بالفضة والبر بالبر والشعیر بالشعیر والتمر بالتمر والملح بالملح مثلا بمثل سواءاً بسواء یداً بید فاذا اختلفت هذه الاصناف فبیعوا کیف شئتم اذا کان یداً بید))

وَكَذالِكَ المَطعوماتُ: لايجوزُ بيعُ الجِنسِ مِنها بِمِثلِهِ إلاّ مُتَماثِلاً نَقداً وَيجوزُ بيعُ الجِنسِ مِنها بِغيرِهِ مُتفاضِلاً نَقداً، ولايجوزُ بيعُ الغَرَرِ.

(فصل) والمُتَبايِعانِ بِالخِيارِ مالَم يَتَفَرَّقا، ولَهما أن يَشتَرِطا الخِيارَ إلىٰ ثَلاثَةِ أيامٍ.

---

خواردەمەنی‌یەکانیش هەروەهان: واتە دروست نی‌یە بەیەك جۆر وێنەی خۆی بفرۆشرێت ئەگەر بەقەدەر یەك نەبن و یەکسەر تەسلیم نەکرێن.[1]

دروستە جۆرێك بەجۆرێکی‌تر بفرۆشرێت بابەقەدەریەك نەبن، ئەگەر یەکسەر تەسلیم بکرێن. بەلأم فرۆشتنی شتی نەزانراو دروست نی‌یە[2]

(باس) فرۆشیارو کڕیار بۆیان هەیە کەعەقدەکە هەڵبوەشێننەوە بەمەرجێك لەیەکتر جیانەبنەوە،[3] هەروەها بۆیان هەیە کەتا سێ‌ڕۆژ مافی هەڵوەشاندنەوەیان هەبێت، واتە لەسەری ڕێك بکەون.[4]

---

(١) بوخاری (١٥٨٨) ((التمر بالتمر والحنطة بالحنطة والشعير بالشعير والملح بالملح مثلا بمثل يداً بيد فمن زاد أو استزاد فقد أربى الا ما اختلفت ألوانه))

بوخاری (٢٠٨٩) موسلم (١٥٩٣) ((ان رسول الله (ﷺ) استعمل رجلاً على خيبر فجائه بتمر جنيب فقال: (ﷺ) ((أكل تمر خيبر هكذا؟)) قال: لا، والله يارسول الله انا لنأخذ الصاع من هذا بالصاعين والصاعين بالثلاثة فقال: ((لاتفعل بع الجمع بالدراهم ثم ابتع بالدراهم جنيباً)) )).

(٢) واتە: هەر موعامەلەیەك نەزانراوی تیابێت وەك فرۆشتنی بێچوو لەسکی دایکیا یان شیر لەگوان دا. . .

موسلم (١٥١٣) ((نهى رسول الله (ﷺ) عن بيع الحصاة وعن بيع الغرر))

(٣) بوخاری (٢٠٠٥) موسلم (١٥٣١) ((المتبايعان كل واحد منهما بالخيار على صاحبه مالم يتفرقا الابيع الخيار))

(٤) بوخاری (٢٠١١) موسلم (١٥٣٣) ((ان رجلاً ذكر للنبي (ﷺ) انه يخدع في البيوع فقال: اذا بايعت فقل: لاخلابة))

ابيهقي (٢٧٣/٥) ((ثم انت بالخيار في كل سلعة ابتعتها ثلاث ليال))

وَاِذا وُجِدَ بالمَبيعِ عَيبٌ فَلِلمُشتَرِي رَدُّهُ، وَلايَجوزُ بيعُ الثَّمَرَةِ مُطلَقاً اِلاّ بَعدَ بُدُوِّ صَلاحِها، ولابيعُ مافيهِ الرِّبا بِجِنسِهِ رَطباً إلا اللَّبَنَ.

(فَصلٌ) وَيصِحُّ السَّلَمُ حالاً وَمُؤَجَّلاً فيما تَكامَلَ فيهِ خمسُ شَرائِطَ: اَنْ يَكونَ مَضبوطًا بِالصِّفَةِ، وَأَن يكونَ جِنساً لم يَختَلِط بِهِ غَيرُهُ، ولَم تَدخُلهُ النّارُ لإحالَتِهِ، وَأَن لايكونَ مُعَيَّنًا ولامِن مُعَيَّنٍ.

---

کڕیار بۆی هەیە فرۆشراوەکە بگەڕێنێتەوە بۆ فرۆشیار ئەگەر دەرکەوت عەیبی تیایەو عەیب دارە[1]. بەهیچ جۆرێك دروست نییە بەر بەدرەختەوە بفرۆشرێت تابەتەواوی ئەگات و سوود لێوەرگرتنی دەردەکەوێت.[2] هەرشتێك سوودی تیابێت نابێت بەتەڕی بفرۆشرێت بەجنسی خۆی مەگەر شیر، کەفرۆشتنی بەنموونەی خۆی دروستە[3].

(باس) سەلەم: بەوە دەڵێن شتێکی باسکراو لەعۆدە [ذمة]دا بفرۆشرێت:

سەلەم چ بەشێوەی حازر یان قەرز بێت دروستە[4] لەو شتەدا کەئەم پێنج مەرجەی تیابێنەدی: بەتەواوی وەسف کرابێت، یەك جۆر بێت و شتی تری تێکەڵ نەبووبێت، ئاگر لەپێکەیشتنیدا بەکارنەیەت، لەبەرچاونەبێت، هەمووی یان بەشێکی دیاریکراوی.

---

(١) بوخاری (٢٠٤١) موسلم (١٥١٥) ((لاتصروا الابل والغنم فمن ابتاعها بعد فانه بخير النظرين بعد أن يحتلبها ان شاء امسك وان شاء ردها وصاع تمر))

(٢) بوخاری (٢٠٨٢) موسلم (١٥٣٤٩ ((ان رسول الله (ﷺ) نهى عن بيع الثمار حتى يبدو صلاحها نهى البائع والمبتاع))

((لاتبتاعوا الثمر حتى يبدو صلاحه وتذهب عنه الآ فة))

واتە: وەك خواردەمەنییەکان.

(٣) چونکە لەشیردا دەتوانرێت بوترێت کەوەك یەکن بەلاّم لەشتەکانیتردا ئەوە نایەتەدی وەك: ترێ ـ خورما...

(٤) ئایەتی: ﴿يأأيها الذين أمنوا اذا تداينتم بدين الى أجل مسمى فاكتبوه﴾ (البقرة: ٢٨٢) (ابن عباس ) (خوای لێرازیبێت) دەڵێت مەبەستی سەلەمە.

بوخاری (٢١٢٥) موسلم (١٦٠٤) ((قدم النبي (ﷺ) المدينة وهم يسلفون بالتمر السنتين والثلاث فقال: من أسلف في شيئ فليسلف في كيل معلوم، ووزن معلوم، الى أجل معلوم))

ثُمَّ لِصِحَّةِ المُسْلَمِ فيهِ ثَمانيةُ شَرائِطَ: وهيَ: أَن يَصِفَهُ بعدَ ذِكرِ جنسِهِ ونوعِهِ بالصِّفاتِ التي يَختَلِفُ بها الثَّمنُ؛

وأَن يَذكُرَ قَدَرَهُ بِما يَنفي الجَهالَةَ عنهُ، وإِن كانَ مُؤَجَّلاً ذَكَرَ وقتَ مَحِلِّهِ، وأَن يكونَ مَوجوداً عندَ الإِستِحقاقِ في الغالِبِ، وأَن يَذكرَ مَوضِعَ قبضِهِ، وَأَن يَكونَ الثمنُ معلومًا، وأَن يَتَقابَضا قبلَ التَّفَرُّقِ، وأَن يَكونَ عِقدُ السَّلَمِ ناجِزاً لايَدخُلُهُ خِيارُ الشَّرطِ.

(فَصلٌ) وكُلُّ ماجازَ بيعُهُ جازَ رَهنُهُ في الدُّيونِ، إذا استَقَرَّ ثُبوتُها في الذِّمةِ،

بۆ دروستی ئەو شتەی کەسەلەمەکەی تیاکراوە هەشت مەرج هەیە. ئەبێت بەشێوەیەك باسکرابێت کەببێتە هۆی جیاوازی نرخ ئەمەش دوای ئەوەی کەرەگەزو جۆری دیاری دەکات.

ئەبێت چەندایەتی دیاری بکرێت بەشێوەیەك کەبزانرێت، ئەگەر قەرزبوو ئەوا کاتی وەرگرتنی دیاریبکرێت، ئەبێت ئەو شتە لەو کاتەی کەوەختی دێت هەبێت، ئەبێت شوێنی وەرگرتن باس بکرێت، ئەبێت نرخ دیاریکراوبێت[1]، پێش جیابوونەوە شتەکەی کەلەبری سەلەمەکە دیاریکراوە وەربگیرێت[2]، ئەبێت عەقدەکە ببڕێتەوە مەجالی پەشیمان بوونەوەی تیانەبێت.[3]

(باس) هەرشتێك دروست بێت بفرۆشرێت ئەوا دروستە لەبری قەرز بخرێتە رەهنەوە[4] بەمەرجێك ئەو قەرزە بەتەواوی کەوتبێتە عودەی قەرزارەکە.

---

(١) بەڵگە لەسەر ئەم مەرجانە ئەو ئایەتەیە کەلەپێشەوە نووسیمان ((الی أجل مسمی)) هەروەها لەحەدیسەکەدا: ((فی کیل معلوم ووزن معلوم، الی أجل مسمی))

(٢) واتە: ئەوەی کەسەلەمەکەی لەگەڵ دەکرێت سەرمایەکەی سەلەمەکە لەکاتی عەقدەکەدا وەریگرێت: ((من اسلف فلیسلف)).

(٣) سەلەم خۆی لەسەر شتێکی نەبووە لەکاتی عەقدا جالەبەر ئەوە نابێت (خیار الشرط)ی تیابێت.

(٤) ئایەتی: ﴿وان کنتم علی سفر ولم تجدوا کاتبا فرهان مقبوضة﴾ (البقرة: ٢٨٣) ڕەهن لەسەفەروغەیری سەفەردا دروستە.

بوخاری (١٩٦٢) موسلم (١٦٠٣) ((ان النبی (ﷺ) اشتری طعاما من یهودی الی أجل ورهنه درعاً من حدید)).

وَلِلرّاهِنِ الرُّجوعُ فيهِ مالم يَقبِضْه، وَلايَضمَنُه المُرتَهِنُ إلاّ بِالتَّعَدّي، وَإذا قَبَضَ بعضَ الحَقِ لمْ يَخرُجْ شَيئٌ مِن الرَّهنِ حَتىٰ يَقضِيَ جميعَه.

(فصلٌ) وَالحِجرُ علىٰ سِتةٍ: الصَّبِيِّ، والمَجنونِ، والسَّفيهِ المُبَذِّرِ لِمالِهِ، والمُفلِسِ الذي ارتَكَبتهُ الديونُ، والمريضِ المَخوفُ عليهِ فيما زادَ علىٰ الثُلُثِ، والعبدُ الذى لم يُؤذَنْ لهُ في التِجارَةِ.

---

خاوەن ڕەهن بۆی هەیە پاشگەزببێتەوە ئەگەر وەرنەگیرابێت، ئەوەی ڕەهنەکە وەردەگرێت ئەگەر بەئەنقەست نەی فەوتێنێ زامن نابێت،[1] وەئەگەر بەشێکی قەرزەکەی وەرگرتەوە ئەوا ڕەهنەکە بەتاڵ نابێتەوە تاهەمووی وەرنەگرێتەوە.

(باس) شەش کەس ڕێگای تەسەڕوف کردنیان لێدەگیرێت و نابێت هیچ کڕین و فرۆشتنێك ئەنجام بدەن: منداڵ شێت، ئەو نەزانەی کەسەروەتی بەفیڕۆ ئەدات[2]، ئەو کەسەی هیچی بەدەستەوە نەماوەو قەرز بەسەریا کەڵەکەی کردووە[3]، نەخۆش لەسەرەمەرگدا[4] ئەگەر لەسێیەك زیاتر تەسەڕوف بکات[5]، کۆیلە ئەگەر ئیزن نەدرابێت بازرگانی بکات.

---

(١) ابن حيان (١١٢٣) الحاكم (٢/٥١) ((لايغلق الرهن من صاحبه له غنمه وعليه غرمه))

(٢) ئایەتی: ﴿ولاتؤتوا السفهاء اموالكم التى جعل الله لكم قياماً﴾ (النساء: ٥)

﴿فان كان الذى عليه الحق سفيها أو ضعيفا أولا يستطيع ان يمل هو فليملل وليه بالعدل﴾ (البقرة: ٢٨١)

﴿وابتلوا اليتامى حتى اذا بلغوا النكاح فان آنستم منهم رشداً فادفعوا اليهم اموالهم﴾ (النساء: ٦)

ئەم ئایەتە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ئەوەی کەئەگەر یەکێك عەقڵی تەواو نەبێت هەڵسوکەوتی ڕێك وپێك نەبێت سەروەتی نادرێتە دەست و مەنعی لەسەر دائەنرێت.

(٣) مالك عن عمر (ﷺ) انه قال: ((ألا ان الاسيفع.. اسيفع جهينة رضى من دينه وأمانته أن يقال: سبق الحاج فادان معرضا عن الوفاء فأصبح وقدرين به فمن كان له عنده شيئ فليحضر غدا فانا بائعوا ماله وقاسموه بين غرمائه ثم اياكم والدين فان اوله هم وآخره حزن))

(٤) واتە ئەو نەخۆشی‌یەی کەدەبێتە هۆی مردن.

(٥) بوخاری (١٢٣٣) موسلم (١٦٢٨) ((عن سعد بن ابى وقاص (ﷺ) قال: كان رسول الله (ﷺ) يعودنى عام حجة الوداع من وجع اشتد بى فقلت: انى قد بلغ بى من الوجع وأنا ذومال ولايرثنى الا ابنة افأ تصدق بثلثى مالى؟ قال: لا فقلت بالشطر؟ قال: لا ثم قال: الثلث والثلث كبير أو كثير انك ان تذر ورثتك اغنياء خير من أن تذرهم عالة يتكففون الناس))

وَتَصَرّفُ الصّبيّ والمجنونِ والسّفيهِ غيرُ صحيحٍ، وتَصَرّفُ المُفلِسِ يَصِحُ في ذِمتِهِ دونَ اعيانِ مالِهِ، وتَصرفُ المَريضِ فيما زادَ على الثلثِ مَوقوفٌ على إجازَةِ الوَرَثَةِ مِن بَعدِهِ، وتَصرفُ العَبدِ يكونُ في ذِمتِهِ يُتبَعُ بِهِ بعدَ عِتقِهِ.

(فصلٌ) ويَصِحُّ الصُّلحُ مَعَ الإقرارِ في الأموالِ، وما أفضىٰ إليها وهُوَ نَوعانِ: إبراءٌ ومُعاوَضَةٌ؟

فالإبراءُ: إقتِصارُهُ مِن حَقِهِ علىٰ بَعضِهِ، ولايجوزُ تَعليقُهُ علىٰ شَرطٍ.

والمُعاوَضَةُ: عُدولُهُ عن حَقِهِ إلىٰ غيرِهِ، ويَجري عَليهِ حُكمُ البَيعِ.

ئەو تەسەڕوفەی منداڵو شێتو نەزانی بەفیڕۆدەر بیکەن بەتاڵەو دروست نی‌یە، تەسەڕوفی موفلیس دروستە بەڵام لەءزدەیا (ذمە) دەبێت نەك لەماڵەکەی‌دا، ئەگەر نەخۆش لەزیاتر لەسێ‌یەکی ماڵەکەی تەسەڕوف کردبێت ئەو زیادەیە پەیوەستە بەڕازی بوونی وەرەسەکان دوای مردنی، هی کۆیلەش لەعودەیایەتی ئەگەر ئازادکرا ئەوا داوای لێدەکرێت جێبەجێی بکات.

(باس) سوڵح: واتە ڕێککەوتن: بریتی‌یە لەکۆتایی پێهێنانی دووبەرەکی نێوان دوو کەس. ئەمە کارێکی ڕاستو دروستە بەمەرجێك داوالێکراو (مدعی علیە)دان بەوەدا بنێت کەئەو شتەی داوای لێدەکرێت لەسەریەتی. ڕێککەوتن لەسەرپارەو هەرشتێکی‌تر کەئەنجامەکەی بکاتەوە پارە دەکرێت.[1] سوڵح دووجۆرە:

١- ابراء: واتە گەردن ئازایی لەبەشێکی حەقەکەی‌و وەرگرتنی بەشەکەی تر. لێرەدا نابێت بەستنەوەی بەمەرجی تیابێت.

٢- معاوضة: واتە گۆڕینی قەرزەکە بەشتێکی‌تر وەك پارە بەخانو یاشتێکی‌تر لێرەدا ئەبێت هەموو مەرجەکانی فرۆشتنی تیابێتەدی.[2]

(١) وەك ئەوەی یەکێك (قصاص)ی لەسەر یەکێك بێت لەباتی کوشتنەوەی لەسەر پارە (صلح) بکەن.

ئایەتی: ﴿والصلح خير﴾ (النساء: ١٢٨)

الترمذی (١٣٥٢) ((والصلح جائز بين المسلمين الا صلحاً حرم حلالا أو أحل حراماً والمسلمون على شروطهم الا شرطاً حرم حلالاً أو أحل حراماً))

(٢) وەك پەشیمان بوونەوە ـ مەرج دانان ـ گێڕانەوەی کاڵای عەیب دار...

**وَيَجوزُ لِلإنسانِ أَن يُشرِعَ رَوشَناً في طَريقٍ نافِذٍ بِحَيثُ لايَتَضَرَّرُ المارُّ بِه، ولايَجوزُ في الدَّربِ المُشتَرَكِ إلا بِإذنِ الشُّرَكاءِ.**

**وَيَجوزُ تَقديمُ البابِ في الدَّربِ المُشتَركِ ولايَجوزُ تَأخيرُه إلا بِإذنِ الشُّرَكاءِ.**

**(فَصلٌ) وَشَرائِطُ الحَوالَةِ أَربَعةُ أشياءَ: رِضا المُحيلِ، وقبولُ المُحتالِ، وكَونُ الحَقِّ مُستَقِرّاً في الذِمةِ، وإتِّفاقُ مافي ذمةِ المُحيل والمُحالِ عليهِ في الجِنسِ، والنوعِ، والحُلولِ، والتأجيلِ. وتَبرأُ بها ذمةُ المُحيل.**

هەموو کەسێك بۆی هەیەو دەتوانێت لەسەر دیوارەوە دەربچێتە سەر شەقامی گشتی ئەگەر دەرنەچوو[1] بەمەرجێك زیان لەڕێبواران نەدات[2]. بەڵام لەو کۆڵانانەی کەدەرناچن و چەندماڵێك تیایدا هاوبەشن ئەوە دەرچوون دروست نی یە بێ ئیزنی هاوبەشەکان، لەو کۆڵانە هاوبەشانەدا دروستە دەرگا بەرێتە پێشەوە بەڵام بردنە دواوەی بێ ڕەزامەندی هاوبەشەکان دروست نی یە.

(باس) (حوالە) واتە گواستنەوەی قەرزێك لەعۆدەی یەکێکەوە بۆ ئەستۆی یەکێکی تر[3] چوار مەرجی هەیە: دەبێت قەرزارەکە ڕازی بێت، خاوەن قەرزەکەش قبوڵی بکات، قەرزەکەش لەعۆدەی قەرزارەکەدا جێگیر بووبێت.

هەردوو قەرزەکە لەم شتانەدا وەك یەك بن: جنس، جۆر، حازری ماوەداری، بەهۆی حەواڵەوە هیچ شتێك لەسەر قەرزارەکە نامێنێت،

(١) واتە لەسەقفەکەوە دەربچێتە دەرەوە سەر ڕێگا. دەبێت ئەوەندە بەرزبێت کەڕێبوار بەسواری سەری نەیگاتێ.

((انه (ﷺ) نصب بیده میزابا فی دار عمه العباس (ﷺ) وکان شارعاً الی مسجد رسول الله (ﷺ))).

(٢) ئەگەر زیانی ئەگەیاند بەڕێبواران یان دەیڕوانی بەسەر ماڵانی تردا ئەوە دروست نی یە و دەبێ مەنع بکرێت.

ابن ماجه ((٢٣٤٠ ـ ٢٣٤١) ((لاضرر ولاضرار))

(٣) بوخاری (٢١٦٦) ((ان رسول الله (ﷺ) قال: مطل الغنی ظلم فاذا أتبع احدکم علی ملیئ فلیتبع))

الامام احمد (٤٦٣/٢) ((واذا أحیل احدکم علی ملیئ فلیحتل))

(فصلٌ) ويَصِحّ ضَمانُ الديونِ المُستَقِرَّةِ في الذِمةِ إذا عُلِمَ قَدرُها.
ولِصاحِبِ الحقِ مُطالَبةُ مَنْ شاءَ مِنَ الضّامِنِ وَالمضمونِ عنهُ إذاكانَ الضَّمانُ علىٰ مابَيَّنا، وإذا غَرِمَ الضّامِنُ رَجَعَ علىٰ المَضمونِ عنهُ إذا كانَ الضَّمانُ والقضاءُ بإذنِهِ ولايَصِحّ ضَمانُ المَجهولِ، ولا مالَم يَجِبْ إلا دَرْكَ المَبيعِ.

(باس) (ضمان) واته: يەكێك بەڵێن بدات كەلەبری ئەو حەقەی كەلەسەر يەكێكیترە ئەم، حەقەكە بدات، يان بچێتە ژێر ئەوەی كەيەكێك لەكاتێكی دياريكراودا ئامادەبكات.

هەر قەرزێك لەعۆدەی يەكێكیتردا جێگیر بووبێ و بزانرێت چەندە، ئەوە دروستە زەمان (ضمان) بكرێت.[1] خاوەن قەرز بۆی هەيە داوا لەزامنەكەو لەقەرزارەكە بكات[2]، (كاميان ئارەزوو بكات؟ ئەگەر زەمانەكە (ضمان) بەوشێوەيە بوو كەباسمان كرد. ئەگەر زامن كردنەكەو قەرزدانەوەكە بەئيزنی قەرزارەكە بوو ئەوا دوای قەرزدانەوەكە، زامن بۆی هەيە بچێتەوە سەر قەرزارەكە. زامن كردنی شتی نەزانراو دروست نیيە، هەروەها شتێك كەبەتەواوی جێگیر نەبووبێت[3]، زامن كردنی دروست نیيە بێجگە لەوەی كەپێی دەوترێت: (ضمان الدرك)[4] زامن كردنی شتی فرۆشراو.

(١) بوخاری (٢١٦٨) سلمة بن الاكوع (ﷺ): ((كنا جلوساً عند النبی (ﷺ) اذ أتی بجنازة فقالوا صل عليها فقال: ((هل عليها دين؟)) قالوا: لا قال: ((فهل ترك شيئاً؟)) قالوا: لا، فصلی عليه. ثم أتی بجنازة أخری فقالوا يارسول الله صل عليها قال: ((هل عليه دين؟)) قيل: نعم قال: ((فهل ترك شيئاً؟)) قالوا: ثلاثة دنانير فصلی عليها ثم أتی بالثالثة فقالوا صل عليها قال: ((هل ترك شيئاً؟)) قالوا: لا قال: ((فهل عليه دين؟)) قالوا: ثلاثة دنانير قال: ((صلوا علی صاحبكم)). قال ابوقتادة: صل عليه يارسول الله وعليّ دينه فصلی عليه))
ئايەتی: ﴿ولمن جاء به حمل بعير وانا به زعيم﴾ (يوسف: ٧٢)

(٢) الترمذی (١٢٦٥) ((العارية مؤداة والزعيم غارم)). واتە: كەفيلەكە زامنەو پێويستە لەسەری مادام بووە بە((زامن)) قسەكەی بەرێتەسەر.
احمد (٣/٣٣٠) بەابوقتا دەیووت: (الان بردت عليه جلده)

(٣) وەكو ئەوەی بڵێت: هەر قەرزێك بدەيت بەفلان من زامنم، ئەمە دروست نیيە چونكە قەرزەكە جێگیرنەبووە.

(٤) بەم شێوەيە: بەكڕيارێك دەڵێت من زامنم ئەگەر ئەو شتەی كەكڕيوتە عەيب دار بوو يان هەر گرفتێكی هەبوو. دیارە ئەمە ئێستا جێگیرنەبووە بەڵام لەبەر زەرورەت دروستە.

(فَصلٌ) والكفالةُ بالبَدَنِ جائزةٌ إذاكانَ على المَكفولِ بِهِ حقٌّ لِآدَمِيٍّ.

(فصلٌ) وللشَّرِكةِ خمسُ شرائطَ: أن يكونَ على ناضٍّ مِنَ الدَّراهِمِ والدّنانيرِ، وأن يَتَّفِقا في الجنسِ والنوعِ، وأن يَخلِطا المالَينِ وأن يأذَنَ كلُّ واحدٍ منهما لِصاحِبِهِ في التَّصَرُّفِ، وأن يكونَ الرِّبحُ والخُسرانُ على قَدرِ المالَينِ. ولكلِّ واحدٍ منهما فسخُها متى شاءَ، ومَتى ماتَ أحدُهما بَطَلَت؟

(فصلٌ) وكلُّ ما جازَ للإنسانِ التَّصرُّفُ فيه بنفسِه جازَ لَه أن يُوَكِّلَ فيه

---

(باس) کەفالەت: بریتی‌یە لەوەی یەکێك ببێت بەکەفیل بۆ حازرکردنی یەکێکی‌تر لەکات‌و شوێنی دیاریکراو [1] ئەمە دروستە بەمەرجێك ئەو حەقەی کەلەسەر کەفالەت بۆ کراوەکەیە پەیوەندی بەحەقی ئادەمیزادەوە بێت. واتە کەفالەتی حەقی خوایی دروست نی‌یە.

(باس) شەریکایەتی: واتە چەند کەسێك پارەیان هەیەو تێکەڵاوی دەکەن بۆ ئەوەی موعامەلەی پێ‌بکەن.[2]

شەراکەت پێنج مەرجی هەیە: سەرمایەکە، پارەی نەقدینە (نەختینە) بێت واتە درهەم و دینار، ئەو ماڵەی کەتیا شەریکن جنس‌و جۆریان یەك بێت، ماڵەکانیان تێکەڵ بکەن.

هەرکامێکیان ئیزنی ئەوەی تر بدات کەتەسەڕوف بکات، قازانج‌و زەرەر بەپێی سەرمایەی هەر یەکێکیان دەبێت. هەر کامێکیان بۆی هەیە شەراکەتەکە هەڵبوەشێنێتەوە. بەمردنی یەکێکیان بەتاڵ دەبێتەوە.

(باس) وەکالەت: بریتی‌یە لەوەی یەکێك ئیش‌وکارەکانی خۆی دەداتە دەست یەکێکی‌تر کەبۆی ئەنجام بدات هەر شتێك مرۆڤ بتوانێت خۆی تەسەڕوفی تیابکات دەتوانێت وەکیلی بۆ بگرێت

---

(١) ئایەتی ﴿فخذ احدنا مكانه انا نراك من المحسنين﴾ (يوسف: ٧٨)

(٢) ابوداود (٣٣٨٣) ((ان الله يقول: أنا ثالث الشريكين مالم يخن احدهما صاحبه فاذا خانه خرجت من بينهما))

أَو يَتَوَكَّلَ. والوَكالَةُ عقدٌ جائِزٌ ولِكُلٍّ مِنهما فسخُها متى شاءَ. وَتنفَسِخُ بِمَوتِ أَحدِهما، والوكيلُ أَمينٌ فيما يَقبِضُهُ وفيما يَصرِفُه ولايَضمَنُ إلاّ بِالتَّفريطِ.

ولايَجوزُ أن يبيعَ ويَشتَرِيَ إلا بِثلاثَةِ شرائِطَ: أَن يَبيعَ بِثَمَنِ المِثْلِ وأَن يَكونَ بِنقدِ البَلَدِ، ولايجوزُ أَن يَبيعَ مِن نَفسِهِ ولايُقِرُّ علىٰ مُوَكِّلِه إلا بِإذنِه.

(فصلٌ) والمُقَرُّ به ضَربان:

---

یان ببێت بەوەکیل تیایدا، [1] وەکالەت عەقدێکی جەوازیە واتە واجب نیە هەر کامێکیان بیەوێت و ع کات ئارەزووبکات دەتوانێت هەڵیبوەشێنێتەوەو بەمردنی هەر کامێکیان هەڵدەوەشێتەوە. وەکیل بەئەمین دائەنرێ ع لەوەی وەریدەگرێ ع لەوەی سەرفی دەکات و لەکاتی فەوتان دا زامن نابێت مەگەر کەم تەرخەمی بکات.

وەکیل بەسێ مەرج دەتوانێت کڕین و فرۆشتن ئەنجام بدات: بەنرخی ڕۆژ موعامەلە بکات، بەپارەی باوی وڵاتەکە ئیش بکات،و بەهیچ جۆرێك نابێت شت بەخۆی بفرۆشێت.

وەکیل بۆی نیە ئیقرار لەسەر ئەوکەسە بکات کەکردوویەتی بەوەکیل مەگەر خۆی ڕازیبێت.

(باس) ئیقرار: [2] بریتیە لەوەی کەیەکێك پێبەوەدابنێت کەحەقی یەکێکی تری لەسەرە. ئەوشتەی کەدانی پیائەنێت دوو جۆرن:

---

(١) بوخاری (٢١٨٢) موسلم (١٦٠١) ((كان لرجل على النبى (ﷺ) سن من الابل فجائه يتقاضاه فقال: أعطوه فطلبوا سنه فلم يجدوا له الاسنا فوقها فقال: أعطوه. فقال: أوفيتنى أوفىالله بك قال: ان خياركم أحسنكم قضاء))

ئەمە وەکالەتە لەدانەوەی قەرز بۆ کڕین و فرۆشتنیش ئەمە بەڵگەیە:

الترمذى (١٢٥٨) عروة البارقى (ﷺ): ((دفع الى رسول اله (ﷺ) ديناراً لأشترى له شاة فاشتريت له شاتين فبعت احدهما بدينار وجئت بالشاة والدينار الى رسول الله (ﷺ) فذكرت له ماكان من أمرى فقال: ((بارك الله لك فى صفقة يمينك)) )).

بوخاری (٢١٨٦) موسلم (١٤٢٥) ((جاءت امرأة الى رسول الله (ﷺ) فقالت: يارسول الله انى قد وهبت لك من نفسى، فقال رجل: زوجنيها قال: ((قد زوجناكها بما معك من القرآن))

ئەمە وەکالەتە لەژن مارەکردن دا.

(٢) ئایەتی: ﴿كونوا قوامين بالقسط شهداء لله ولو على أنفسكم﴾ (النساء: ١٣٥)

حەدیسی: ((أغديا أنيس على امرأة هذا فان اعترفت فارجمها فغدا عليها فاعترفت، فأمربها رسول الله (ﷺ) فرجمت)) بوخاری (٢٥٧٥) موسلم (١٦٩٧).

حَقُّ اللهِ تَعالَى وَحَقُّ الآدَمِيّ فَحَقُّ اللهِ تَعالَى يَصِحُّ الرُّجوعُ فيهِ عَنِ الإقرارِ بِه. وَحَقُّ الآدَمِيّ لايَصِحُّ الرجوعُ فيهِ عنِ الإقرارِ بِه. وَتَفتَقِرُ صِحَّةُ الإقرارِ إلى ثَلاثَةِ شَرائِطَ: البلوغُ، العقلُ، الإختيارُ. وإن كانَ بِمالٍ اُعتُبِرَ فيهِ شرطٌ رابعٌ وهو الرُّشدُ.

إذا أقَرَّ بِمَجهولٍ رُجِعَ إليهِ في بَيانِهِ، وَيَصِحُّ الإستِثْناءُ في الإقرارِ إذا وَصَلَهُ بِه، وهو في حالِ الصِّحَّةِ وَالمَرَضِ سَواءٌ.

(فصلٌ) وكلّ مايُمكِنُ الإنتِفاعُ بِه مَعَ بقاءِ عَينِهِ جازَتْ إعارَتُهُ.

---

حەقی خوایی، حەقی ئادەمیزاد.

حەقی خوایی: دەتوانێت لەئیقرارەکەی پەشیمان ببێتەوە[1] بەڵام حەقی ئادەمیزاد: بۆی نی‌یە لەئیقراری پەشیمان بێتەوە. بۆ ئەوەی ئیقرار دروست بێت پێویستی بەسێ مەرج هەیە: باڵقی، ئەقڵ، بەئارەزووی خۆی بێت.[2]

ئەگەر ئیقرارەکە پەیوەندی بەپارەو ماڵەوە هەبوو ئەوا مەرجی چوارەمیش پێویستە ئەویش ئەوەیە کەنابێت (حجر)ی لەسەربێت.

ئەگەر ئیقراری بەشتێك کرد کەنەزانراو بوو ئەوا پرسیاری لێ ئەکرێت تاڕوونی بکاتەوە. لەئیقراردا دروستە دان پیانەر (مقر) لێدەرکردن (الاستثناء) بکات بەمەرجێك یەکسەر ئەو قەسەیە بکات لەمەشدا جیاوازی نێوان حاڵەتی تەندروستی و نەخۆشی نی‌یە.[3]

(باس) خواستن: بریتی‌یە لەوەی شتێك لەیەکێك بخوازیت تەنها بۆ سوود لێ وەرگرتن بەڵام شتەکە هیچ کەم نەکات وپاشان بدرێتەوە خاوەنەکەی.

هەرچی سوودی لێ وەربگیرێت لەگەڵ مانەوەی شتەکە دروستە بخوازرێت[4]

---

(١) بوخاری (٤٩٧٠) موسلم (١٦٩١) الترمذی (١٤٢٨) ((أنه لما وجد مس الحجارة فر فأدركوه ورجموه واخبر بذلك رسول الله (ﷺ) فقال: ((هلا تركتموه)) )).

(٢) واتە: نابێت ئیقرارەکەی بەزۆر پێ کرابێت.

ابن ماجه (٢٠٤٤) ((ان الله تجاوز لأمتي عما توسوس به صدورها مالم تعمل بـه أو تتكلم به وما استكرهوا عليه)) تەنانەت ئیقرار بـە کوفریش کەبەزۆربێت ئیعتبار ناکرێت: ﴿الا من اكره وقلبه مطمئن بالايمان﴾ (النحل: ١٠٦)

(٣) مەبەست: نەخۆشی سەرەمەرگە.

(٤) ئایەتی: ﴿ويمنعون الماعون﴾ (الماعون: ٧).

دیارە مەبەست ئەو شتانەیە کە ئەراوسێ لەیەکتری دەخوازن بوخاری (٢٤٨٤) موسلیم (٢٣٠٧) ((إنه (ﷺ) إستعار فرساً من طلحة (رضي الله عنه) فركبه)).

إذا كانَتْ مَنافِعُه آثاراً. وتَجوزُ العارِيَةُ مُطلَقةً ومُقَيَّدَةً بِمُدَّةٍ وهيَ مَضمونَةٌ علىٰ المُستَعيرِ بِقيمتِها يومَ تَلَفِها.

(فصلٌ) ومَن غَصَبَ مالاً لِأحدٍ لَزِمَهُ رَدُّهُ، وَأَرشُ نقصِه وأُجرَةُ مِثلِه. فإنْ تَلِفَ ضَمِنَهُ بِمثلِه إن كانَ لَه مِثلٌ أو بِقيمَتِه إن لم يَكُنْ لهُ مِثلٌ أكثَرَما كانَت مِن يَومِ الغَصبِ إلىٰ يومِ التَّلَفِ.

(فصلٌ) والشُّفعَةُ واجِبَةٌ بالخُلطَةِ دونَ الجِوارِ، فيما يَنقَسِمُ دونَ مالا يَنقَسِمُ، وفي كلِّ مالا يُنقَلُ مِن الأرضِ كالعِقارِ وَغيرِه،

---

ئەگەر سوودەكانی بریتی بێت لەبەكار هێنانی [1]. خواستن بۆ ماوەیەكی دیار یان نادیار دروستە، ئەگەر ئەو شتە فەوتا، ئەبێت وەرگر (المستعیر) نرخەكەی بداتەوە، بەنرخی ئەو ڕۆژەی تیا فەوتاوە. [2]

(باس) الغصب: زەوت كردن: بریتی‌یە لەوەی كە یەكێك حەقێكی یەكێكی تر داگیر بكات. ئەگەر یەكێكماڵی كەسێكی تری داگیر كرد پێویستە بەزووترین كات بیداتەوە [3] وباربووی كەم وكوڕی یەكانی بۆ بكاتەوە كرێی ئەو ماوەیەشی بداتێ ئەگەر فەوتا ئەبێت شتێكی وەك ئەو شتەی بۆ پەیدا بكاتەوە. ئەگەر هەبوو ئەگینا ئەبێت نرخەكەی بداتێ. زۆر ترین نرخ حیساب دەكرێت لە ڕۆژی داگیر كردنەوە تا ڕۆژی فەوتان.

(باس) (الشفعة) هەڵگرتنەوە: بریتی‌یە لەوەی كەبەشەموڵكی یەكێك كە فرۆشراوە بەكەسی سێیەم شەریكەكە هەڵی دەگرێتەوە.

شوفعە لەو موڵكەدایە كە هاوبەشە نەك بۆ دراوسێ، لەوشتانەدا كە توانای دابەشكردنی هەیە نەك ئەوەی كە دابەش نەكرێت، هەروەها لەو شتانە دایە كە نەتوانرێ بكوێزرێتەوە وەك زەوی.

---

(١) واتە: ئەو شتانەی كەبە بەكار هێنان ئەفەوتێن ئیستعارە ناكرێن وەك مۆم، خواردن.. بەڵام ڕاست وایە كە دەرەخت دروستە ئیعارە بكرێت بۆ ئەوەی بەرەكەی بخوات چونكە درەختە كە نافەوتێت.

(٢) أبو داود (٢٥٦٢) ((أنه (ﷺ) إستعار يوم حنين من صفوان بن أمية أدراعا فقال له: أغصب يا محمد (ﷺ)؟ فقال: لا، عارية مضمونة)).

(٣) أبوداود (٣٥٦١) الترمذي (١٢٦٦) ((على اليد ما أخذت حتى تؤدي)) داگیر كردن گوناهی كەبیرەیە ئایەتی ﴿ولا تأكلوا أموالكم بينكم بالباطل﴾ (البقرة: ١٨٨).

موسليم (١٢١٨) ((أن دماءكم وأموالكم وأعراضكم حرام عليكم كحرمة يومكم هذا في بلدكم هذا))

بِالثَّمَنِ الَّذي وَقَعَ عليهِ البَيعُ. وهي على الفَورِ فإن أخَّرَها مع القُدرَةِ عليها بَطَلَت.

وإذا تَزَوَّجَ إمرَأَةً على شِقصٍ أَخَذَهُ الشَّفيعُ بِمَهرِ المِثلِ وإن كانَ الشُّفعاءُ جَماعةً إستَحَقّوها على قَدَرِ الأملاك.

(فَصلٌ) وَلِلقِراضِ أربعةُ شَرائِطَ: أن يكونَ على ناضٍّ مِنَ الدَّراهِمِ وَالدَّنانيرِ، وأن يَأذَنَ رَبُّ المالِ لِلعامِلِ في التصرُّفِ مُطلقاً او فيما لايَنقَطِعُ وُجودُهُ غالِباً. وأن يَشتَرِطَ لَهُ جُزءً مَعلوماً مِنَ الرِّبحِ وأن لا يُقَدَّرَ بِمُدَّةٍ، ولاضَمانَ على العامِلِ إلا بعُدوانٍ. وإذا حَصَلَ رِبحٌ وخُسرانٌ جُبِرَ بِالرِّبحِ.

---

بەو نرخەی کەپێی فرۆشراوە، [٢١] دەبێت زۆر بە زوویی بکرێت، ئەگەر دواخرا وتواناشی هەبوو ئەوا شوفعە کە بەتاڵە.[٢]

ئەگەر یەکێك لەشەریکەکان ژنێکی لەسەر بەشێکی موڵکەکە مارەکردبوو واتە لەبری مارەیی، ئەوا شەریکەکەی تر هەڵی ئەگرێتەوە بە (مهر المثل) ئەگەر ئەوانەی موڵکە کە هەڵدەگرنەوە زۆر بوون ئەوا هەریەکە وبەقەدەر بەشەکەی خۆی بەری دەکەوێت.

(باس) : القراض: قانزانج بەشەراکەت: بەوە دەڵێن: کەسێك ماڵی خۆی بدات بە یەکێکی تر بۆ ئەوەی بازرگانی پێوە بکات قانزاجەکەی بۆ هەردوولایان بێت. [٣]

(قراض)چوار مەرجی هەیە: ئەبێت سەرمایەکە درهەم ودیناری ئاڵتونو زیوی بێ غەش بێت، خاوەن ماڵەکە ئیزنی ئەو کەسەبدات کە بەئارەزووی خۆی تەسەڕوف بکات یان لەوەشتانەدا کە زوربەی وەخت دەست ئەکەون، ئەبێت بەشێکی دیاریکراوی بۆ ببڕێتەوە [٤] لەقازانجەکە نابێت ماوەی دیاری کراوی بۆ دابنرێت. بە کرێ گیراو زامن نابێت لەفەوتانی ماڵەکە ئەگەر کەم تەرخەمی نەکردبێت. ئەگەر قازانجو زەرەر هەبوو ئەوا زەرەرەکە بە قازانج پردەکرێتەوە.

---

(١) بوخاری (٢١٣٨) موسلیم (١٦٠٨) ((قضى رسول الله (ﷺ) بالشفعة من كل مالم يقسم، في أرض أو ربع أو حائط وإذا وقعت الحدود وصرفت الطرق فلا شفعة)).

(٢) إبن ماجه (٢٥٠٠) ((الشفعة كحل العقال)).

(٣) ئەم شتە لە (إجماع)ەوە هاتووە الصنعاني دەفەرموێت: موسڵمانان هەموویان یەك رایان هەیە ئەویش ئەوەیە كە ئەم جۆرە (معاملە)یە دروستە ئیسلام پێی رازییە. (الموطأ) (٢/٦٨٧) تكملة المجموع (١٤/١٩١).

(٤) وەك نیوە یان سێ یەك.

(فَصلٌ) والمُساقاةُ جائِزَةٌ علىٰ النَّخلِ والكَرمِ ولَها شَرطانِ: أَحدُهُما أَن يُقدِّرَها بِمُدةٍ مَعلومَةٍ، والثَّاني أَن يُعيِّنَ لِلعامِلِ جُزءً مَعلومًا مِنَ الثَّمَرةِ. ثُمَّ العَملُ فيها علىٰ ضَربَينِ: عَمَلٌ يَعودُ نَفعُهُ إِلىٰ الثَّمَرةِ فَهو علىٰ العامِلِ، وعملٌ يَعودُ نَفعُهُ إلىٰ الأَرضِ فهو عَلىٰ رَبِّ المالِ.

(فَصلٌ) وكُلُّ ما أَمكَنَ الإِنتِفاعُ بِه مَعَ بَقاءِ عَينِه صَحَّتْ إجارَتُه

(باس) باخەوانی: بەوە دەڵێن کە خاوەنی باخێك ڕێك بکەوێت لەگەڵ یەکێکی تردا کە خزمەتی باخەکەی بۆ بکات وئاوی بدات بەمەرجێك بەشێکی دیاریکراوی لەبەرەکەی بداتێ.

باخەوانی تەنها لە داری خورما وترێ دایەو [1] و دوو مەرجی هەیە:

١- ئەبێت ماوەکە دیاری بکرێت وزانراوبێت.

٢- بەشێکی دیاریکراو لەبەرەکە بۆ کرێکارەکە دابنرێت.

ئیشی باخەوانی دووجۆرن:

١- ئەوەی کە سوودی بۆ بەرەکە هەیە، ئەوە لەسەر کرێکارەکەیە.

٢- ئەوەی کە سوودی بۆ زەوی‌یەکە هەیە ئەوەیان لەسەر خاوەن سەرمایەکەیە...

(باس) الإجارة: بەکرێ دان: بەوە دەڵێن یەکێك عەقدێك لەگەڵ یەکێکی تردا دەکات لەسەر ئەوەی کەشتێکی بداتێ تا سوودی لێ وەربگرێت بەرامبەر کرێ‌یەکی دیاریکراو؛ هەرشتێك بتوانرێت سوودی لێ وەربگیرێت وشتەکەش وەك خۆی بمێنێتەوەو نەفەوتێ بەکرێ دانی دروستە [2]

(١) بوخاری (٢٢٠٣) موسلیم (١٥٥١) ((أن رسول الله (ﷺ)أعطى خيبر بشطر ما يخرج منها من زرع أو ثمر)) وفي رواية لمسلم: ((دفع إلى يهود خيبر نخل خيبر وأرضها على أن يعملوها من أموالهم وإن لرسول الله (ﷺ) شطرها)) لە مەوە دەردەکەوێت کە بۆ زەراعەتیش ئەبێت ئەگەر لەناو درەختەکان دا بێت.

(٢) ئایەتی: ﴿فإن أرضعن لكم فآتوهن أجورهن﴾ (الطلاق: ٦) بوخاری (٢١٥٠) ((أنه (ﷺ) قال: ((قال الله تعالى : ثلاثة أنا خصمهم يوم القيامة: رجل أعطى بي ثم غدر، ورجل باع حرا فأكل ثمنه، ورجل أستأجر أجيرا فاستوفى منه ولم يعطه أجره)).

بوخاری (٢١٥٩) موسلیم (١٢٠٢) ((أحتجم النبي (ﷺ) وأعطى الحجام أجره ولو علم كراهيته لم يعطه)).

إذا أُجِّرَتْ منفعتُه بأحدِ أمرين: بمدةٍ أو عملٍ، وإطلاقُها يقتضي تعجيلَ الأجرةِ إلا أن يشترطَ التأجيلَ.

وَلا تَبطُلُ الإجارةُ بموتِ أحدِ المتعاقدَين، وتبطلُ بتلفِ العينِ المستأجرة، ولاضمانَ على الأجيرِ إلا بعُدوان.

(فصلٌ) والجَعالةُ جائزةٌ وهوَ: أن يشترطَ في ردِّ ضالتِه عِوَضاً معلوماً فإذا ردَّها استحقَّ ذلكَ العِوَضَ المشروطَ.

(فصلٌ) وإذا دفعَ إلى رجلٍ أرضًا ليزرعَها وشرَطَ له جُزءًا معلومًا من رَيعِها لم يجُز، وإن أكراهُ إيّاها بذهبٍ أو فضةٍ، أو شرَطَ لهُ طعامًا معلومًا في ذمتِه جاز.

بەمەرجێك سوود لێ وەرگرتنەكەی بەیەكێك لەم دوو شتە دیاری بكرێت: یان بەماوە یان ئەنجامی دانی كارێك ئەگەر لەعەقدەكەدا باسی دواخستنی كرێ نەكرابوو ئەوا ئەبێت بەزوویی كرێ یەكەی بداتێ بەمردنی لایەكیان عەقدەكە بەتاڵنابێتەوە بەڵام بەفەوتانی شتە بەكرێ دراوەكە بەتاڵ دەبێتەوە. بەكرێ گیراو زامن نابێت مەگەر كەم تەرخەمی كردبێت.

(باس) الجعالة: (بۆ بڕێنەوە) بریتی‌یە لەوەی كەسێكماڵێكی دیاریكراو بڕیار بدات بۆ كەسێك كە شتێكی بۆ بدۆزێتەوە.

بۆ بڕێنەوە دروستە وەهەركاتێكیش ئەو كەسە شتە بزربووەكەی بۆ هێنایەوە ئەبێت ئەو مەبەلەغەی بداتی كە بۆی بڕیار داوە. [1]

(باس) ئەگەر یەكێك پارچە زەوی‌یەك بدات بەیەكێكی‌تر بۆ ئەوەی بۆ چینێ بەرامبەر بە بەشێكی دیاریكراو لەبەرهەمی زەوی‌یەكە، ئەوە دروست نی‌یە، [2] بەڵام ئەگەر بەكرێ بیداتێ بەرامبەر پارەیان خواردەمەنی یەكی مەعلوم لە عۆدەیا ئەوە دروستە. [3]

(١) بوخاری (٢١٥٦) موسلیم (٢٢٠١) ((إن نفرا من أصحاب النبي (ﷺ) استضافوا قوما فلم يضيفوه فلدغ سيدهم فرقاه أحد الصحابة بالفاتحة على قطيع من غنم فشفى وأخذوا الجعل وأخبروا بذلك النبي (ﷺ) فقال: ((قد أصبتم أقسموا واضربوا لي معكم سهما)).

(٢) بوخاری (٢٢١٤) موسلم (١٥٤٨) ((كنا نحاقل الأرض على عهد رسول الله (ﷺ) فنكريها بالثلث والربع والطعام المسمى فجاء ناذات يوم رجل من عمومتي فقال: نهانا رسول الله (ﷺ) عن أمركان لنا نافعا، وطواعية الله ورسوله أنفع لنا: نها نا عن أن نحاقل بالأرض فنكريها على الثلث والربع والطعام المسمى وأمر رب الأرض أن يزرعها أو يزرعها وكره كراءها وماسوى ذلك)).

(٣) موسليم (١٥٤٩) ((أن النبي (ﷺ) نهى عن المزراعة وأمر بالمؤاجرة وقال: لابأس بها)).

(فَصلٌ) وإحياءُ المَواتِ جائزٌ بشرطَينِ: أن يكونَ المُحيي مُسلِمًا، وأن تكونَ الأرضُ حُرَّةً لَم يَجرِ عليها مِلكٌ لِمُسلِمٍ. وَصِفَةُ الإحياءِ ما كانَ في العادَةِ عِمارَةً لِلمُحيا.

وَيَجبُ بَذلُ الماءِ بِثَلاثَةِ شَرائِطَ: أن يَفضُلَ عَن حاجتِهِ وأن يَحتاجَ إليهِ غيرُهُ لِنَفسِهِ أو لِبَهيمَتِهِ، وأن يكونَ مِمّا يُستَخلَفُ في بِئرٍ أو عَينٍ.

(فَصلٌ) وَالوقفُ جائزٌ بِثلاثَةِ شَرائِطَ: أن يكونَ مِمّا يُنتَفَعُ بِهِ مَعَ بَقاءِ عَينِهِ، وأن يكونَ على أصلٍ مَوجودٍ وفَرعٍ لا يَنقَطِعُ، وأن لايكونَ في مَحظورٍ.

---

(باس) إحياء الأموات: ئاوەدانكرنـەوەی وێرانـە: بـەوە دەڵێـن یـەكێك زەوی یەكی بێ خاوەن ئاوەدان بكاتەوە.

ئاوەدانكرنـەوە دروستە وئەم دوو مەرجەی هەیـە: ئەبێت ئاوەدانكەرەوە كـە موسڵمان بێت، زەوی‌یەكەش موڵكی كەس نەبێت‌و هەرگیز خاوەندار نەبوو بێت.[1] شێوەی ئاوەدانكرنەوە بەوە دەبێت كە كارێكی وابكات كە بەپێ عورف‌و عادەت پێ‌ی بوترێت ئاوەدانكرنەوە.

واجبە ئاو بەر بدرێتەوە بۆ كەسانی تر بەم سێ مەرجەیە: ئاوەكە لە خۆی زیادبێت وپێویستی پێ‌ی نەبێت، خەڵكانی تر پێویستی‌یان پێ بێت چ بۆ خۆیان چ بۆ ئاژەڵەكانیان، ئاوەكە جێگەی پڕ ببێتەوە وەكو ئاوی بیریان كانیاو.[2]

(باس) (الوقف) بریتی‌یە لـە ڕاگرتنی ماڵێك كە قابیلی ئەوە بێت سوودی لێ وەربگیرێت وخۆشی نەفەوتێ‌و بۆشتێكی باش خەرج بكرێت.

وەقف: بەسێ مەرج دروستە: ئـەوە شـتە كـە لێـی لێ وەربگـیرێت‌و خۆشـی نەفەوتێ، وەقفەكە لەسەر یەكێك بێت كەلەكاتی وەقفەكەدا مـەوجودبێت و دوای ئەویش نەبڕێتەوە وەك لایەن،[3] بۆ شتێكی حەرام نەبێت.

---

(١) بوخاری (٢٢١٠) ((من أعمر أرضا ليست لأحد فهو أحق))..واتە: ئەو لە یەكێكی تر لە پێشترە بۆ سوود لێ وەرگرتنی چ بی چێنێ چ بینای تیا بكات.

(٢) بوخاری (٢٢٣٠) موسلم (١٠٧) ((ثلاثة لا ينظر الله إليهم يوم القيامة ولا يزكيهم ولهم عذاب أليم: رجل كان له فضل ماء بالطريق فمنعه من إبن سبيل...)) موسليم (١٥٦٥) ((نهى رسول الله (ﷺ) عن بيع فضل الماء)).

(٣) مەبەست جۆری ئـەو كەسـانەی كەوەقفەكـە ئـەیان گرێتـەوە وەك هـەژاران، قوتابیان... ئەگەر لەگەڵ كۆمەڵێكی قابیلی بڕانەوە لایەنێكی تری وای دەستنیشان كرد كـە نەبڕێتەوە ئەوە دروستە وەك ئەوە بڵێت: وەقفی مناڵەكانم بێت دوای ئەوانیش بۆ هەژاران.

وَهو عَلیٰ ماشَرَطَ الواقِفُ: مِن تَقدیمٍ، أَو تَأخیرٍ، أَو تَفضیلٍ،

(فَصلٌ) وكُلُّ ماجازَ بَیعُهُ جازَتْ هِبَتُهُ، ولا تَلزَمُ الهِبَةُ إلا بالقَبضِ، وَإذا قَبَضَها المَوهوبُ لَهُ لَم یَكُنْ لِلواهِبِ أَن یَرجِعَ فیها إلا أَن یكونَ والداً.

وەقف دەبێت بەپێی ئەو مەرجانە بێت کە وەقف کەرەکە دای ناون [1] وەك: پێش خستنی یەکێك لە یەکێکیتر، یان دوواخستنی، یان هەموو وەك یەك یەکسان بن، یان یەکێکیان زۆرتری بدرێتێ.

(باس) الهبة: پێبەخشین: بەوە دەڵێن کەسێك شتێك یان قەرزێك یان خاوەن کەڵکێك بکات بە موڵکی یەکێکی تر بە خۆڕایی هەرشتێك فرۆشتنی دروست بێت ئەوا بە خشینی دروستە. [2]

بەڵام عەقدەکە دانامەزرێت تاوەرنەگیرێت [3] هەرکاتێك پێبەخشراو شتەکەی وەرگرت ئەوا خاوەنەکەی بۆی نییە پەشیمان بێتەوە مەگەر ئەو کەسە باوك بێت. [4]

(١) بوخاری (٢٥٨٦) موسلیم (١٦٣٢) ((أن عمر بن الخطاب (ﷺ)أصاب أرضا بخیبر فأتى النبي (ﷺ) یستأمره فیها فقال: یا رسول الله إني أصبت أرضا بخیبر لم أصب مالا قط أنفس عندي فما تأمرني به؟ قال: ((أن شئت حبست أصلها وتصدقت بها)) قال: فتصدق بها عمر: إنه لایباع ولا یورث ولایوهب وتصدق بها في الفقراء وفي القربى وفي سبیل الله و إبن السبیل والضیف لا جناح على من ولیها أن یأكل منها بالمعروف ویطعم غیر متمول)).

موسلیم (١٦٣١) ((إذا مات الإنسان أنقطع عمله إلا من ثلاثة: من صدقة جاریة أو علم ینتفع به أو ولد صالح یدعوله)) مەبەست لە (صدقة جاریة) بەپێی ڕای زاناکان وەقفە.

(٢) ئایەتی: ﴿وآتوا النساء صدقاتهن نحلة فإن طبن لكم عن شئ منه نفسا فكلوه هنیئا مریئا﴾ (النساء: ٤)

بوخاری (٢٤٣٧) موسلیم (١٦٢٢) ((أن النبي (ﷺ) كان إذا أتي بطعام سأل عنه فإن قیل هدیة أكل منها وإن قیل صدقة لم یأكل منها)).

(٣) الحاكم (٢/١٨٨) ((أنه (ﷺ) أهدى للنجاشي مسكا فمات قبل أن یصل إلیه فقسمه النبي (ﷺ) بین نسائه)).

(٤) بوخاری (٢٤٤٩) موسلم (١٦٢٢) ((العائد في هبته كا لكلب یقئ ثم یعود في قیئه)) أبوداود (٣٥٣٩) الترمذي (٢١٣٣) ((لا یحل لرجل أن یعطي عطیة أو یهب هبة فیرجع فیها إلا الوالد فیما یعطي لولده)).

وَإِذا أَعمَرَ شَيئًا أَو أَرقَبَهُ كانَ لِلمُعمَرِ أَو لِلمُرقَبِ وَلِوَرَثَتِه مِن بَعدِه.

(فَصلٌ) وَإِذا وَجَدَ لُقَطَةً فِي مَواتٍ أَو طَرِيقٍ فَلَهُ أَخذُها أَو تَركُها وَأَخذُها أَولىٰ مِن تَركِها، إِن كانَ عَلىٰ ثِقَةٍ مِنَ القِيامِ بِها.

وَإِذا أَخَذَها وَجَبَ عَلَيهِ أَن يَعرِفَ سِتَّةَ أَشياءَ: وِعاءَها، وَعِفاصَها وَوِكاءَها، وَجِنسَها، وَعَدَدَها وَوَزنَها.

وَيَحفَظُها فِي حِرزِ مِثلِها ثُمَّ إِذا أَرادَ تَمَلُّكَها عَرَّفَها سَنَةً عَلىٰ أَبوابِ المَساجِدِ وَفِي المَوضِعِ الَّذِي وَجَدَها فِيهِ فَإِن لَم يَجِد صاحِبَها كانَ لَهُ أَن يَتَمَلَّكَها بِشَرطِ الضَّمانِ.

---

(باس): عمری ورقبنی: واته بەخشین بۆماوەی ژیان.

هەرکەسێك شتێك بەیەکێکی تر ببەخشێت بەم جۆرە پێی بڵێت: ئەو شتەم پێ بەخشیت بەڵام کەمردیت ئەگەڕێتەوە بۆ خۆم یان تا من ئەمرم کەمردم دەبێتەوە هی وەرەسەکانم ئەوا ئەو عەقدە دائەمەزرێت ولە هەموو حاڵەتێکدا ئەبێتەماڵی پێ بەخشراوەکەو دوای خۆشی بۆ وەرەسەکانی.[1]

(باس) (اللقطة) شتی داکەوتوو: بریتیبە لە ماڵێك یا هەرشتێکی تری خاوەن رێزو بەنرخ دار کە بەهۆی ئاگالێ نەبوونەوە بەجێ مابیت لەشوێنێك دا کەشوێنی عادەتی هەڵگرتنی ئەوشتە نەبێت.

هەرکەسێك شتێك بدۆزێتەوە لە ناو زەوی‌یەکی بێ خاوەن دا یان لە سەر رێگای‌گشتی ئەوا بۆی هەیە هەڵی بگرێتەوەو دەشتوانێت هەڵی نەگرێتەوە، بەڵام ئەگەر متمانەی بە خۆی هەبێت کە بەئەرکەکانی هەڵبسێت ئەوا هەڵگرتنەوەی باشترە. لەدوای هەڵگرتنەوەی دەبێت بەوردی سەرنجی شەش شت لەبارەیەوە بدات: کیسەکەی، دەم بەستی کیسەکە، ئەو قاپەی شتەکەی تیایە، جۆری شتەکە، ژمارەی، کێشەکەی،[2] پاشان ئەبێت لەو شوێنەی کە شایانی هەڵگرتنی ئەو شتەیە بیپارێزێت هەرکاتێکیش ویستی بۆخۆی هەڵی بگرێتەوە دەبێت بۆماوەی ساڵێك لەبەر دەرگای مزگەوتان یان لەوشوێنەی کە تیادۆزیویەتیەوە ناو نیشانی هەڵبدات ئەگەر هە رخاوەنی نەبوو ئەوا دەبێتە موڵکی خۆی بەڵام بەمەرجی زامنی.

---

(١) موسلیم (١٦٢٥) ((أيما رجل أعمر رجلا عمري له أولعقبه فقال: أعطيتكها وعقبك مابقي منكم أحد فإنها لمن أعطي وعقبه لا ترجع إلى صاحبها من أجل أنه أعطى عطاء وقعت فيه المواريث))

أبوداو (٣٥٨٨) الترمذي (١٣٥١) ((العمرى جائزة لأهلها والرقبي جائزة لأهلها)).

(٢) بوخاری (٢٢٩٦) موسليم (١٧٢٢) (أن النبي (ﷺ) سئل عن اللقطة الذهب أو الورق، فقال: ((أعرف وكاءها وعفاصها ثم عرفها سنة فإن لم تعرف فأستنفقها ولتكن وديعة عندك فإن جاء طالبها يوما من الدهر فأدها إليه)).

وَاللُّقطَةُ على أربعةِ أضرُبٍ:

احدُها: مايَبقى علىٰ الدَّوامِ فهٰذا حُكمُهُ.

والثّاني: مالا يَبقىٰ كالطَّعامِ الرَّطبِ فهوَ مُخَيَّرٌ بينَ أكلِهِ وغرمِهِ أو بَيعِهِ وحِفظِ ثَمَنِهِ.

والثّالثُ: مايَبقىٰ بِعلاجٍ كالرُّطَبِ فَيفعَلُ المَصلَحةَ: مِن بَيعِهِ وحِفظِ ثَمَنِهِ أو تَجفيفِهِ و حِفظِهِ.

والرّابعُ: ما يَحتاجُ إلىٰ نَفَقَةٍ كالحَيوانِ وهو ضَربان:

حَيوانٌ لا يَمتَنِعُ بِنَفسِهِ: فهو مُخَيَّرٌ بينَ أكلِهِ وغُرمِ ثَمَنِهِ أو تَركِهِ والتَّطَوُّعِ بالإنفاقِ عَليهِ أو بيعِهِ وحِفظِ ثَمَنِهِ.

---

شتیداکەتوو چوار جۆرن:

یەکەم: ئەوەیە کە قابیلی فەوتان نییە وبەمانەوە هیچی لێ نایەت حوکمی ئەم جۆرەمان باس کرد.

دووەم: قابیلی مانەوەی نییە بەزوویی دەفەوتێت وەك خواردەمەنی شلە- تەڕ- لەم جۆرەدا هەڵگرەوە بۆی هەیە خۆی بی خوات و دوایی بی بژێرێت یان بیفرۆشێت و نرخەکەی هەڵبگرێ.

سێیەم: قابیلی مانەوەیە بەڵام بەدەستکارییەوە وەك خورمای روتاب لەم جۆرەدا کارێك لەم دوانە هەڵدە بژێرێت کامەیان سوودی پتر بوو: بیفرۆشێت ونرخەکەی هەڵبگرێت یان وشکی بکاتەوە ئینجا هەڵی بگرێت.

چوارەم: پێویستی بەوە هەیە پارەی بۆ خەرج بکرێت وەك گیانلەبەر ئەمیش دوو بەشن:

گیانلەبەرێکە ناتوانێت بەرگری لەخۆی بکات.[1] لێرەدا هەڵگرەوە سەرپشکە یان بیخوات ونرخەکەی ببژێرێت یان بی هێڵێتەوە وبەپیاوەتی وخۆڕایی نەفەقەی بکێشێت یان بیفرۆشێت و نرخەکەی هەڵبگرێ.

---

(١) حديث خالد (ﷺ) (وسأله عن ضالة الإبل فقال: ((مالك ولها دعهافإن معها حذاءها وسقائها ترد الماء وتأكل الشجر حتى يجدها ربها)) وسأله عن الشاة فقال: ((خذها فإنما هي لك أو لأخيك أو للذئب)).

وَحَيوانٌ يُمتَنِعُ بِنَفسِهِ، فَإن وَجَدَهُ بالصَّحراءِ تَرَكَهُ وإن وَجَدَهُ في الحَضَرِ فهو مُخيَّرٌ بينَ الأشياءِ الثلاثةِ فيه.

(فصلٌ) وإذا وُجِد لَقيطٌ بِقارِعَةِ الطَّريقِ، فأَخذُهُ وتَربِيَتُهُ وكَفالَتُهُ واجِبَةٌ علىٰ الكِفايَةِ. ولا يُقَرُّ إلا في يَدِ أَمينٍ فإن وُجِدَ مَعَهُ مالٌ انفَقَ عليهِ الحاكِمُ منه، وإن لَم يوجَد مَعَهُ مالٌ فنَفَقَتُهُ في بيتِ المالِ.

(فَصلٌ) والوَديعَةُ أَمانَةٌ، ويُستَحَبُّ قبولُها لِمَنْ قامَ بِالأَمانَةِ فيها ولا يَضمَنُ إلاّ بالتَّعَدّي وقَولُ المودَعِ مَقبولٌ في رَدِّها علىٰ المودِعِ، وعليهِ أَن يَحفَظَها في حِرزِ مِثلِها، و إذا طولِبَ بها فلمْ يُخرِجْها –مَعَ القُدرةِ عليها– حتىٰ تَلِفَت ضَمِن.

---

جۆرەكەی تریان ئەوەیە كە توانای پاریزگاری كردنی لە خۆی هەیە جا ئەگەر لەدەشت و بیابان دا دۆزیەوە ئەبێت وازی لێ بێنێت بەڵام ئەگەر لەئاوەدانیدا دۆزیەوە ئەوا لەوسێ ڕێگایەی پێشوو سەرپشكە یەكێكیان هەڵدەبژێرێت.

(باس) ئەگەر یەكێك منداڵێكی لەسەرە ڕێگادا دۆزیەوە ئەوا هەڵگرتنەوەو بەخێوكردن و پارێزگاری لێ كردنی فەرزی كیفایەیە [1] ئەبیت لای یەكێكی دەستپاك و ئەمین دابنرێت. ئەگەر لەكاتی دۆزینەوەدا پارەو ماڵی لەگەڵ بوو ئەوا حاكمی وەخت بۆی خەرج ئەكات ئەگینا ئەبێت لە (بیت المال) خانەی دلرایی بۆی خەرج بكرێت. [2]

(باس) الودیعة: ماڵی ئەمانەت: بەوشتە دەڵێن كە یەكێك لای یەكێكی تری دائەنێت بۆ ماوەیەك دوایی لێی وەر دەگرێتەوە.

شتی دانراو ئەمانەتە لە ئەستۆی ئەو كەسەی لای دائەنرێت [3] وەرگرتنی كارێكی باشە بەتایبەت بۆ یەكێك كە متمانەی بە خۆی هەبێت، مەگەر ناپاكی بكات ئەگینا لەفەوتانی زامن نابێت ئەگەر ناكۆكی كەوتە نێوانیانەوە لەسەر گێڕانەوە، ئەوا قسەی ئەوكەسەی شتەكەی وەرگرتووە وەردەگیرێت. پێویستە شتەكە لەشوێنێكی شایان بەوشتەدا هەڵبكرێت.

ئەگەر داوای گێڕانەوەی لێ كرار وتوانای گێڕانەوەی هەبوو بەڵام نەی گێڕایەوە تاشتەكە فەوتا ئەوا ئەو كەسە زامن دەبێت.

---

(١) بۆ ئەوەی لە مردن بپارێزرێت ئایەتی: ﴿ومن أحياها فكأنما أحيا الناس جميعاً﴾ (المائدة: ٣٢)

(٢) ئیمامی عمر (خوای لێ ڕازی بێت) لەم بارەیەوە لە ئەصحابەی پرسی ئەوانیش ووتیان نەفەقەی ئەو منداڵانە لەسەر (بیت المال)ە.

(٣) ئایەتی ﴿فإن أمن بعضكم بعضا فليؤد الذي اؤتمن أمانته﴾ (البقرة: ٢٨٣).

أبوداود (٣٥٣٥) الترمذي (١٢٦٤) قال (ﷺ): ((إد الأمانة إلى من أئتمنك ولا تخن من خانك)).

# كتابُ الفرائضِ والوَصايا

والوارِثونَ مِنَ الرِّجالِ عَشَرةٌ: الإبنُ و إبنُ الإبنِ وإن سَفَلَ، والأَبُ والجَدُّ وإن عَلا، والأخُ، وإبنُ الأخِ وإنْ تَراخىٰ، والعمُّ، و إبنُ العَمِّ وإن تَباعَدَ، والزوجُ، والمَولىٰ المُعتِقُ،

**والوارِثاتُ مِنَ النِساءِ سَبعٌ:**

البنتُ، وبنتُ الإبنِ، والأمُّ، والجَدَّةُ، والأختُ، والزوجَةُ، والمَولاةُ المُعتِقَةُ.

ومَن لا يَسقُط بِحالٍ خمسةٌ: الزوجانِ، والأَبوانِ، وَوَلَدُ الصُلبِ.

ومَن لايَرِثُ بحالٍ سبعةٌ: العبدُ، والمُدَبَّرُ، وامُّ الولدِ، والمُكاتَبُ، والقاتِلُ، والمُرتَدُّ، واهلُ مِلَّتَينِ.

## باسی دابەشکردنی میرات و وەسیەت

میراتگر، لە پیاوان دا دە کەسن: کوڕ، کوڕی کوڕ با دووریش بێت، باوك، باپیر با دوویش بێت، برا، کوڕی برا با دوووریش بێت،[1] مام، کوڕەمام بادووریش بێت، مێرد، ئەوەی کۆیلە ئازاد دەکات:

**میراتگر لە ژنان دا حەوتن:**

کچ، کچی کوڕ، دایك، نەنك، خوشك، ژن، ئەوەی کۆیلە ئازاد دەکات.

ئەوانەی کە بەهیچ شێوەیەك لەمیرات بێ بەش ناکرێن پێنج کەسن: ژن ومێرد، دایك وباوك، منالی پلەیەك.[2]

ئەوانەش کە بەهیچ شێوەیەك میرات ناگرن حەوت کەسن: بەندە، بەندەی (مدبر، ام الولد، مكاتب)ن بکوژی مردوەکە، ئەوەی کەلە ئیسلامەتی پاشگەز دەبێتەوە، ئەوانەی کەلە ئاین دا جیاوازن.[4]

(١) وەك کوڕی کوڕی برا.

(٢) مەبەست کوڕو کچە.

(٣) الترمذي (٢١١٠) ((القاتل لايورث)).

(٤) واتە: وەك موسوڵمان وکافر. بوخاری (٦٣٨٣) موسليم (١٦١٤) ((لايرث المسلم الكافر ولا الكافر المسلم)).

وَأقربُ العَصَباتِ: الإبنُ، ثم إبنُه، ثُم الأبُ، ثم ابَوه، ثم الأخُ لِلأب والأُمِّ، ثم الأخُ لِلأبِ، ثـم إبـنُ الأخ لِـلأب والأمُ، ثـم إبـنُ الأخ لِـلأَب، ثـمَّ العَـم علـىٰ هـذا الترتيب، ثم ابنُه، فإن عُدِمَتِ العَصَباتُ فالمَولىٰ المُعتِق))

(فصلٌ) والفُروضُ المذكورةُ في كتابِ اللهِ سِتةٌ: النِصفُ، والربعُ، والثُمنُ، والثُلثانِ، والثلثُ، والسُدسُ.

فالنِصفُ فرضُ خمسةٍ: البنتُ، وبنـتُ الأبـنِ، والأخـتُ مـن الأبِ والأم، والأختُ من الأب، والزوجُ إذا لَم يَكُن مَعَهُ وَلَد؟

(عەصەبە) بەوكەسە دەوترێت كە بەشەميراتى ديارىكراويان نىيە. [1] بەپێى نزيكى يانەوە ئەمانەن: كوڕ، كوڕى كوڕ، باوك، باپير، براى باوك و دايكى، براى باوكى، برازاى باوكو دايكى، برازاى باوكى، مام بەوشێوەيە كەلە برادايە، كوڕەمام.

ئەگـەر ئەمانـە هيچيـان نـەبوون ئـەوا خـاوەنى بـەندەى ئـازاد كـراو مـيرات وەردەگرێت.

(باس) ئەوبەشە ميراتانەى كەلە قورئان دا [2] باسكراون شەشن: نيو، چارەك، هەشت يەك، دووسێ يەك، سێ يەك، شەش يەك.

نيو: بەشى پێنج كەسە: كچ، [3] كچى كوڕ، خوشكى دايك وباكى،[4] خوشكى باوكى، مێرد ئەگەر ژنەكەى منالى نەبوو بێت. [5]

(١) واتە پاش ئـەوەى ميراتگرەكـانى تـر بەشـەميراتى خۆيـان وەردەگـرن چىمايـەوە ئەمان وەرى دەگرن.

بوخارى (٦٣٥١) موسليم (١٦١٥) ((ألحقوا الفرائض بأهلها فما بقي فهو لأولى رجل ذكر))

(٢) ئايەتەكانى (١٠-١١-١٢) لەسورەتى النساء لەمەودوا ئەيان نووسين.

(٣) ئايەتى: ﴿وإن كانت واحدة فلها النصف﴾

(٤) ئايەتى: ﴿وإن أمرؤ هلك ليس له ولد وله أخت فلها نصف ماترك﴾ مەبەست خوشكى دايكو باوكى يان باوكىيە.

(٥) ئايەتى: ﴿ولكم نصف ماترك أزواجكم إن لم يكن لهن ولد﴾

الربع: فرضُ اثنينِ: الزوجُ مع الولدِ او ولدِ الإبنِ، وهو فرضُ الزوجةِ والزوجاتِ مع عدمِ الولدِ او ولدِ الإبنِ.
والثمنُ: فرضُ الزوجةِ والزوجاتِ مع الولدِ او ولدِ الإبنِ.
والثلثانِ: فرضُ اربعةٍ: البنتينِ وبنتي الإبنِ والأختينِ من الأَب والأُم، والأختينِ منَ الأبِ.
والثلثُ: فرضُ اثنينِ: الامُّ إذا لَم تُحجَبْ، وهو لِلإثنينِ فصاعِداً مِنَ الإخوة والاخواتِ من وَلَدِ الأمِ.
والسُدسُ فرضُ سبعةٍ: الأمُ مع الولدِ او ولدِ الإبنِ، او اثنينِ فصَاعداً مِن الإخوةِ والأخَواتِ،

---

چوارەك: بەشەمیراتی دووكەسە: مێرد ئەگەر ژنەكەی منالی هەبووبێت یان كوڕی ژنەكەی منالی هەبێت، ژن یان چەند ژنێك ئەگەر مێردەكەیان منالی نەبوو بێت یان كوڕەكەی منالی نەبێت.[1]
هەشت یەك: بەشەمیراتی ژنێك یان چەند ژنێكە لەگەڵ منالی مێردەكەیان یان منالی كوڕەكەی.[2]
دووسێیەك: بۆ چوار كەسە: دووكچ، دووكچە كوڕ،[3] دووخوشك لە دایكو باوك، دوو خوشكی باوكی.
سێیەك: بۆ دووكەسە: دایك ئەگەر لەمیرات بێ بەش نەكرابێت،[4]
دووبرایان دووخوشكی دایكی یان زیاتر.[5]
شەش یەك: بەشە میراتی حەوت كەسە: دایك لەگەڵ كوڕیان كوڕی كوڕدا یان لەگەڵ دوان یان زیاتر لە براو خوشك،[1]

---

(١) ئایەتی: ﴿فإن كان لهن ولد فلكم الربع مما تركن من بعد وصية يوصين بها أو دين ولهن الربع مما تركتم إن لم يكن لكم ولد﴾.
(٢) ئایەتی: ﴿فإن كان لكم ولد فلهن الثمن مما تركتم﴾.
ئایەتی: ﴿يوصيكم الله في أولادكم للذكر مثل حظ الأنثيين فإن كن نساء فوق اثنتين فلهن ثلثا ماترك﴾.
(٣) ئایەتی: ﴿وإن كانتا اثنتين فلهما الثلثان مما ترك﴾.
ئایەتی: ﴿فإن لم يكن له ولد وورثه أبواه فلأمه الثلث﴾.
(٤) ئایەتی: ﴿فإن كانوا أكثر من ذلك فهم شركاء في الثلث﴾.
(٥) ئایەتی: ﴿ولأبويه لكل واحد منهما السدس مما ترك أن كان له ولد﴾
ئایەتی: ﴿فإن كان له إخوة فلأمه السدس﴾.

وهو لِلجَدّةِ عِندَ عدمِ الأمِ، ولبنتِ الإبنِ معَ بنتِ الصُلبِ، وهو لِلأُختِ مِن الأبِ مع الأختِ من الأبِ والأمِ، وهو فرضُ الأبِ معَ الولدِ او ولدِ الإبنِ وفرضُ الجَد عندَ عدمِ الأبِ، وهو فرضُ الواحدِ مِن وَلد الأمِ وتَسقطُ الجَداتُ بالأمّ والأجدادُ بالأبِ. ويَسقطُ وَلدُ الأمِ أربعة: الولدِ، وولدِ الإبنِ، والأب، والجدِ.

ويَسقطُ الأخُ لِلأب والأمِ معَ ثلاثةٍ: الإبنِ وأبنِ الإبنِ، والأبِ.

ويَسقط ولدُ الأب بهؤلاءِ الثلاثةِ، وَبالأخِ لِلأبِ والأمِ.

وأَربعةٌ يُعَصّبونَ أخواتِهم: الأبنُ وإبنُ الإبنِ، والأخُ من الأبِ والأمِ والأخُ من الأَب.

واربعةٌ يَرِثونَ دونَ اخواتِهِم وهم: الأعمامُ، وبنو الأعمام، وبنو الأخِ، وعَصَباتُ المَولىٰ المُعتِق.

هەروەها بەشە میراتی نەنکە ئەگەر دایك نەمابێت، [1] کچی کوڕ لەگەڵ کچی خۆیدا، باوك لەگەڵ کوڕیان کوڕەزادا، باپیر ئەگەر باوك نەمابێت، [2] یەك برایان یەك خوشکی دایکی. [3]

ئەوانەی کە بەهۆی یەکێکی ترەوە لە میرات بێبەش دەبن ئەمانەن: نەنك لەگەڵ دایکا، باپیرە لەگەڵ باوکا، منالی دایك لەگەڵ چوار کەس دا: کوڕ، کوڕەزا، باوك، باپیر.

برای باوك ودایکی لەگەڵ سێکەسدا: کوڕ، کوڕەزا، باوك.

منالی باوك لەگەڵ ئەوسێ کەسەداو لەگەڵ برای باوك ودایکیا. [4]

چوار کەس هەن خوشکە کانیان دەکەن بە (عەصەبە):

کوڕ، کوڕەزا، برای باوكو دایکی، برای باوکی. [5]

چوار کەس هەن خۆیان میرات دەگرن بەڵام خوشکە کانیان میرات ناگرن:

مام- کوڕەمام، برازا، عەصەبەی ئازادکەری کۆیلە.

(١) أبوداود (٢٨٩٥) ((أن النبي (ﷺ) جعل للجدة السدس إذا لم تكن دونها أم)).

(٢) بوخاری (٦٣٥٥) ((پێغەمبەر (ﷺ) بەم شێوەیە حوکمی کردووە)).

(٣) ئایەتی: ﴿وإن كان رجل يورث كلالة أو أمرأة وله أخ أو أخت فلكل واحد منهما السدس﴾.

کلالە: ئەو کەسەیە کە نەئەسڵەو نەفەرعە مەبەست براوخوشکی دایکییە.

(٤) پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((فما بقي فهو لأولى رجل ذكر)).

(٥) ئایەتی: ﴿ويوصيكم الله في أولادكم للذكر مثل حظ الأنثيين﴾.

ئایەتی: ﴿وإن كانوا إخوة رجالا ونساء فللذكر مثل حظ الأنثيين﴾.

(فَصلٌ) وتَجوزُ الوَصِيَّةُ بِالمعلومِ والمَجهولِ والمَوجودِ والمَعدومِ وهِيَ من الثُّلثِ فإن زادَ وُقِفَ علىٰ إجازةِ الوَرَثَةِ. ولاتجوزُ الوَصِيَّةُ لِوارِثٍ إلا ان يُجيزَها باقي الوَرَثَةِ.

وتَصِحُّ الوَصِيَّةُ مِن كلِّ بالغٍ عاقلٍ، لِكُلِّ مُتَمَلِّكٍ وفي سَبيلِ اللهِ.

وتَصِحُّ الوَصِيَّةُ إلىٰ مَنِ اجتَمَعَتْ فيهِ خمسُ خِصالٍ: الإسلامُ، والبلوغُ، والعقلُ، والحُرِّيةُ، والأَمانَةُ.

---

(باس) وەسیەت: [1] لەشەرعدا بەوە دەڵێن: یەکێك حەقێکی خۆی بدات بە یەکێکیتر دوای مردنی.

وەسیەت بەشتی زانراوو نەزانراو وەوجودو نامەوجود دروستە، دەبێت لەسێ یەکی ماڵ تەجاوز نەکات [2] لەوە زیاتر، دەبێت وەرەسەکان ڕازی بن.

وەسیەتکەر ئەبێت باڵغو عاقڵ بێت، وەسیەت بۆ کراو دەبێت مافی [3] ئەوەی هەبێت کە ببێتە خاوەن موڵك. وەسیەت لەڕێی خودادا دروستە. ئەوکەسەی کەدەکرێت بە (وصی) واتە: سەرپەرشت، دەبێت: موسڵمان بێت، باڵغو ئاقڵو حوڕ (ئازاد)و دەست پاك بێت.

---

(١) ئایەتی: ﴿من بعد وصية يوصي بها أو دين﴾ (النساء: ١١).

بوخاری (٢٥٨٧) موسلیم (١٦٢٧) ((ما حق أمرئ مسلم له شئ يوصي فيه، يبيت ليلتين الا و وصيته مكتوبة عنده)).

(٢) بوخاری (٢٥٩١) موسلیم (١٦٢٨) سعد بن وقاص (ﷺ) (عادني النبي (ﷺ) فقلت: أوصي بمالي كله؟ قال:((لا)) قلت: فالنصف؟ قال: ((لا)) قلت: أبا الثلث؟ فقال: ((نعم والثلث كثير)) ).

(٣) أبوداود (٢٨٧٠) الترمذي (٢١٢١) ((أن الله أعطى كل ذي حق حقه، فلا وصية لوارث)).

الداقطني (١٥٢/٤) ((لاتجوز وصية لوارث إلا أن يشاء الورثة)).

# كتابُ النكاح ومايتَعلقُ بِه مِنَ الأحكام والقَضايا

النِكاحُ مُستَحَبٌ لِمَن يَحتاجُ إليه، وَيَجوزُ لِلحُرِ اَن يَجمَعَ بيَن اَربعِ حَرائِر، ولِلعَبدِ بيَن اثنَتَين.

ولا يَنكِحُ الحرُّ اَمَةً إلاّ بِشرطَين: عدمُ صِداقِ الحُرَّةِ، وخَوفُ العَنَتِ.

وَنظَرُ الرجلِ إلىٰ المرأةِ علىٰ سَبعةِ أَضرُب:

أَحدُها: نَظَرُهُ إلىٰ اَجنَبيَّةٍ لِغَيرِ حاجَة، فَغيرُ جائِز.

## باسى ژن ماره كردن و ئەو شتانەى كە پەيوەندى هەيە بەو مەسەلەيەوە

ژن هێنان بۆیەكێك پێویستی پێ ی هەبێت سوننەتێكی گەورەیە.[1] پیاوی حور دەتوانێت چوار ژن بەیەكەوە كۆبكاتەوە بەڵام كۆیلە نابێت لەدوو ژن زیاتر كۆبكاتەوە.[2] پیاوی حور نابێت ئافرەتی كۆیلە مارە بكات مەگەر تواناى مارەيى دانى ژنى حورى نەبێت لەگەڵ ئەوەشدا مەترسى تووش بوونى خراپە (زینا)ى هەبێت.[3]

سەیر كردنى ئافرەت لەلایەن پیاوەوە حەوت جۆرى هەیە:

یەكەم: سەیركردنى ئافرەتى بێگانەو هیچ پێویستى بەوە نەبێت، ئەم جۆرەيان حەرامەو دورست نىيە.[4]

(١) ئایەتی: ﴿وإنكحوا الأيامى منكم والصالحين من عبادكم وإمائكم إن يكونوا فقراء يغنهم الله من فضله﴾ (النور: ٣٢).

بوخاری (٤٧٧٩) موسلیم (١٤٠٠) ((يامعشر الشباب من إستطاع الباءة فليتزوج، فإنه أغض للبصر وأحصن للفرج ومن لم يستطع فعليه بالصوم، فإنه له وجاء)).

(٢) ئایەتی: ﴿فانكحوا ما طاب لكم من النساء مثنى وثلاث ورباع﴾ (النساء: ٣)

أبوداود (٢٢٤١) عن وهب الأسدي (ﷺ) قال: (أسلمت وعندي ثمان نسوة فذكرت ذلك للنبي (ﷺ) فقال: ((أختر منهن أربعا)) ).

(٣) ئایەتی: ﴿ومن لم يستطع منكم طولا أن ينكح المحصنات المؤمنات فمن ما ملكت أيمانكم من فتياتكم المؤمنات.. ذلك لمن خشي العنت منكم﴾ (النساء: ٢٥).

(٤) ئایەتی: ﴿قل للمؤمنين يغضوا من أبصارهم ويحفظوا فروجهم ذلك أزكى لهم﴾ (النور: ٣٠)

الثاني: نَظَرُه إلىٰ زَوجتِهِ أَو أَمَتِهِ، فيَجوزُ أَن يَنظرَ إلىٰ ماعَدا الفَرجِ مِنهُما.
والثالثُ: نَظَرُهُ إلىٰ ذواتِ مَحارِمِه، او امتِهِ المُزَوَّجةِ، فيَجوزُ فيما عَدا مابينَ السُرةِ والرُكبةِ.
والرابعُ: النظرُ لِأَجلِ النِكاحِ، فيَجوز إلىٰ الوجهِ وَالكَفين.
والخامسُ: النظرُ لِلمُداواةِ، فيَجوزُ إلىٰ المَواضِعِ التي يَحتاجُ إليها.
السادسُ: النظرُ لِلشَّهادَةِ او لِلمُعامَلَةِ، فيَجوزُ النَّظرُ إلىٰ الوجهِ خاصَّةً.
والسابعُ: النظرُ إلىٰ الأَمةِ عِند إبتياعِها، فيَجوزُ إلىٰ المواضِعِ التي يَحتاجُ إلىٰ تَقليبِها.

دووەم: سەیرکردنی ژنی خۆی یان کۆیلەی خۆی ئەوە سەیرکردنی هەموو شوێنێکیان دروستە بێجگە لە عەورەت یان.[1]
سێیەم: سەیرکردنی ئافرەتی مەحرەم یان کۆیلەی مێرددار ئەوە بێجگە لەنێوان ئەژنۆو ناوک نەبێت دروستە.[2]
چوارەم: سەیرکردن بۆ مارەکردن: تەنها بۆ دەمو چاوو دوو دەست دروستە.[3]
پێنجەم: سەیرکردنی بۆ تەداوی: بۆ ئەو شوێنانە دروستە کەپێ ویستی پێ‌ی هەیە.[4]
شەشەم: سەیرکردن بۆ شایەتی یان موعامەلە: تەنها بۆ دەم وچاو دروستە.
حەوتەم: سەیرکردنی کۆیلە لەکاتی کڕین یا: بۆ ئەو شوێنانە دروستە کە بۆ موعامەلە پێ کردنی پێویستن: دیارە نێوان ناوکو ئەژنۆ دروست نی‌یە.

(١) ئایەتی: ﴿ولا يبدين زينتهن إلا لبعولتهمن أو آبائهن أو آباء بعولتهن أو أبنائهن أو أبناء بعولتهن أو إخوانهن أو بني إخوانهن أو بني أخواتهن﴾ (النور: ٣١).
(٢) أبوداود (٤١١٣) ((إذا زوج أحدكم عبده أمته، فلا ينظر إلى عورتها، [وفي رواية] فلا ينظر إلى دون السرة وفوق الركبة)).
(٣) بوخاری (٤٨٣٣) موسلیم (١٤٢٥) ((أن إمرأة جاءت رسول الله (ﷺ) فقالت: يارسول اله جئت لأهب لك نفسي فنظر إليها رسول الله فصعد النظر إليها وصوبه ثم طأطأ رأسه)).
موسلیم (١٤٢٤) أبو هريرة (ﷺ) قال: (كنت عند النبي (ﷺ) فأتاه رجل فأخبره أنه تزوج أمرأة من الأنصار فقال له: ((أنظرت إليها؟)): قال: ((لا))، قال: ((فإذهب فأنظر إليها فإن في أعين الأنصار شيئا)).
الترمذی (١١٨٧) المغيرة بن شعبة (ﷺ) (أنه خطب إمرأة فقال له النبي (ﷺ):((أنظر إليها فإنه أحرى أن يؤدم بينكما)) ).
(٤) موسلیم (٢٢٠٦) ((أن أم سلمة (ﷺ) أستأذنت رسول الله (ﷺ) من الحجامة فأمر النبي (ﷺ) أبا طيبة أن يحجمها)).
دیارە ئەبێت یەکێکی مەحرەمی لەگەڵ بێت وئافرەتیش نە توانێت ئەو کارە بکات.
تا موسڵمان وەستا بێت نابێت غەیری موسڵمان ئەو کارە بکات.

(فَصلٌ) ولا يَصِحُّ عقدُ النِكاحِ إلا بِوَلِيٍ وشاهِدَي عَدلٍ، وَيفتَقِرُ الوَليّ وَالشاهدانِ إلىٰ سِتَةِ شَرائِطَ: الإسلامُ، والبلوغُ والعقلُ، والحُريةُ، والذكورة والعدالةُ، إلا انَّه لا يَفتَقِرِ نكاحُ الذِميةِ إلىٰ إسلام الوَليّ ولا نكاحُ الأَمَةِ إلىٰ عَدالَةِ السَيّد.

وَأولىٰ الوُلاةِ الأبُ، ثم الجَدُ ابو الأبِ، ثم الأخُ لِلأبِ والأمِ، ثم الأخُ للأبِ، ثم إبنُ الأخ للأبِ والأمِ، ثم إبنُ الأخ للأبِ، ثم العَمُ، ثم إبنُه علىٰ هذا الترتيب، فإذا عُدمَتْ العصباتُ فالمَولىٰ المُعتقُ، ثم عَصباتُه، ثُمَّ الحاكِمُ.

(باس) عەقدى ژن مارەكردن دروست نىيە ئەگەر (ولى) و دووشايەتى عادل نەبن، [1] وە دەبێت (ولى) و دووشايەتەكە ئەم شەش مەرجانەيان تيابێت: ئيسلامەتى، بالْغى، عەقلْ، حورەيەت، نێرين، عادل بن، بەلام بۆ مارەكردنى ئافرەتى (ذمية) پێويست ناكات (ولى) موسڵمان بێت، هەروەها مارەكردنى كۆيلە پێويست ناكات خاوەنەكەى عادل بێت. [2]

نزيكترين وەلى ئەمانەن: باوك، باوكى باوك، براى‌دايك‌و باوكى، براى باوكى، برازاى دايك‌و باوكى، برازاى باوكى. مام، كوڕەمام، بەو تەرتيبە كە گوترا. ئەگەر (عصبه) نەبوون‌ئەوا ئەوەى ئازادى كردووە، ئينجا عەصەبەكانى ئەو ئينجا حاكمى وەخت. [4]

(١) أبو حيان (١٢٤٧) ((لانكاح إلا بولي وشاهدي عدل وماكان من نكاح على غير ذلك فهو باطل)).

أبوداود (٢٠٨٥) الترذي (١١٠١) ((لانكاح إلا بولي)).

الدارقطني (٣/٢٢٧) ((لاتزوج المرأة المرأة ولا تزوج نفسها وكنا نقول: التي تزوج نفسها هي الزانية)).

(٢) ئايەتى: ﴿والمؤمنون والمؤمنات بعضهم أولياء بعض﴾ (التوبة: ٧١) شايەتى‌دان جۆرێكە لە ويلايەت لەبەر ئەوە ئەبيت موسڵمان بێت.

(٣) حەديسى ((لانكاح إلا بولي مرشد وشاهدي عدل)).

(٤) أبوداودا (٢٠٨٣) الترمذي (١١٠٢) ((فالسطان ولي من لا ولي له)).

وَلا يَجوزُ أَنْ يُصَرّحَ بِخطبَةِ مُعتَدَّةٍ، ويَجوزُ أَنْ يُعَرّضَ لها، وَيَنكِحَها بعدَ إنقضاءِ عِدَّتِها.

وَالنِّساءُ عَلىٰ ضَربين: ثَيِّباتٍ، وأَبكارٍ: فَالبِكرُ يَجوزُ للأَبِ والجَدِ إجبارُها عَلىٰ النِّكاحِ، والثَّيِّبُ لا يَجوزُ تَزويجُها إلا بَعدَ بُلوغِها وَإذنِها.

(فصلٌ) والمُحَرَّماتُ بِالنَّصِ اربَعَ عَشَرَةَ: سَبعٌ بِالنَّسَبِ وهُنَّ: الأمُ وإن علت، والبنتُ وإن سَفُلَت، والاُختُ، والخالةُ، والعَمَّةُ، وبنتُ الأخِ، وبنتُ الأُختِ.

واثنَتانِ: بالرِّضاعِ: الأمُ المُرضِعَةُ، والأُختُ مِن الرَّضاعِ.

---

ئافرەتی عیددە دار نا بێت ڕاستەو خۆ خوازبێنی بکرێت بەڵام دروستە ناڕاستەو خۆ خوازبێنی بکرێتو پاش تەواو بوونی عیددەکەی مارە بکرێت. (١)

ئافرەت دوو جۆرن: کچ ، بێوە ژن. باوكو باپیر دەتوانن بەزۆر کچ بدەن بەشوو، بەڵام بێوەژن مارە ناکرێت تا باڵغ نەبێتو خۆی ئیزنی (ولی) ئەدات. (٢)

(باس) ئەوانەی کەلە پیاوحەرامن: ومارە کردنیان دروست نی‌یە بەپێی دەقی قورئان (٣) چوارەدەکەسن: حەوتیان بەهۆی نەسەبەوە حەرامن: دایك بابەرەوژوریش بێت، کچ با زۆر بەرەو خواریش بێت، خوشك، خوشکی دایك، خوشکی باوك ، کچی برازا، کچی خوشك. (٤)

دووانیان بەهۆی شیر خواردنەوە حەرامن: دایکە شیردەرەکە، خوشکی شیریی. (٥)

---

(١) ئایەتی: ﴿ولا جناح عليكم فيما عرضتم به من خطبة النساء او أكننتم في أنفسكم علم الله أنكم ستذكرونهن ولكن لاتوا عدوهن سرا إلا أن تقولوا قولاً معروفا ولا تعزموا عقدة النكاح حتى يبلغ الكتاب أجله﴾ (البقرة: ٢٣٥).

(٢) موسليم (١٤٨٠) ((الثيب أحق بنفسها من وليها والبكر تستأمر وإذنها صماتها- وإذنها سكوتها)).

(٣) ئایەتەکانی (٢٢-٢٣) لە سورەتی النساء کەلەمەودوا کە بەش بەش دەیان نووسین.

(٤) ئایەتی: ﴿حرمت عليكم أمهاتكم وبناتكم وإخواتكم وعماتكم وخالاتكم وبنات الأخ وبنات الأخت﴾.

(٥) ئایەتی: ﴿وأمهاتكم اللاتي أرضعنكم وأخواتكم من الرضاعة﴾.

وَأربعٌ بِالمُصاهَرَةِ: امُّ الزوجةِ، والرَّبيبَةُ إذا دَخَلَ بِالأمِّ، وزوجةُ الأب، وزوجةُ الإبنِ.

و واحدةٌ مِن جِهةِ الجَمعِ: وهيَ اُختُ الزَّوجَة.

ولا يَجمَعُ بينَ المَراَةِ وعَمتِها ولا بينَ المراَةِ وخالَتِها.

ويَحرُمُ مِنَ الرِّضاعِ مايَحرُمُ مِنَ النَّسَبِ.

وتَرُدُّ المَراةُ بخمسَةِ عُيوبٍ: بالجنونِ، والجُذامِ، والبَرَصِ، والرَّتقِ، والقَرنِ،

---

چواريان بەهۆى ژن خوازىيەوە حەرامن: دايكى ژن (خەسو)، كچى ژن ئەگەر ژنەكەى گواستبێتەوە، ژنى باوك، ژنى كوڕ (بووك).(١)

يەكێكيان بەهۆى كۆكردنەوە لەگەڵ ئافرەتێكى تردا حەرامە: ئەويش خوشكى ژنەكە نابێت دووخوشك بەيەكەوە مارە بكات.(٢) هەروەها ژن لەگەڵ خوشكى باوكيا يان لەگەڵ خوشكى دايكا بەيەكەوە مارەناكرێت، لەيەك پياور كۆناكرێنەوە. (٣) ئەو حەوت كەسەى كە بەهۆى نەسەبەوە حەرامن بەهۆى شير خواردنيشەوە حەرامن. (٤)

پياو بۆى هەيە عەقدى نكاح بەتاڵ بكاتەوە ئەگەر ئەم پێنج لەكەيەى (عيب) لەژنەكەىدا بەدى بكات. شێتى گەڕى و گولى، بەڵەكى، عەورەتى بەهۆى گوشتى زيادەوە يان بەئێسقانەوە گيرابێت.(٥)

---

(١) ئايەتى: ﴿ولاتنكحوا ما نكح أباؤكم من النساء﴾

﴿وامهات نسائكم وربائبكم اللاتي في حجوركم من نسائكم اللاتي دخلتم بهن فإن لم تكونوا دخلتم بهن فلا جناح عليكم وحلائل إبنائكم الذين من أصلابكم﴾.

(٢) ئايەتى: ﴿وأن تجمعوا بين الأختين إلا ماقد سلف﴾.

(٣) بوخارى (٤٨٢٠) موسليم (١٤٠٨) ((لايجمع بين المرأة وعمتها ولابين المرأة وخالتها)).

(٤) بوخارى (٢٥٠٣) موسليم (٤١٤٤) ((أن الرضاعة تحرم ما يحرم من الولادة)).

بوخارى (٢٥٠٢) موسليم (١٤٤٧) ((قال النبي (ﷺ): في بنت حمزة: ((لا تحل لي يحرم من الرضاع ما يحرم من النسب، هي بنت أخي من الرضاعة)).

(٥) البيهقي (٢١٤/٧) ((أنه تزوج أمرأة من عفار فلما دخلت عليه رأى بكشحها بياضا فقال: إلبسي ثيابك والحقي بأهلك وقال لأهلها: دلستم على)).

مالك الموطأ (٥٢٦/٢) ((إيما رجل تزوج امرأة بها جنون أو جذام أو برص [وفي رواية] أو قرن فمسها فلها صداقها كاملا وذلك غرم لزوجها على وليها)).

وَيَرُدُّ الرَّجلُ بخَمسةِ عيُوبٍ: بالجنونِ، والجذامِ، والبَرَصِ، والجَبِّ، والعُنَّة.
(فَصلٌ) ويُستَحَبُّ تَسمِيَةُ المَهرِ في النِكاحِ، وإن لَم يُسَمِّ صَحَّ العَقدُ وَوَجَبَ المَهرُ بِثَلاثةِ اشياءَ: أن يَفرِضَهُ الزوجُ علىٰ نفسِهِ، او يَفرِضَهُ الحاكِمُ، او يَدخُلَ بِها فيَجِبُ مَهرُ المثلِ.

هەروەها ژنیش هەمان مافی هەیە ئەگەر ئەم پێنج لەکەیە لە مێردەکەیدا بەدی بکات: شێتی، گولی، بەڵەکی، عەورەتی بڕابێت، شلەپەتکەیی واتە توانای ئەنجام دانی کاری شەرعی نەبێت.[1]

(باس) باشتر وایە لەکاتی عەقدی (نکاحدا) مارەیی دەست نیشان بکرێت،[2] بەڵام ئەگەر باس نەکراوبوو ئەوا عەقدەکە دروستە.[3] وە مارەیی لەم حاڵەتەدا بەسێ شت واجب دەبێت کاتێك مێردەکە خۆی لەسەر خۆی فەرز بکات، یان حاکمی وەخت بڕیار بدات، یان ژنەکە بگوازرێتەوە ئیتر مارەیی وەك هاوەڵی خۆی (مهر المثل) واجب دەبێت.

(١) البيهقي (٧/٢٢٦) عن عمر (ﷺ): (أن إمرأة أتته فاخبرته أن زوجها لا يصل إليها فاجله حولا فلما أنقضي حول ولم يصل إليها خيرها فأختارت نفسها ففرق بينهما عمر وجعلها تطليقة بائنة).

(٢) ئایەتی: ﴿وآتوا النساء صدقاتهن نحلة﴾ (النساء: ٤)

بوخاری (٤٧٤١) موسلیم (١٤٢٥) (أتت أمرأة النبي (ﷺ) فقالت إنها وهبت نفسها لله ولرسوله فقال: ((مالي في النساء من حاجة)) فقال رجل: زوجينها قال: ((أعطها ثوبا)) قال: لا أجد قال: ((أعطها ولوخاتما من حديد، فأعتل له)) فقال: ((مامعك من القرآن؟)) قال: كذا وكذا قال: ((فقد زوجتكها بمامعك من القرآن)).

(٣) ئایەتی: ﴿لاجناح عليكم أن طلقتم النساء مالم تمسوهن أو تفرضوا لهن فريضة﴾ (البقرة: ٢٣٦)

**وَلَيسَ لِأَقلِّ الصِّداقِ ولا لِأَكثَرِهِ حَدٌّ، ويَجوزُ أَن يَتَزَوَّجَها علىٰ مَنفَعَةٍ مَعلومَةٍ**
**وَيسقُطُ بالطَّلاقِ قَبلَ الدُّخولِ بِها نِصفُ المَهرِ.**

**حەدوو سنوور بۆمارەیی نییە: واتە لەكەم وزۆریدا دەتوانرێت زۆر بێت یان كەم بێت [1]، دروستە عەقدی نیكاح لەسەر ئەوە بێت كە سوودێكی تایبەتی بەژنەكە بگات.[2]**

**ئەگەر پیاوێك ژنەكەی پێش گواستنەوە تەلاق بدات ئەوا نیوەی مارەیی یەكەی لەسەر لائەچێت.[3]**

(١) الترمذي (١١١٣) ((أن إمرأة من بني فزارة تزوجت على نعلين فقال رسول الله (ﷺ): ((أرضيت من نفسك ومالك بنعلين؟)) قالت: نعم فإجازه)).

ئايەتی: ﴿وآتيتم إحداهن قنطاراً﴾ (النساء: ٢٠)

الترمذي (١١١٤) ((عن عمر (ﷺ) قال: لا تغلوا صدق النساء فإنها لو كانت مكرمة في الدنيا أو تقوى في الآخرة لكان أولاكم بها رسول الله (ﷺ) ما أصدق رسول الله إمرأة من نسائه ولا أصدقت إمرأة من بناته أكثر من ثنتي عشرة أوقية))

ئوقية: بريتىيە لە (٤٠) درهەم هەمووی دەكاتە (٤٨٠)دەرهەم.

وإباشە مارەیی لە (١٠) درهەم كەمتر نەبێت ولە (٥٠٠) درهەم زیاتر نەبێت.

(٢) وەك ئەوەی فێری قورئانی بكات یان كارێكی تایبەتی بۆ ئەنجام بدات.

(٣) ئايەتی: ﴿وإن طلقتموهن من قبل أن تمسوهن وقد فرضتم لهن فريضة فنصف مافرضتم﴾ (البقرة: ٢٣٧)

مارەیی دوای گواستنەوە یان مردن هەمووی واجب دەبێت:

أبوداود (٢١١٤) الترمذي (١١٤٥) (سئل إبن مسعود عن رجل تزوج إمرأة ولم يفرض لها صداقا ولم يدخل بها حتى مات فقال: لها مثل صداق نسائها وعليها العدة ولها الميراث).

ئايەتی: ﴿وإن طلقمتوهن من قبل أن تمسوهن وقد فرضتم لهن فريضة فنصف مافرضتم﴾ (البقرة: ٢٣٧).

وقال عمر (ﷺ): (إيما رجل تزوج إمرأة فمسها فلها صداقها كاملا).

(فصلٌ) والوَليمَةُ علىٰ العُرسِ مُستَحَبَّةٌ والإجابَةُ إليها واجِبَةٌ إلا مِن عُذر.

(فَصلٌ) والتَّسوِيَةُ في القَسمِ بينَ الزَّوجاتِ واجِبَةٌ، ولايَدخُلُ علىٰ غيرِ المَقسومِ لَها لِغيرِ حاجَةٍ، وإذا أرادَ السَّفَرَ أقرَعَ بينَهُنَّ وخَرَجَ بالَّتي تَخرُجُ لَها القُرعَةُ. وَإذا تَزَوَّجَ جَديدَةً خَصَّها بسَبعِ لَيالٍ إن كانَتْ بكراً وَبثَلاثٍ إن كانَتْ ثَيِّباً.

(باس) داوەتی ژن هێنان خێری زۆرە، [1] هەرکەسێکیش بانگ بکرێت بۆ ئەو داوەتە واجبە لەسەری بچێت [2] و دوانەکەوێت مەگەر عوزرێکی هەبێت. [3]

(باس) ئەگەر یەکێك لە ژنێك زیاتری هەبوو پێویستە لەسەری بەیەکسانیو وەك یەك، شەو لایان بێت، [4] وەلە نۆرەی ئەوەیاندا کە دەبێت لای بێت نابێت بچێتە لای ئەوی تریان مەگەر بۆ کارێکی زەرووری بێت. هەرکاتێکیش چوو بۆ سەرفەر،ئەبێت قورعەیان بۆ بکات کامەیان دەرچوو ئەوەیان لەگەڵ خۆیدا ببات. [5]

ئەوەی کە ژنی تر دەهێنێت دەبێت حەوت شەوی بۆ تەرخان بکات ئەگەر ئەو ژنە تازەیەیە کچ بوو، ئەگەر بێوەژن بوو ئەوا تەنها سێ شەوی بۆ دائەنێت. [6]

(١) بوخاری (٤٨٦٠) موسلیم (١٤٢٧) ((أن النبي (ﷺ) رأى على عبدالرحمن بن عوف أثر صفرة، فقال: ((ما هذا؟)) قال: تزوجت إمرأة على وزن نواة من ذهب، قال: ((بارك الله لك أولم ولوبشاة)) )).

(٢) بوخاری (٤٨٧٨) موسلیم (١٤٢٩) قال رسول الله (ﷺ): ((إذا دعي إحدكم إلى الوليمة فليأتها، [وفي رواية مسلم (١٤٢١)] ومن لم يجب الدعوة فقد عصى الله ورسوله)).

(٣) وەك ئەوەی شتی ناشەرعی لەو شوێنەدا هەبێت وەك ئێستاکە ئەوشتانە بەزۆری دەبینرێن.

(٤) أبوداود (٢١٣٣) الترمذی (١١٤١) ((من كانت له إمرأتان فمال إلى أحدهما جاء يوم القيامة وشقه مائل)). ((كان رسول الله (ﷺ) يقسم فيعدل ويقول: ((أللهم هذا قسمي فيما أملك فلا تلمني فيما تملك ولا أملك)) )).

(٥) بوخاری (٣١٩٠) موسلیم (٢٧٧٠) ((كان رسول الله (ﷺ) إذا أراد السفر أقرع بين نسائه فأيتهن خرج سهمها خرج بها)).

(٦) بوخاری (٤٩١٦) موسلیم (١٤٦١) عن أنس (ﷺ) قال: (من السنة إذا تزوج البكر على الثيب أقام عندها سبعا ثم قسم، وإذا تزوج ثيبا أقام عندها ثلاثا ثم قسم قال: أبو قلابة لو شئت لقلت: إن أنساً (ﷺ) رفعه إى النبي (ﷺ))

وَإذا خافَتْ نشوزَ المَرأةِ وَعَظَها فإن أبَتْ إلاّ النشوزَ هَجَرَها فإن أقامَتْ عليه هَجَرَها وضَرَبَها وَيَسقطُ بِالنشوزِ قَسْمُها ونَفَقَتُها.

(فصلٌ) والخُلعُ جائِزٌ عَلىٰ عِوَضٍ مَعلومٍ، وتَملِكُ بِهِ المَرأةُ نَفسَها وَلا رَجعَةَ لَه عَليها إلا بِنِكاحٍ جَديدٍ، ويَجوزُ الخلعُ في الطّهرِ وفي الحَيضِ، ولا يَلحَقُ المُختَلِعَةَ الطلاقُ.

ئەگەر يەكێك لاسارى لەژنەكەيا بەدى كرد ئەوا پێشان ئامۆژگارى دەكات، ئەگەر ئەوە سوودى نەبوو ئەوا لێى دور دەكەوێتەوە ، ئەگەر هەر سوودى نەبوو ئەوا لەگەڵ دووركەوتنەوەكەدا لێشى ئەدات [1] بەهۆى لاسارىيەوە ژن نە بەشى مانەوەى شەوو نە نەفەقەى نامێنێت.

(باس) الخلع: بريتىيە لە جيابوونەوەى ژن لە پياوەكەى بەرامبەر شتێكى مەبەست كە بگەڕێتەوە بۆ مێردەكەى.

ـ خولع جائيزە وەلەسەر بەرامبەرێكى دياركراوە، [2] بەهۆى خولعەوە ژن دەبێتەوە خاوەنى خۆى، [3] وتەلاقى دەكەوێت وپياو ناتوانێت جارێكى تر بيهێنێتەوە ژێر عەقدى خۆى مەگەر سەر لەنوێ مارەى بكاتەوە، خولع لە پاكى وپيسىدا دروستە وژنى خولع كراو تەلاق وەرناگرێت. [4]

(١) ئايەتى: ﴿واللاتي تخافون نشوزهن فعظوهن واهجروهن في المضاجع وأضربوهن فإن أطعنكم فلا تبغوا عليهن سبيلا﴾ (النساء: ٣٤).

(٢) ئايەتى: ﴿ولا يحل أن تأخذوا مما آتيتموهن شيئا إلاّ أن يخافا ألا يقيما حدود الله فإن خفتم الا يقيما حدود الله فلا جناح عليهما فيما افتدت بـه﴾ (البقرة: ٢٢٩) بوخارى (٤٩٧١) ((أن إمرأة ثابت بن قيس أتت النبي (ﷺ) فقالت: يا رسول الله ثابت بن قيس، ماأعتب عليه في خلق ولادين ولكني أكره الكفر في الإسلام فقال: النبي (ﷺ):((أترديـن عليه حديقته؟)) قالت: نعم فقال: رسول الله (ﷺ): ((اقبل الحديقة و طلقها تطليقة)).

(٣) واتە: پياوەكە هيچ دەسەڵاتى بەسەريا نامێنێت چونكە خولع تەلاقى بائنەيە.

(٤) بەهۆى خولعەكە بووە بە بێگانە.

(فَصلٌ) والطَّلاقُ ضَربانِ: صَريحٌ وكِنايَةٌ: فالصَّريحُ ثَلاثةُ ألفاظٍ: الطَّلاقُ، والفِراقُ، والسَّراحُ ، والكِناية: كلُّ لفظٍ إحتَمَلَ الطلاقَ وغيرَهُ وَيفتَقِرُ إلى النِية.
وَالنِّساءُ فيهِ ضَربانِ: ضَربٌ في طلاقِهِنَّ سُنَّةٌ وبِدعَةٌ وهُنّ ذواتُ الحَيضِ، فالسُّنَّةُ: ان يُوقِعَ الطلاقَ في طُهرٍ غيرِ مُجامِعٍ فيهِ،

(باس) تەلاق: لەشەرعا بريتى‌يە لەكردنەوەى گرێى نيكاح وژن‌و مێراداييەتى بەو ەفزانەى كەباسيان دەكەين.

تەلاق: دوو جۆرە: (صريح)واتە: بێ پێچ وپەناكە واتاكەى بێجگە لەتەلاق هيچ مانايەكى ترى نى‌يە: (تەلاق، جيا بوونەوە، بەرەڵلا كردن. ئەمەيان پێويستى بەنيەت نى‌يە.[1]

(كناية) بەهەموو ئەو شانە دەوترێت كە بێجگە لەماناى تەلاق ماناى تريشيان هەيە ئەم جۆرەيان پێويستى بەنيەت هەيە.[2]

ئەو ژنانەى كە تەلاق دەدرێن دووجۆرن:

جۆرێكيان تەلاق دانيان، يان بەپێى ڕێوشوێنى شەريعەتە، يان تەلاق دانيان خراپە. ئەمانەش ئەوانەن كە (حەين) يان هەيە ئەگەر لەكاتى پاكى‌دا تەلاق بدرێن‌و مێردەكەيان نەچووبێتە لايان لەوكاتەدا ئەوە بەپێى شەرعە.

(١) ئــەم ووشــانە لەشــەرعدا بــەكارهاتوون ولەقورئانيشــدا بــۆ تــەلاق دان دووبارەكراونەتەوە:

ئايەتى: ﴿ياأيها النبي إذا طلقتم النساء فطلقوهن لعدتهن﴾ (الطلاق: ١)

ئايەتى: ﴿وأسرحكن سراحا جميلا﴾ (الأحزاب: ٢٨)

ئايەتى: ﴿أوفارقوهن بمعروف﴾ (الطلاق: ٢)

(٢) وەك ئەوەى بڵێت: بچۆرەوە ماڵى باوكت، تۆ خێزانى من نى، تـۆ بـێ مـێرديت... ئەگەر مەبەستى تەلاق بێت ئەوا تەلاقى ئەكەوێت ئەگينا ناكەوێت.

بوخارى (٤٩٥٥) ((إن إبنة الجون لما أدخلت على النبي (ﷺ) قـالت: أعـوذ بـالله منـك فقال: ((لقد عذت بعظيم إلحقي بأهلكي)) )).

بوخارى (٤١٥٦) موسليم (٢٧٦٩) ((وفي حديث تخلف كعب بمن مالك (ﷺ)عن غـزوة تبوك قال: لمـا مضـت أربعـون مـن الخمسـين وأستلبث الوحـي وإذا رسـول رسـول الله (ﷺ) يأتيني فقال: أن رسول الله (ﷺ) يأمرك أن تعتزل أمرأتك فقلت: أطلقها أم ماذا أفعل؟ فقال: بل أعتزلها فلا تقربنها قال: فقلت لأمرأتي: إلحقي بـأهلك)) پـاش هاتنـە خـوارەوەى ئايـەتى (توبة) بەكسەر ژنەكەى هێناوە ديارە ئەو وشەيە بۆ تەلاق نەبووە.

وَالبدعَةُ: أَن يوقعَ الطلاقَ في الحَيضِ أَوفي طُهرٍ جامَعَها فيه.
وَضَربٌ لَيسَ في طلاقِهنَّ سُنةٌ ولا بِدعَةٌ، وهُنَّ اربعٌ: الصغيرةُ، والآيسَةُ، والحامِلُ، والمُختلِعَةُ التي لَم يَدخُل بِها.
(فَصلٌ) ويَملكُ الحرُّ ثلاثَ تطليقاتٍ والعبدُ تَطليقَتَينِ.

بەلام ئەگەر لەكاتی حەیزدا تەلاق بدرێن یان لەپاكی‌داو مێردەكەیان چووبێتەلایان لەوپاكی‌یەدا ئەوا خراپە [1] جۆرەكەی تر ئەوانەن كە تەلاق دانیان نەباشە، نە خراپە ئەوانەش چوارن: منال، ئەوەی لە حەیز چووبێتەوە، سك پڕ، ئەو ژنەی خولعی كردووە پێش ئەوەی بگوێزرێتەوە.
(باس) پیاوی حور خاوەنی سێ تەلاقە [2] بەلام كۆیلە دووتەلاقی هەیە [3]

(١) بوخاری (٤٩٥٣) موسلیم (١٤٧١) عن عبدالله بن عمر (ﷺ): ((أنه طلق إمرأته وهي حائض على عهد رسول الله (ﷺ) فسأل عمر بن الخطاب رسول الله (ﷺ) عن ذلك فقال: ((مره فليراجعها ثم ليمسكها حتى تطهر ثم تحيض ثم تطهر ثم أن شاء أمسك بعد وإن شاء طلق قبل أن يمس فتلك العدة التي أمر الله أن تطلق لها النساء))
مەبەستی ئایەتی : ﴿يا أيها النبي إذا طلقتم النساء فطلقوهــن لعدتهــن﴾ ئافرەت ئەگەر لەپاكی‌دا تەلاق بدرێت ئەوا یەكسەر (عیددە) كەی دەست پێ دەكات بەلام لەحەیزدا وانی‌یە. هەروەها ئەگەر مێردەكەی چووبێتە لای ئیحتمالی سك پڕی هەیە لەوانەیە پەشیمانی لەدووا بێت.
(٢) ئایەتی: ﴿الطلاق مرتان فإمساك بمعروف أو تسريح بإحســان﴾ (البقرە:٢٢٩)
ئایەتی: ﴿فإن طلقها فلا تحل له حتى تنكح زوجا غيره﴾ (البقرة: ٢٣٠)
أبوداود (٢١٩٥) عن إبن عباس (ﷺ) قال: ﴿والمطلقات يتربصن بأنفسهن ثلاثة قروء ولا يحل لهن أن يكتمن ما خلق الله في أرحامهن أن كن يؤمن بالله واليوم الآخر وبعولتهن أحق بردهن أن أرادا إصلاحا﴾ (البقرة:٢٢٨) قال: وذلك ان الرجل كان إذا طلق إمرأته فهو أحق برجعتها وإن طلقها ثلاثا فنسخ ذلك وقال: الطلاق مرتان)).
(٣) الدارقطني (٣٩/٤) ((إنه (ﷺ) قال: طلاق العبد تطليقتان)).

وَيَصِحُّ الإستِثناءُ في الطَّلاقِ إذا وَصَلَه بِهِ، وَيَصِحُّ تَعليقُه بالصِّفةِ والشرطِ.

ولايقَعُ الطلاقُ قبلَ النِّكاحِ، وأربَعٌ لايقَعُ طلاقُهُم: الصَّبِيُّ، والمجنونُ، والنائِمُ، والمُكرَه.

(فصلٌ) وإذا طَلَّقَ إمرأتَهُ واحِدَةً او اثنَتَينِ فلَهُ مُراجَعَتُها مالَم تَنقَضِ عِدَّتُها.

---

لێ دەركردن (الإستثناء) لە تەلاق دانا دروستە بە مەرجێك لێ دەكردنەكە يەكسەر بلكێنێ بە تەلاقەكەوەو نێوانيان نەكەوێت هەروەها دروستە تەلاق بەبارێكی تايبەتی يان مەرجێكی [1] دياريكراوە وەببەستێتەوە. [2]

تەلاق پێش مارە كردن ناكەوێت. [3] چوار جۆرە پياو تەلاقيان ناكەوێت: منال، شێت، نووستوو، ئەوەی بە زۆرژنەكەی پێ تەلاق بدرێت. [4]

(باس) ئەگەر يەكێك يەك تەلاق يان دوو تەلاقی ژنەكەی بدات ئەوا بۆی هەيە بيگێرێتەوە ژێرنيكاحی خۆی بەمەرجێك عيدەی تەواو نەبووبێت. [5]

---

(١) وەك ئەوەی پياوێك بەژنەكەی بڵێت: سێ تەلاقەت بكەوێ بێجگە لەدوو تەلاق لەم حاڵەتەدا يەك تەلاقی ئەكەوێت: ((قال (ﷺ) من علق أو طلق واستثنى فله ثنياه)) (إبن الأثير/ النهاية).

(٢) نمونەی بەستنەوە بەبارێكی تايبەتی وەك ئەوەی بڵێت: ئەگەر باران باری تەلاقت بكەوێت، كە باران باری تەلاقەكەی ئەكەوێت نموونەی بەستنەوەبە مەرج وەك ئەوەی بڵێت: ئەگەر بچيتەناوماڵەكە تەلاقت بكەوێت كە چووە ژوورەكە تەلاقی دەكەوێت.

الحاكم (٢/٤٩) ((المسلمون عند شروطهم)).

(٣) أبوداود (٢١٩٠) الترمذي (١١٨١) ((لانذر لإبن آدم فيما لا يملك ولاعتق له فيما لا يملك ولا طلاق له فيما لا يملك)).

الحاكم (٢/٢٠٥) ((لاطلاق قبل النكاح)).

(٤) حەديسی ((رفع القلم......)) أبوداود (٢١٩٠) ((لاطلاق ولا عتاق في غلاق))

إبن ماجة (٢٠٤٥) ((أن الله وضع عن أمتي الخطأ والنسيان وما أستكرهوا عليه)).

(٥) ئايەتی ﴿وبعولتهن أحق بردهن في ذلك﴾ (البقرة: ٢٢٨).

أبوداود (٢٢٨٣) ((أن رسول الله (ﷺ) طلق حفصة ثم راجعها)) وەحەديسی پێشوو كە بە (عمر)ی فەرموو: ((مره فليراجعها)).

فإن انقَضتْ عِدّتها حَلَّ لَه نِكاحُها بِعقدٍ جَديدٍ، وتكونُ مَعَهُ علىٰ مابَقِيَ مِنَ الطلاقِ.

فإن طَلّقها ثَلاثًا لَم تَحِلّ لَهُ إلا بعدَ وجُودِ خمَسِ شرائِطَ: إنقضاءُ عِدّتِها مِنه، وتزويجُها بِغيره، ودخولُه بها، وإصابتُها وبينونَتُها مِنه، وإنقضاءُ عِدتِها منه.

(فصل) وإذا حَلَف أنَ لايَطَأَ زوجتَهُ مُطلقًا، او مُدةً تزيدُ علىٰ اربعةِ أشهرٍ، فهو مولٍ، وَيُؤَجَّلُ لَه -ان سأَلتْ ذلكَ- اربعةَ اشهرٍ، ثم يُخَيَّرُ بينَ الفَيئَةِ والتّكفيرِ

---

ئەگەر عیددەی تەواو بوو ئەوا ئەبێت سەر لەنوێ مارەی بکاتەوە بەڵام بەو تەڵاقانەی کەماویەتی لەعەقدی پێشوو. [1]

ئەگەر یەکێك سێ بەسێ ژنەکەی تەڵاق بدات ئەوا جارێکی تر بۆی نی‌یە مارەی بکاتەوە تا ئەم پێنج مەرجە نەیەنە دی: عیددەی لەو تەواو ببێت، شوو بەپیاوێکی تر بکات، ئەو پیاوە بێ گوێزێتەوەو بچێتە لای. [2] ئینجا ئەو پیاوە تەڵاقی بداتو هیچ پەیوەندی بەو ژنەوە نەمێنیت، [3] عیددە لەو تەواو ببێت.

(باس) الإیلاء: بەوە دەڵێن پیاوێك سوێند بخوات کە ناچێتە لای ژنەکەی.

یەکێك سوێند بخوات کە ناچێتە لای ژنەکەی بۆ ماوەیەکی نادیار یان بۆماوەی زیاتر لە چوار مانگ پێی ئەو ترێ (مولی). جا ئەگەر ژنەکە داوا بکات ئەوا بۆماوەی چوار مانگ مۆڵەتی ئەدرێت پاش ئەوە سەرپشك ئەکرێت: یان لەسوێندەکەی پاش گەز ببێتەوەو کەفارەت بدات

---

(١) الموطأ (٢/٥٨٦) (عن عمر (ﷺ) أنه سئل عمن طلق إمرأته طلقتين وأنقضت عدتها فتزوجت غيره وفارقها ثم تزوجها الأول: فقال: ((هي عنده بما بقي من الطلاق)) ).

(٢) ئایەتی: ﴿فإن طلقها فلا تحل له من بعد حتى تنكح زوجا غيره فإن طلقها فلا جناح عليهما أن يتراجعا إن ظنا أن يقيما حدود الله﴾ (البقرة: ٢٣٠).

بوخاری (٢٤٩٦) موسلیم (١٤٣٣) ((عن عائشة (ﷺ): جاءت إمرأة رفاعة القرظي النبي (ﷺ) فقالت: كنت عندرفاعة فطلقني فأبتّ طلاقي فتزوجت عبدالرحمن بن الزبير إنما معه مثل هدبة الثوب فقال: ((أتريدين أن ترجعي إلى رفاعة؟)): لا ((حتى تذوقي عسيلته ويذوق عسيلتك)).

(٣) واتە عەقدەکە بەتاڵ بێتەوە چ بەتەڵاق یان فەسخ یان مردن.

اَوِ الطّلاقِ. فإن إمتَنَعَ طلَّقَ عليهِ الحاكِمُ.

(فصل) والظِّهارُ: أَن يقولَ الرَّجلُ لِزوجتِهِ: أَنتِ عَليَّ كَظَهرِ اُمي فإذا قالَ لَها ذلك ولم يُتبِعهُ بِالطلاقِ صارَ عائِدا ولَزِمَتهُ الكفارَةُ. والكفارةُ: عِتقُ رَقبَةٍ مُؤمِنَةٍ سليمةٍ من العيوبِ المُضِرِّ بالعملِ والكسبِ، فإن لَم يَجِد فصِيامُ شهرَينِ مُتَتابِعَينِ فإن لمْ يسَتطِع فإطعامُ ستينَ مِسكينا كلُّ مسكينٍ مُدّ، ولا يَحِلُّ لِلمُظاهِرِ وطؤُها حتىٰ يُكَفِّرَ.

...ێ تەلاقی بدات. [1] ئەگەر نكوڵی كرد ئەوا حاكمی وەخت ژنەكەی تەلاق ئەدات. [2]

(باس) ظهار: لەشەرعا بەوە دەڵێن پیاوێك ژنەكەی بشوبهێنێ بە ژنێكی مەحرەمی وەك : دایك/ خوشك. پیاوێك بە ژنەكەی بڵێت: تۆ وەك پشتی دایكم وایت، واتە چۆن دایكم بۆمن حەرامە تۆش وایت. [3] ئەگەر یەكسەر تەلاقی نەدات، ئەوا بە پاشگەز بوو دائەنرێت و ئەبێت كەفارەتی بدات. كەفارەتیش بریتی‌یە لە: ئازاد كردنی‌كۆیلەیەكی موسڵمانی ساغ و سەلیمی بێ عەیب بۆ كارو كاسبی بشێت، ئەگەر نەی بوو دەبێت دوو مانگ لەسەر یەك بەرۆژوو بێت ئەگەر نا ئەوە دەبێت شەست گەدا نان بدات، هەر یەكەیان مستێك خواردەمەنی بداتێ. تا ئەو كەفارەتەش نەدات بۆی نی‌یە بچێتە لای ژنەكەی. [4]

---

(١) ئایەتی: ﴿للذين يؤلون من نسائهم تربص أربعة أشهر فإن فاءوا فإن الله غفـور رحيم، وإن عزموا الطلاق فإن الله سميع عليم﴾ (البقرة: ٢٦-٢٧).

الموطأ (٢/٥٥٦) عن على (ﷺ) أنه كان يقول: (إذا الى الرجل من إمرأته لم يقع عليه طلاق وإن مضت الأربعة الأشهر حتى يوقف: فإما أن يطلق وإما أن يفيء وروى مثل ذلك عن إبن عمر (ﷺ).

(٢) بۆ ئەوەی زیانی لەسەر لا بچێت ئەوەش تەنها بەوە دەبێت كە تەلاق بدرێت.

(٣) ئایەتی: ﴿والذين يظاهرون منكم من نسائهم ماهن أمهاتهم أن إمهاتهم الا اللائي ولدنهم وإنهم ليقولون منكرا من القول وزورا وإن الله لعفو غفور﴾ (المجادلة: ٢).

(٤) ئایەتی: ﴿والذين يظاهرون من نسائهم ثم يعودون لما قالوا فتحرير رقبة من قبل أن يتماسا ذلكم توعظون به والله بما تعملون خبير، فمن لم يجد فصيام شهرين متتا بعين من قبل أن يتماسا فمن لم يستطع فإطعام ستين مسكينا ذلك لتؤمنوا بالله ورسوله وتلك حدود الله وللكافرين عذاب أليم﴾ (المجادلة: ٣-٤)

سَهْمٌ لِرَسولِ الله (ﷺ) يُصرَفُ بعدَهُ لِلمَصالِحِ وسهمٌ لِذَوي القُربىٰ وهُم: بَنو هاشِمٍ وبنو المُطَّلِب، وسَهمٌ لِليَتامىٰ، وسهمٌ لِلمَساكين، وسَهمٌ لِأبناءِ السَّبيل.

( فصلٌ ) وَيُقسَمُ مالُ الفَيءِ على خَمسِ فِرَقٍ: يُصرَفُ خُمسُهُ عَلىٰ مَن صُرِفَ فيهم خُمسُ الغَنيمَةِ و يُعطىٰ اربعةُ اخماسِهِ لِلمُقاتِلَةِ وفي مَصالِحِ المُسلمين.

بەشێکی هی پێغەمبەرە (ﷺ) پاش وەفاتی لەبەرژەوەندی‌یە گشتی‌یەکاندا سەرف دەکرێت بەشێکی تر دەدرێت بەخزمە نزیکەکانی پێغەمبەر -بەرە بابی هاشم و مطلب- بەشێکی تر بۆ بێ باوکان، [1] بەشێکی‌تر بۆ گەدا یان بەشێکی تر بۆ ئەوکەسانەیە کە لەسەرفەردان وپارەیان پێ نەماوە -إبن السبيل-.

( باس ) الفیء : واتە ئەوماڵەی کەلە کافران دەگیرێت بێ‌شەڕ.ئەم سامانە دەکرێت بە پێنج بەشەوە بەشێکیان واتە پێنج یەکی دەدرێت بەو کەسانەی کە پێنج یەکی تالانی یان دەدرایە [2] چوار بەشەکەی تریش دەدرێت بە شەڕکەران [3] و بۆ سوودی گشتی موسڵمانان خەرج دەکرێت. [4]

(١) بەوانە دەڵێن کە باوکیان نەماوە تا دەگەنە تەمەنی باڵغی ئیتر نایان درێتێ: أبوداود (٢٨٧٣) ((لايتم بعد إحتلام)).

بوخاری (٢٩٧١) (عن جبير بن مطعم (ﷺ) قال: مشيت أنا وعثمان بن عفان إلى رسول الله (ﷺ) فقلنا: يارسول الله أعطيت بني المطلب وتركتنا ونحن وهم منك بمنزلة واحدة؟ فقال رسول الله (ﷺ): ((إنما بنو المطلب وبنو هاشم شيء واحد)) ).

(٢) ئایەتی ﴿ماافاء الله على رسوله من اهل القرى فلله و للرسول ولذى القربى و اليتامى والمساكين و ابن السبيل﴾ (الحشر: ٧) البيهقى-نهاية ( ٢٧٢/٣ ) ((مالى مما افاء الله الا الخمس والخمس مرد ود فيكم)).

(٣) بەو کەسانە دەڵێن : کەهەمیشە ئامادەن و هیچ کارێکیان نی‌یە تەنها پارێزگاری لە سنوورەکانی ئیسلام دژی هێرش کەران.

(٤) بوخاری ( ٢٧٤٨ ) موسلم ( ١٧٥٧) ((كانت اموال بنى النضير مما افاء الله على رسوله (ﷺ) ممالم يوجف المسلمون عليه بخيل ولاركاب فكانت لرسول الله (ﷺ) خاصة و كان ينفق على اهله نفقة سنته ثم يجعل مابقى فى السلاح و الكراع عدة فى سبيل لله))

بەشێکی ئەم سامانە دەدرێت بە خێزانی ئەوشەڕکەرانە پاش مردنیان هەروەها بۆ زانایان دەردێت بەوەرەسەکانیان ژن-کچ- کوڕ تا ئەوکاتەی توانای ئیش پەیانەکەن.

منالانی زانایان لەم بەشە پارەیان بۆتەرخان دەکرێت. نهاية (٧٤/٣).

(فصلٌ) وشَرائطُ وُجوبِ الجزيَةِ خمسُ خِصالٍ: البلوغُ، والعقلُ، والحريةُ، والذكوريةُ، وأَن يكونَ من اهلِ الكِتابِ، او مِمَّن لَه شُبهةُ كتابٍ، واَقلُّ الجزيَةِ دينارٌ في كلِّ حولٍ ويُؤخَذُ من المُتَوَسِّط ديناران ومِنَ الموسِرِ اربعةُ دنانيرَ ويَجوزُ ان يَشتَرِطَ عَليهم الضِّيافَةَ فَضلًا عَن مِقدارِ الجزيَةِ.

(باس) الجزية: -سەرانە- بریتی‌یە لەوپارەیەی کە بەهۆی عەقدێکی تایبەتی‌یەوە لە گاورو جوولەکە وەردەگیرێت بەرامبەر مانەوەیان لەوڵاتی ئیسلام وپاراستنیان.

مەرجەکانی واجب بوونی سەرانە پێنج شتن: [1]: بالغی، ئەقڵ، ئازادی، پیاوبێت، [2] لەوانەبێت کە خاوەنی کتێبی ئاسمانین، یان گومانی ئەوە بکرێت کە خاوەن کتێبی ئاسمانی بن. [3] لای کەمی سەرانە لەساڵێکدا دینارێکەمام ناوەندیَ دووینارە دەوڵەمەند چوار دینارە [4] ئەتوانرێت لەسەریان بکرێت بەمەرج کە میوانداری میوانان بکەن سەرەڕای سەرانەکە. [5]

(١) ئایەتی: ﴿قاتلوا الذين لايؤمنون بالله ولا باليوم الآخر ولا يحرمون ما حرم الله ورسوله ولا يدينون بدين الحق من الذين أوتوا الكتاب حتى يعطوا الجزية عن يدوهم صاغرون﴾ (التوبة: ٢٩). بوخاري (٢٩٨٨) موسليم (٢٩٦١) ((أن رسول الله (ﷺ) بعث أبا عبيدة بن الجراح إلى البحرين يأتي بجزيتها)).

(٢) البيهقي (٩/١٩٥) ((أن عمر (رضي الله عنه) كتب إلى عماله أن لايضربوا الجزية على النساء والصبيان)).

(٣) وەك (مەجوس) واتە ئاگر پەرستان.

بوخاری (٢٩٨٧) ((أن عمر (رضي الله عنه) لم يكن ليأخذ الجزية من المجوس حتى شهد عبدالرحمن بن عوف (رضي الله عنه) أن النبي (ﷺ) أخذها من مجوس هجر)).

(٤) البيهقي (٩/١٩٦) ((أقتداء بعمر (رضي الله عنه) فقد وضعها على الغني ثمانية وأربعين درهما وعلى المتوسط أربعة وعشرين درهما)) وكان صرف الدينار باثنى عشردرهما (نصف ليرة إنكليزية).

(٥) البيهقي (٩/١٩٥) ((أنه (ﷺ) صالح أهل أيلة على ثلاثمأة دينار وكانوا ثلاثمأة رجل وعلى ضيافة من مربهم من المسلمين)).

**وَيَتَضَمَّنُ عقدُ الجزيةِ اربعةُ اشياءَ: ان يُؤَدوا الجزيـةَ، وأَن تُجرىٰ عَليهم أُحكامُ الإسلامِ، وان لايُذكروا ديـنَ الإسلامِ إلاّ بِخَيرٍ، وان لايفعلوا مافيهِ ضَرَرٌ عَلىٰ المُسلِمينَ ويُعرَفونَ بلُبسِ الغِيارِ، وشَدِّ الزّنارِ ويُمنَعونَ مِن رُكوبِ الخَيلِ.**

**عەقدی سەرانە ئەبێت ئەم چوارشتەی تیا بێت: سەرانەبدەن، حوكمی ئیسلامیان بەسەردا تەتبیق بكرێت، [1] ناوی ئیسلام بەخراپە نەبەن، كارێك نەكەن كەزیان بەموسڵمانان بگەیەنێت. [2] دەبێت جلی تایبەتی، وەها لەبەر بكەن كە بناسرێن وەك پینەی تایبەتی و پشتێنی تایبەتی. [3] وەرێگایان پێ ناردێت كە سواری ئەسپ بن.**

(١) واتە: لەوشتانەدا كە بەپێی ئاینی ئەوانیش حەرامە وەك (زنا).

بوخاری (٦٤٣٣) موسلیم (١٦٩٩) ((أنه (ﷺ) رجم يهوديا ويهودية زنيا)) بەلام ئەگەر وانە بوو ئەوا حوكمی ئیسلامیان بەسەردا تەتبیق ناكرێت مەگەر بۆلای قازی ببرێن ئەو كاتە بەپێی شەرعی ئێمە حوكمیان بەسەردا ئەدرێت.

(٢) وەك ڕاگرتنی جاسوس و پەنادانی یان نهێنی موسڵمانان دەربخەن بۆ ددوژمنی ئیسلام، یان بەئاشكرا شەراب بخۆنەوە یان بەراز بخۆن...

(٣) مەبەست ئەوەیە كە لە موسڵمانان جیا بكرێنەوە.



# كتاب الصيد والذبائح

وماقُدِرَ علىٰ ذَكاتِهِ، فذكاتُهُ في حَلقِهِ ولَبَّتِهِ ومالم يُقدَر علىٰ ذكاتِهِ فذكاتُه عَقرُهُ حيثُ قُدِرَ عليه.

وكمالُ الذكاةِ اربعةُ اشياءَ: قطعُ الحُلقومِ، والمَريءُ، والوَدَجَين، والمُجزِيءُ مِنها شَيئانِ: قطعُ الحُلقومِ والمَريءِ.

ويَجوزُ الإصطِيادُ بكُلِّ جارِحَةٍ مُعَلَّمَةٍ، مِنَ السِّباعِ ومِنَ جَوارِحِ الطَّيرِ.

## باسی ڕاووشكارو ئەوگیانلەبەرانەی كەچە قۆیان لەسەرەو سەر دەبڕڕێن

هەرگیانلەبەرێك بتوانرێت سەر ببڕێت [1] ئەبێت لەناوەراستی ملیەوە سەر ببڕڕێت، [2] ئەوەش كە نەتوانرێت سەر ببڕڕێت ئەوا بەوە دەبێت كە بریندار بكرێت بەشێوەیەك بەوبرینە گیانی دەربچێت. [3]

سەر بڕینی تەواو بەچوارشت دێتە دی: بڕینی قورقوراگە، بڕینی سووریێنچك، بڕینی هەر دوو بۆری خوێن لەمل دا. [4] بەڵام بەبڕینی قورقوراگەو سوورێنچك سەربڕین دێتەدی. [5] ڕاو كردن بەهەموو گیانلەبەرێكی كەلبەدارو خلۆەن چرنوك [6] دروستە بەمەرجێك تەواو لەسەر فێر كرە راهێنرابێ.

(١) ئایەتی: ﴿إلا ماذكيتم﴾ المائدة ٣.

ئایەتی: ﴿وإذا حللتم فاصطادوا﴾ المائدة ٢.

(٢) الدارقطني (٤/٢٨٣) ((ألا إن الذكاة في الحلق واللبة)).

(٣) بوخاری (٥١٩٠) موسلیم (١٩٦٨) ((أنه (ﷺ) أصاب نهب إبل وغنم فند منها بعير ولم يكن معهم خيل فرماه بسهم فحبسه -أي فمات- فقال رسول الله (ﷺ): إن لهذه البهائم أوابد كأوابد الوحش فما فعل منها هكذا فافعلوا به مثل ذلك (ويروى) وما عليكم منها فا صنعوا به هكذا)).

(٤) واتە: بۆری هەناسەو بۆری خواردن و دوو بۆری خوێن لەم لاو ئەولای مل لەحەدیسدایە ((كل ما افرى الأوداج)).

(٥) بوخاری (٢٣٥٦) موسلیم (١٩٦٨) ((ما إنهر الدم وذكر إسم الله عليه فكلوه)).

(٦) مەبەست ئەوگیان لەبەرانەن كە كەڵبەیان هەیە وەك سەگو یۆز -فهد- یان چرنووك یان هەیە وەك باز-دالّ-.. ئایەتی: ﴿ويسألونك ماذا أحل لهم قل أحل لكم الطيبات وماعلمتم من الجوارح مكلبين تعلمونهن مما علمكم الله فكلوا مما أمسكن وأذكروا إسم الله عليه واتقوا الله أن الله سريع الحساب﴾. (المائدة: ٤).

وَشَرائِطُ تَعليمِها أَربعةٌ: أن تَكونَ إذا أُرسِلَت إسترسَلَتْ، وإذا زُجِرَتْ إنْزَجرَتْ، وإذا قَتَلَتْ صَيدًا لَم تاكُلْ مِنهُ شَيئاً، وَأَن يَتَكَرَّرَ ذلِكَ مِنها فإن عُدِمَتْ إحدىٰ الشَّرائِطِ لَم يَحِلَّ ما أخَذَتْهُ إلا أن يُدرِكَ حَيا فَيُذَكّىٰ وتجوزُ الذكاةُ بِكُلِّ مايَجرَحُ، إلا بالسِنِّ والظُفُرِ.

وتَحِلُّ ذَكاةُ مُسلِمٍ وكتابِيٍّ، ولا تَحِلُّ ذَبيحَةُ مَجوسِيٍّ ولا وَثَنِيٍّ.

مەرجی ڕاهێنان یان چوارشتە: کەبەردرایە نێچیرەکە خێرا بەرەو لای بچێت، کە داوای لێکرا بوەستێت یەکسەر بوەستێ، کە نێچیری کوشت هیچی لێ نەخوات، چەند جارێك ئەمە دووبارە بکرێتەوە وەك تاقیکردنەوە [1] ئەگەر مەرجێك لەم مەرجانە نەهاتەدی ئەوا ئەو شتەی کەدەی گرێت [2] حەرامە، مەگەر بەزیندوویی بتوانرێت بچنە سەری وسەری ببڕن. [3] هەرشتێك گۆشت ببڕێت دروستە بۆ سەربڕین بەکار بهێنرێت بێجگە لەددان و نینۆك. [4]

هەر حەیوانێك لەلایەن موسوڵمان یان خاوەن کتێبی ئاسمانی وەك (گاوروو جولەکە) سەر برابێت ئەوا حەڵاڵە [5] بەلام سەر براوی ئاگر پەرست و بت پەرست حەرامە [6]

(١) واتە دووجار یان زیاتر چونکە لەوانەیە بە ڕێکەوت ئەوکارە بکات نابێە بەڵگە لەسەر فێربوون:

(٢) بوخاری (٥١٦٧) موسلیم (١٩٢٩) ((إذا أرسلت كلبك المعلم وسميت فأمسك وقتل فكل وإن أكل فلا تأكل فإنما أمسك على نفسه)).

(٣) بوخاری (٥١٧٠) موسلیم (١٩٣٠) ((وما صدت بكلبك الذي ليس بمعلم فأدركت ذكاته فكل)).

(٤) (إننا نرجو أو نخاف العدو غدا وليست معنا مدى أفنذبح بالقصب؟ قال: ((ما أنهر الدم وذكر إسم الله عليه فكلوه ليس السن والظفر وسأحدثكم عن ذلك إما السن فعظم وإما الظفر فمدى الحبشة)) ).

(٥) ئایەتی: ﴿وطعام الذين أوتوا الكتاب حل لكم﴾ (المائدة: ٥).

جیاوازی لەنێوان ژن و پیاودا نییە بۆ سەر بڕین.

(٦) ((أنه (ﷺ) كتب إلى مجوس هجر يعرض عليهم الإسلام، فمن أسلم قبل منه ومن أبي ضربت عليهم الجزية، على أن لاتؤكل لهم ذبيحة ولاتنكح لهم إمرأة)) (البيهقي (٩/٢٨٥)).

هەروەها سەر براوی (مرتد) یش حەرامە، ئەوەش کە بڕوای بەهیچ ئایینێك نییە (ملحد)ە سەر بڕراوی حەرامە.

وذَكاةُ الجَنينِ بِذكاةِ أُمِّهِ، إلا أن يُوجَد حَيًا فَيُذكَيّ.

وما قُطِعَ مِن حَيّ فهو مَيّتٌ، إلا الشعورَ المنتَفَعَ بِها في المَفارِشِ والمَلابِسِ.

(فصل) وكلُّ حيوانٍ إستَطابَتْهُ العَرَب فَهُوَ حَلالٌ، الا ماوَرَدَ الشَرعُ بتَحريمِهِ، وكلُّ حَيوان إستَخبَثَهُ العَرُب فهوَ حَرامٌ إلا ماوَرَدَ الشرعُ بإباحَتِه.

---

سەربڕینی دایك دەبێتە سە بڕینی بێچووەكەی ناوسكی مەگەر دوای سەر بڕینی دایكەكە بەزیندوویی دەربهێنرێت لەم كاتەدا ئەبێت سەر ببڕێت. [١]

هەرشتێك لەگیانلەبەرێكی زیندوو بكرێتەوەو ببڕێت ئەوە وەك مردارەوەبووی ئەوگیانلەبەرە سەیر دەكرێت [٢] بێجگە لەو مووەی كە بۆ دروستكردنی ڕاخەرو جل بەكار دێت ئەوە پاكە. [٣]

(باس) هەرگیانلەبەرێك عورفو عادەتو پیاوی تەبیعەت بەرز [٤] بەباشی بزانێت ئەوە حەلاڵە مەگەر لەشەرع دا بەحەرام دانرابێت. هەرگیانلەبەرێكیش وانە بێت حەرامە، مەگەر لەشەرع دا حەلاڵ بێت [٥]

---

(١) أبوداود (٢٨٢٧) عن أبي سعيد الخدري (ﷺ) قال: (سألنا رسول الله عن الجنين فقال: ((كلوه إن شئتم فإن ذكاته ذكاة أمه)) ).

(٢) واتە: ئەگەر بەمردوویی بخورێت یان پاك بێت ئەوا ئەو پارچەیەش حەلاڵە بۆ نموونە پارچەی ماسی حەلاڵە/ پارچەی مرۆڤ پاكە، الحاكم (٢٣٩/٤) ((أن رسول الله (ﷺ) سئل عن جباب أسنمة الإبل وأليات الغنم قال: ((ماقطع من حي فهو ميت)).

أبوداود (٢٨٥٨) الترمذي (١٤٨٠) (قدم النبي (ﷺ) المدينة وهم يجبون إسنمة الإبل ويقطعون أليات الغنم فقال: ((ماقطع من البهيمة وهي حية فهي ميتة)) ).

(٣) بەو مەرجەی حەیوانەكە بەشەرع خواردنی دروست بێت وەبەزیندوویی لێی بكرێتەوە یان پاش سەر بڕینی بە ڕێگای شەرعی ولە ئەندامێكی جیانەكرابێتەوە، تووك وموی مردوو بێجگە لە هی مرۆڤ پیسەو پاك ناكرێتەوە چونكە وەك پێستە خۆش ناكرێت.

ئایەتی: ﴿والله جعل من بيوتكم سكنا وجعل لكم من جلود الأنعام بيوتا تستخفونها يوم ظعنكم ويوم إقامتكم ومن أصوافها وأوبارها وأشعارها أثاثا ومتاعا إلى حين﴾ (النحل: ٨٠)

پەڕی پەلەوەریش وەك تووك وایە.

(٤) وەك عەرەب چونكە ئەوان یەكەم نەتەوەبوون كە ئایین ڕووی تێ كردوون.

(٥) ئایەتی: ﴿ويحل لهم الطيبات ويحرم عليهم الخبائث﴾ (الأعراف: ١٥٧).

﴿يسألونك ماذا أحل لهم قل أحل لكم الطيبات﴾ (المائدة: ٤).

وَيحْرُمُ مِنَ السّباعِ مالَهُ نابٌ قَوِيٌّ يَعدوبِه ويَحْرُمُ مِنَ الطّيورِ مالَهُ مِخلَبٌ قَوِيٌّ يَجرَحُ بهِ،
وَيَحِلُّ لِلمُضطَرّ في المَخمَصَةِ: ان يأكُلَ مِن المَيتَةِ المُحرَّمَةِ مايَسُدّ بِه رَمَقَهُ، ولَنا مَيتَتانِ حَلالانِ: السَّمَكُ والجَرادُ ودَمانِ حَلالانِ: الكَبدُ والطِحال،
(فصل) وَالأضحيةُ سَنةٌ مُؤكَدَةٌ،

---

هەر درەندەیەك كەڵبەی هەبێت وهێزی شكاندنی نێچیری هەبێت [1] ئەوە حەرامە هەروەها هەربالندەیەك كەچنگی تیژوو نینۆكی قولاپیو دەنووكی لاری ببێ و ڕاوی پەلەوەری پێ بكات حەرامە. [2]
یەكێك كەبرسی‌یەتی پرزەی‌لێ ستاند بێتو تەواو ناڕەحەتی كرد بێت بۆی حەلاڵە لەمردارەوەبووی حەرام [3] بخوات ئەوەندەی كەلە مردن ڕزگاری بكات. دوومردارەوە بوومان بۆ حەلاڵن: ماسی وكوللە، هەروەها دووخوێنیش حەلاڵن: جگەرو سپل. [4]
(باس) قوربانی سوننەتێكی گەورەیە، [5]

---

(١) وەك: گورگ –شێر – سەگ..

(٢) بوخاری (٥٢١٠) موسلیم (١٩٣٢) ((أن رسول الله (ﷺ) نهى عن أكل كل ذي ناب من السباع)).

موسلیم (١٩٢٤) ((نهى رسول الله (ﷺ) عن كل ذي ناب من السباع وعن كل ذي مخلب من الطيور)).

(٣) واتە: هەموو شتێكی حەرام، ئایەتی: ﴿حرمت عليكم الميتة والدم ولحم الخنزيرو ماأهل لغير الله به﴾ ﴿فمن أضطر في مخمصة غير متجانف لإثم فإن الله غفور رحيم﴾ (المائدة: ٣).

(٤) أحمد (٢/٩٧) ((أحلت لنا ميتتان ودمان: فأما الميتتان فالحوت والجراد وأما الدمان فالكبدو الطحال)).

هەر ماسی‌یەك سەر ئاو بكەوێتو ئاوسابێت حەرامە ئەگەر مەترسی ئەوەی لێ بكرێت كە ئەبێتە هۆی نەخۆشی.

(٥) ئایەتی: ﴿فصل لربك وأنحر﴾ (الكوثر : ٢).

بوخاری (٥٢٤٥) موسلیم (١٩٦٦) ((ضحى النبي (ﷺ) بكبشين أملحين أقرنين ذبحهما بيده وسمى وكبر ووضع رجله على صفاحهما)).

وَيُجزِئُ فيها الجذعُ من الضَّأنِ والثَّنيُّ مِنَ المَعزِ.
والثَّنيُّ من الإبلِ والثَّنيُّ من البقرِ.وتُجزِئُ البَدَنَةُ عن سَبعَةٍ والبَقَرَةُ عَن سَبعَةٍ والشاةُ عن واحدٍ.
وأربعٌ لاتُجزِئُ في الضَّحايا: العَوراء البَيِّنُ عَورُها، والعَرجاء البَيِّن عَرَجُها، والمريضةُ البَيِّن مَرَضُها، والعَجفاءُ التي ذَهبَ مُخُّها مِنَ الهُزال.
وَيُجزِئُ الخَصِيُّ والمَكسورُ القَرنِ ولا تُجزِئُ المقطوعَةُ الأُذنِ ولا الذَنَب.

---

ئەو حەيوانەی كە بۆ قوربانی دەست دەدات: لەمەڕدا ئەبێت ساڵێكی تەواو كردبێت [1] لەبزن دا ئەبێت دووساڵی تەواو حردبێت.
هەروەها لە حوشتر وگاومانگا ئەبێت دووساڵ بێت، [2] حوشتروگاو مانگا بۆحەوت كەس جێ ئەگرن بەڵام مەڕو بزن هەر بۆ یەك كەس. [3] چوار جۆر حەیوان بۆ قوربانی دەست نادەن: كوێری تەواو، شەل تەواو، نەخۆشی ئاشكرا، لەڕوولاوازی واكە لەبەر لەڕی مۆخی ئێسقانەكانی نەما بێت. [4]
حەیوانی خەساوو شاخ شكاو بۆ قوربانی دەشێت. [5] بەڵام گوێ بڕاوو [6] كلك بڕاو بۆ ئەوە ناشێن.

---

(١) أحمد (٦/٣٦٨) ((ضحوا بالجذع من الضأن فإنه جائز)).
أحمد (٢/٤٥٤) ((نعم أونعمت الأضحية الجذع من الضأن)).
(٢) دەڵێن: حوشتر ئەبێت پێنج ساڵی تەواو كردبێت.
(٣) موسليم (١٣١٨) (نحرنا مع رسول الله (ﷺ) عام الحديبية: البدنة عن سبعة والبقرة عن سبعة)).
بوخاری (٥٢٢٨) ((ضحى رسول الله (ﷺ) عن نسائه بالبقرة))
الموطأ (٢/٤٨٦) ((كنا نضحي الشاة الواحدة يذبحها الرجل عنه و عن أهل بيته ثم تباهي الناس بعد فصارت مباهاة)).
(٤) الترمذي (١٤٩٧) أبوداود (٢٨٠٢) قال النبي (ﷺ) ((أربع لاتجوز في الأضاحي: العوراء بين عورها والمريضة البين مرضها والعرجاء البين ظلعها والكسير —وعند الترمذي— العجفاء التي لاتنقي)).
(٥) الحاكم (٤/٢٢٧) ((أن رسول الله (ﷺ) ضحي بكبشين سمينين عظيمين أملحين أقرنين موجوءين فذبح أحدهما فقال: اللهم عن محمد وأمته من شهد لك بالتوحيد وشهد لي بالبلاغ)).
(٦) هەمووی یان بەشێكی بڕبڕا بێت.

وَوَقتُ الذّبحِ: مِن وقتِ صَلاةِ العيدِ إلىٰ غُروبِ الشمسِ مِن آخِرِ أيّامِ التّشريقِ.

وَيُستَحَبُّ عِندَ الذّبحِ خَمسَةُ أشياءَ: التّسمِيَةُ، والصَّلاةُ علىٰ النّبي (ﷺ) واستقبالُ القِبلَةِ، والتّكبيرُ، والدعاءُ بِالقَبولِ. ولايَأكُلُ المُضحّي شَيئاً مِن الأضحِيَةِ المَنذورَةِ.

---

كاتی سه‌بڕینی قوربانی: له‌دوای نوێژی جه‌ژنی قوربانه‌وه ده‌ست پێ ده‌كات تا خۆرئاوا بوونی دووا ڕۆژی (ایام التشریق) واته ڕۆژی سیانزه‌ی (ذي الحجة).[1]

پێنج شت له‌كاتی سه‌ربڕین دا سوننه‌تن: بسم الله كردن، درورود ناردن بۆ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ)، ڕووكردنه قیبله، (الله اكبر) بڵێت، له‌خوا بپاڕێته‌وه كه‌لێی قبول بكرێت.[2]

ئه‌گه‌ر قوربانی‌یه‌كه نه‌زر بوو[3] ئه‌وا به هیچ جۆرێك نابێت هیچی لێ بخوات.[4]

---

(١) بوخاری (٥٢٢٥) موسلیم (١٩٦١) قال رسول الله (ﷺ): ((إن أول مانبدأ به يومنا هذا نصلي ثم نرجع فننحر ومن فعل ذلك فقد أصاب سنتنا ومن ذبح قبل فإنما هو لحم قدمه لأهله ليس من النسك في شيء))

إبن حيان (١٠٠٨) قال رسول الله (ﷺ): ((وكل أيام التشريق ذبح)).

(٢) ئایه‌تی: ﴿فكلوا مما ذكر إسم الله عليه﴾ (الأنعام: ١١٨).

موسليم (١٩٦٦) حديث : (( أنه (ﷺ) قال: بسم الله والله اكبر)).

موسليم (١٩٦٧) ((أنه (ﷺ) ضحى بكبش وقال عند ذبحه: بسم الله اللهم تقبل من محمد وآل محمد ومن أمة محمد)).

(٣) ئه‌و جۆره‌یه كه‌له‌سه‌ر خۆی فه‌رز ئه‌كات وه‌ك ئه‌وه‌ی بڵێت: له‌سه‌رمه بۆخوا كه قوربانی بكه‌م یان ئه‌و حه‌یوانه سه‌ر ببڕم.

(٤) هه‌روه‌ك نابێت لێی بخوات نابێت به‌جۆری تر كه‌ڵكی لێ وه‌ربگرێت وه‌ك پێسته‌كه‌ی ئه‌بێت هه‌موو ببه‌خشێت.

وَيأكُلُ مِنَ الأُضحِيَةِ المُتَطَوّعِ بِها ولا يَبيعُ مِنَ الأُضحِيَةِ ويُطعِمُ الفُقراءَ والمَساكينَ.

(فصل) والعقيقةُ مُستَحَبَّةٌ وهيَ: الذَّبيحَةُ عَنِ المَولود يومَ سابِعهِ ويُذبَحُ عَنِ الغُلامِ شاتانِ، وعَنِ الجاريةِ شاةٌ ويُطعِمُ الفُقراءَ والمَساكينَ.

بەڵام لە قوربانی تر دەتوانێت بخوات [1] بەڵام نابێت لێی بفرۆشێت [2] و پێویستە دەرخواردی گەداو لاتو هەژارانی بدات.

(باس) حەوتم سوننەتەو بریتی‌یە لەو حەیوانەی کەلە ڕۆژی حەوتەمی دوای لەدایکبوونی منداڵدا سەردەبڕێت [3] بۆ کوڕ دوومەڕسەردەبڕێت بۆ کچ یەك مەڕ. گۆشتەکەشی دەرخواردی گەداو لاتو هەژاران دەدرێت. [4]

(١) بوخاری (٥٢٤٩) موسلیم (١٩٧٤) ((من ضحى منكم فلا يصبحن بعد ثالثة وفي بيته منه شيء)) فلما كان العام المقبل قالوا: يارسول الله نفعل كما فعلنا عام الماضي؟ قال: كلوا وأطعموا وادخروا فإن ذلك العام كان بالناس جهد فاردت أن تعينوا فيها)).

پێویستە هەندێکی لێ ببەخشێت ئایەتی: ﴿والبدن جعلناها لكم من شعائر الله لكم فيها خير فأذكروا إسم الله عليها صواف فإذا وجبت جنوبها فكلوا منها وأطعموا البائس الفقير﴾ (الحج: ٣٦).

(٢) تەنانەت نابێت پێستەکەشی بفرۆشێت هەروەها نابێت وەك کرێ بیدات بەقەسابەکە.

البيهقي (٢٩٤/٩) ((من باع جلد أضحية فلا أضحية له)) لەوقوربانی‌یەی کەنەزر نەبێت دەتوانێت خۆی کەڵك لە پێستەکەی وەربگرێت.

(٣) الترمذي (١٥٢٢) قال رسول الله (ﷺ): ((الغلام مرتهن بعقيقته يذبح عنه يوم السابع ويسمى ويحلق رأسه)).

الحاكم (٢٣٧/٤) ((عق رسول الله (ﷺ) عن الحسين بشاة وقال: يا فاطمة إحلقي رأسه وتصدقي بزنة شعره فوزناه فكان وزنه درهما)).

(٤) إبن ماجة (٣١٦٣) ((عن عائشة (ﷺ) قالت: أمرنا رسول الله (ﷺ) أن نعق عن الغلام شاتين وعن الجارية شاة.

أبوداود (٢٨٣٤) الترمذي (١٥١٣) ((عن الغلام شاتان متكافئتان)).

# كتاب السبق والرمي

**وتَصِحّ المُسابقة علىٰ الدّواب والمُناضَلَةُ بالسِّهام.**

## باسی پێشبڕكەو تیر ئەندازی [1]

**پێشبڕكە: بریتی‌یە لەوەی دووكەس یان زیاتر ولاغ غاربدەن لە مەسافەیەكی دیاریكراودا تادەربكەوێت كامیان زووتر دەگاتە كۆتایی ئەوماوەیە.**

**تیر ئەندازی: بریتی‌یە لەوەی دووكەس یان زیاتر تیریان تفەنگ بتەقێنن تا دەربكەوێت كامیان نیشانەكە دەپێكن.**

**ئەو دوو كارە دروستن بەمەرجێك.**

---

(١) ئایەتی: ﴿وأعدوا لهم مااستطعتم من قوة﴾ (الأنفال: ٦٠)

موسلیم (١٩١٧) فسر النبي (ﷺ) القوة بالرمي فقال: ((ألا إن القوة الرمي ألا إن القوة الرمي ألا إن القوة الرمي)).

بوخاری (٢٧٤٣) (مر النبي (ﷺ) على نفرمن أسلم ينتضلون فقال النبي (ﷺ): ((أرموا بني إسماعيل فإن أباكم كان راميا أرموا وأنا مع بني فلان))، قال: فأمسك أحد الفريقين بأيديهم فقال (ﷺ): ((مالكم لاترمون؟)) قالوا: كيف نرمى وأنت معهم؟ فقال: (ﷺ) ((أرموا فأنا معكم كلكم)) ).

بوخاری(٤١٠) موسلیم (١٨٧٠) ((أن رسول الله (ﷺ) سابق بين الخيل التي أضمرت من الحفياء إلى ثنية الوداع وسابق بين الخيل التي لم تضمر من الثنية إلى مسجد بين زريق وأن عبدالله بن عمر (رضي الله عنه) كان فيمن سابق بها)).

الإمام أحمد في مسنده (٣/١٦٠) ((عن أنس بن مالك (رضي الله عنه) وقد سئل: أكنتم تراهنون على عهد رسول الله (ﷺ)؟ فقال: نعم لقد راهن على فرس له يقال له سبحة فسبق الناس فهش لذلك وأعجبه)).

أبوداود (٢٥٧٤) الترمذي (١٧٠٠) ((لاسبق الا في خف أو حافر أونصل)).

لەمەوە دەرئەكەوێت كەپارە وەناگیرێت مەگەر لەم سێ شتەدا كە هۆیەكانی شەڕبوون بێجگە لەمانەش ئەگەر پارەی تیانەبێت و ئازاری مرۆڤ یان گیانلەبەری تیا نەبێت دروستە.

إِذا كانَت المَسافَةُ مَعلومَةٌ، وصِفَةُ المُناضَلَةِ مَعلومَةٌ ويُخرِجُ العَوضَ أحدُ المُتسابِقين، حَتىٰ إنه إذا سَبَقَ استرَدَّهُ وإن سُبِقَ أخَذَهُ صاحِبُهُ لَهُ وإن أخرجاهُ مَعًا لَم يَجُزْ إلا أن يُدخِلا بينَهما مُحَلِّلا فإن سَبَقَ أخَذَ العِوَضَ وإن سُبِقَ لَم يَغرَم.ه

ماوەکە دیاریکراو بێت و شێوەی تیر ئەندازیش زانراوبێت ئەبێت یەکێك لەدوولایەنەکە ئەو پارەیەدا بنێت ئەگەر خۆی بردیەوە ئەوا هەڵی ئەگرێتەوە ئەگینا لایەنەکەی تر ئەی بات.

ئەگەر هەردوولا پارەیان دانا ئەوە دروست نییە [1] مەگەر لەلایەن شەخسی سێیەم کەپێی ئەو ترێت (محلل) حەڵاڵ سەر دابنرێت، ئەوکاتە ئەگەر ئەوکەسە بردییەوە ئەوا پارەی هەردووکیان ئەبات ئەگینا هیچ نادات ئەگەر لایەکیان بردییەوە ئەوا پارەی ئەوی تر وەك یەك لەناوخۆیان دا دابەش دەکەن.

(١) چونکە هەردوکیان لەوانەیە بیباتەوە یان بدۆڕێنێ کە ئەمەش ئەبێتە قومارو حەرامە بەڵام کاتێك یەکێکیان دای ئەنێت ئەوا نابێتە قومار چونکە ئەگەر خۆی سەر بکەوێت هیچی دەست ناکەوێت.

دروستە یان ئیمامی وەخت یان یەکێکی تر ئەو پارەیە دابنێ.



# كتاب الأيمان والنذور

لاينعقدُ اليمينُ إلا باللهِ تعالىٰ او بإسمٍ من اسمائِهِ او صفةٍ من صفاتِ ذاتِهِ وَمَن حَلَفَ بِصَدَقةِ مالِهِ فهوَ مُخَيّر بينَ الصَدقةِ اوكفّارةِ اليَمينِ، ولاشيءَ في لَغوِ اليَمين.

## باسی سوێند خواردن و نەزر

سوێند دانامەزرێت مەگەر کاتێك ئەو سوێندە بەو شەیەك بێت کە زاتی خوا بگرێتەوە وەك (الله) یان ناوێکی تایبەت بەو [1] یان بەسیفەتێك لەسیفەتەکانی. ئەگەر یەکێك سوێند بخوات کە ماڵەکەی دەکات بەخێر [2] ئەوەسەرپشکە لەوەی کە بیکات بە خێر [3] یان کەفارەتی سوێندەکەی بدات بەڵام سوێندی سەرزارەکی (لغو اليمين) هیچی لەسەر نی یە. [4]

(١) ناوی تایبەتی وەك: الإله—مالك يوم الدين... سیفەتیش وەك: الرحمن —الحي.....

بوخاری (٦٢٧٠) موسلیم (١٦٤٦) (أن رسول الله (ﷺ) أدرك عمر بن الخطاب وهو يسير في ركب يحلف بأبيه فقال: ((ألا أن الله ينهاكم أن تحلفوا بآبائكم، من كان حالفا فليحلف بالله أو ليصمت)) ). بوخاری (٦٢٥٣) ((كانت يمين النبي (ﷺ) لاو ومقلب القلوب)).

بوخاری (٦٢٥٣) (٦٢٥٥) أنه (ﷺ) قال في حلفه: ((والذي نفسي بيده والذي نفس محمد بيده)).

بێ پێویستی سوێند خواردن باش نی یە. ئایەتی: ﴿ولا تجعلوا الله عرضة لأيمانكم أن تبروا وتتقوا وتصلحوابين الناس﴾. (البقرة: ٢٢٤).

بوخاری (١٩٨١) موسلیم (١٦٠٦) ((الحلف منفقة للسلعة ممحقة للبركة)).

(٢) وەك ئەوەی بڵێت: ئەگەر ئەو کارەم کرد لەسەر مەبوخوا ماڵەکەم ببەخشم...پێی ئەوترێت: ((يمين اللجاج والغضب)).

(٣) موسلیم (١٦٤٥) ((كفارة النذر كفارة اليمين)).

(٤) ئایەتی: ﴿لايؤاخذكم الله باللغو في أيمانكم ولكن يؤاخذكم بماكسبت قلوبكم﴾ (البقرة: ٢٢٥).

البخاری (٦٢٨٦) إبن حيان (١١٨٧) ((لغو اليمين هو كلام الرجل في بيته كلا والله و بلى والله)).

وَمَن حَلَفَ أَن لا يفعَلَ شيئاً، فأمَرَ غيرَهُ بفعلِهِ لَم يَحنَث، وَمَن حَلَفَ علىٰ فِعلِ امرَينِ ففَعَلَ احدَهُما لَم يَحنَث.

وكفارةُ اليمينِ هوَ مُخَيّر فيها بينَ ثلاثةِ اشياءَ: عتقُ رَقَبَةٍ مُؤمِنَةٍ، اواطعامُ عَشَرَةِ مَسَاكينَ كلُّ مسكينٍ مُدًّا او كِسوتُهم ثوبًا ثوبًا، فإن لم يَجِد فصِيامُ ثلاثةِ ايامٍ.

(فصل) والنّذرُ يلزَمُ في المُجازاةِ علىٰ مُباحٍ وَطاعَةٍ

ئەگەر یەکێك سوێندی خوارد کە کارێك ناکات پاشان فرمانیدا بە یەکێکی تر کە بیکات، سوێندی ناکەوێت. ئەگەر یەکێك سوێندی خوارد لەسەر دووشت بەلام یەکێکیانی کرد ئەوە سوێندی ناکەوێت.[1]

کەفارەتی سوێند:[2] مرۆڤ سەر پشکە لەسێ شت: ئازاد کردنی کۆیلەیەکی موسوڵمان، خواردنی دەهەژاربدات هەریەکەیان مستێك،[3] یان هەریەکەو جلێکیان بداتی، ئەگەر نەیبوو ئەمانە بکات ئەوا ئەبێت سێ ڕۆژ بەڕۆژووبێت.

(باس) النذر: لەخۆگرتن: بریتییە لەگەردن گرتنی شتێك ئیتر ئەو شتە خێربێت –حەلاڵ بێت– یان گوناه بێت.

نەزر: دائەمەزرێت لەسەر کاری ڕەوا یان عیبادەت[4]

(١) وەك ئەوەی بڵێت: سوێند بەخوا ئەو دووجلە لەبەر ناکەم یان قسە لەگەڵ فلان و فلان دا ناکەم پاشان جلێکی لەبەرکرد یان قسەی لەگەڵیەکێکیان کرد ئەوە سوێندی ناکەوێت.

(٢) واتە: ئەو سوێندەی کەبەزمان دەی ڵێتو بەدڵ مەبەستی یەتی ئەگەر نەی بردە سەر ئەبێت کەفارەت بدات ﴿ولكن يؤاخذكم بما عقدتم الإيمان﴾ (المائدة: ٨٩). ﴿ولكن يؤاخذكم بما كسبت قلوبكم﴾ (البقرة: ٢٢٥).

سوێندی لەسەر ڕابردوو ڕانەبردوو ئەبێت ئەگەر لەسەر ڕابردوو بوو بەئەنقەست درۆی کرد ئەوە گوناهی کە بیرەیە پێی ئەوترێت: (الغموس) واتە ئەگەر تۆبە نەکات ئەوە جێی دۆزەخە.

بوخاری (٦٢٩٨) ((الكبائر: الإشراك بالله، وعقوق الوالدين، وقتل النفس، واليمين الغموس)).

(٣) مست: بریتییە لە (٦٠٠) گرام.

ئایەتی: ﴿فكفار ته إطعام عشرة مساكين من أوسط ماتطعمون أهليكم أو كسوتهم أو تحرير رقبة فمن لم يجد فصيام ثلاثة أيام ذلك كفارة أيمانكم إذا حلفتم﴾ (المائدة: ٨٩).

(٤) نەزر: دووبەشە: نذر اللجاج — نذر التبرر. تبرر: ئەکرێت بە دووبەشەوە: معلق– غير معلق.

ئایەتی: ﴿يوفون بالنذر ويخافون يوما كان شره مستطيرا﴾ (الدهر: ٧) ﴿وليوفوا نذورهم﴾ (الحج: ٢٩).

بوخاری (٢٥٠٨) موسلیم (٢٥٣٥) ((أن بعدكم قوما يخونون ولايؤتمنون ويشهدون ولا يستشهدون وينذرون ولا يوفون ويظهر فيهم السمن)).

بوخاری (٦٣١٨) ((من نذر أن يطيع الله فليطعه ومن نذر أن يعصيه فلا يعصه)).

كقولِهِ: إِن شَفَىٰ اللهُ مَرِيضِي فَلِلَّهِ عَلَيَّ أَن أُصَلِّي او أَصُومَ أَو أَتَصَدَّقَ وَيلزَمُهُ مِن ذلكَ مايَقَعُ عليهِ الإسمُ.

ولا نذرَ في مَعصِيةٍ كقوله: إن قتلتُ فلانًا فللّه عليَّ كذا ولا يلزَمُ النَذرُ علىٰ تركِ مُباحٍ، كقوله: لا آكُلُ لَحمًا ولا أشرَبُ لَبَنًا وماأشبَهَ ذلك.

وەك ئەوەی بڵێت: ئەگەر نەخۆشەکەمی چاك کردەوە ئەوا نەزرە لەسەرم بۆ خوا کە نوێژبکەم یان بە ڕۆژووبم یان خێربکەم، جا ئەگەر نزاکەی گیرابوو ئەوا ئەبێت نەزرەکەی بهێنێتەدی ئەوەش بەوەدەبێت کە کارێکی وەها بکات کەبەناوپێی بوترێت- نوێژ- ڕۆژوو- خێر-[1]

ئەگەر نەزری کرد کە گوناهێك بکات ئەوە دانامەزرێت بۆ نموونە: ئەگەر بڵێت: ئەگەر فلانە کەسم کوشت ئەوا نەزربێ لەسەرم بۆ خوا کەئەوشتە بکەم، ئەمە نەزر نییە [2] هەروەها نەزر دانامەزرێت لەسەر وازهێنانو تەرك کردنی شتێکی حەلاڵ [3] وەك ئەوەی بڵێت: گۆشت ناخۆم یان شیرناخۆمەوە یان شتیلەوبابەتە.

(١) واتە: بۆ نوێژ: دووڕکات بۆ ڕۆژوو: یەك ڕۆژ، بۆ خێر: شتێك بێت کەپێی بوترێت ماڵ، بەڵام ئەگەر خۆی لەنەزرەکەدا ژمارەو چەندایەتی باس کردبوو ئەوا ئەبێت بەگوێرەی ئەوە بی کات.

(٢) حەدیسی ((ومن نذر أن یعصیه فلا یعصه)).

موسلیم (١٦١٤) ((لانذر في معصیة الله)).

(٣) جیاوازی لە نێوان کردنو نەکردن دا نییە بۆ نموونە: ئەگەر نەزری کرد کە بخوات یان بخواتەوە یانەوجلە لەبەربکات ئەوە نەزر نییە:

بوخاری (٦٣٢٦) (بینما النبي (ﷺ) یخطب إذا هو برجل قائم فسأل عنه؟ فقالوا: أبو إسرائیل نذر أن یقوم ولا یقعد ولا یستظل ولا یتکلم ویصوم فقال: النبي (ﷺ): ((مره فلیتکلم ولیستظل ولیقعد ولیتم صومه)) ).



# كتاب الأقضية والشهادات

ولايَجوزُ انْ يَلِيَ القضاءَ إلا مَنِ استَكمَلَتْ فيهِ خمسَ عشرةَ خَصلةً: الإسلامَ، والبلوغُ، والعقلُ والحريةُ، والذكوريةُ، والعدالَةُ، ومعرفةُ أحكامِ الكتابِ والسُنَةِ، ومعرفةُ الإجماعِ،

## باسی دادوەری وشایەتیدان

دادوەری لەشەرع دا: بریتی‌یە لەنەهێشتنی کێشەو هەرا لەنێوان دوولایەن دا بەتەتیبق کردنی حوکمی خوا بەسەریان دا [1] ئەگەر یەکێك ئەم پانزە سیفەتەی تیانەبێت نابێت بکرێت بە دادوەر (حاکم): ((ئیسلامەتی [2] _بالغی، عەقل، ئازادی، نێرینە،[3] عەدالەت ، [4] حوکمی قورئان وحەدیس بزانێت، ئەوشتانەی کەئیجماعی لەسەرە، [5]

(١) ئایەتی: ﴿وإذا حكمتم بين الناس أن تحكموا بالعدل﴾ (النساء: ٥٨) ﴿وأن أحكم بينهم بما أنزل الله﴾ (المائدة: ٤٩).

أبوداود (٣٥٨٢) عن علي (ﷺ) قال: (بعثني رسول الله (ﷺ) إلى اليمن قاضيا فقلت: يارسول الله، ترسلني وأنا حديث السن ولا علم لي بالقضاء؟ فقال: ((أن الله سيهدي قلبك ويثبت لسانك))، قال: فما زلت قاضيا أو ماشككت في قضاء بعد).

ئایەتی: ﴿كونوا قوامين لله شهداء بالقسط﴾ (المائدة: ٨) ﴿ولاتكتموا الشهادة﴾ (البقرة: ٢٨٣)..واتە: ئەگەر یەکێك ئەم مەرجانەی تیا نەبێت نابێت خۆشی قبوڵی بکات ئەگینا گوناهبار دەبێت.

(٢) کافر بەهیچ جۆرێك دروست نی‌یە بکرێت بەدادوەر تەنانەت ئەگەر بۆ دادوەری نێوان کافرانیش بێت:

ئایەتی: ﴿ولن يجعل الله للكافرين على المؤمنين سبيلا﴾ (النساء: ١٤١).

(٣) بوخاری (٤١٦٣) ((لن يفلح قوم ولوا أمرهم أمرأة)).

(٤) چونکە مرۆڤی زاڵم وزۆردارو ناعادلو فاسق خەڵك متمانەی پێ ناکەن لەوانەیە حوکمەکانی ناڕاست بن، لەباسی مەرجەکانی شایەت دا مەرجەکانی عەدالەت باس دەکرێن.

(٥) واتە: ئەو حوکمانەی کەلە ڕێگای (إجماع)ەوە هاتوون، ئیجماع: بریتی‌یە لەڕێك کەوتنی هەموو زاناکانی ئوممەتی ئیسلام لەیەکێك لەچاخەکاندا لەسەر حوکمێکی شەرعی بۆ ڕووداوێك کەلە قورئانو حەدیس دا باس نەکرابێت، هەرشتێك بەم شێوەبوو ئیتر بەهیچ جۆرێك هەڵناوەشێتەوە تازە کەس بۆی نی‌یە جارێکی تر لێکۆڵینەوەی تیابکاتەوە.

**وَمعرِفَةُ الإختِلافِ، وَمعرِفَةُ طرُقِ الإجتِهادِ، ومَعرفَةُ طَرَفٍ مِن لِسانِ العَرَب.**

**ومعرفةُ تفسيرِ كتابِ اللهِ تعالىٰ، وان يكونَ سَميعًا، وان يكونَ بصيرًا، وأن يكون مُستَيقِظًا. ويُستَحَبُّ اَن يُجلِسَ في وَسَطِ البَلَدِ في موضِعٍ بارِزٍ لِلناسِ ولا حاجِبَ لَهُ،**

---

**ئەوشتانەی کە شوێنی جیاوازی بیروڕان، [1] ڕێگاکانی ئیجتهاد بزانێت، [2] شارەزای زمانی عەرەبی بێت. [3]**

**شارەزای تەفسیری قورئان بێت، [4] گوێی ساغ بێت، چاوی ساغ بێت، خوێندن و نووسین بزانێت، ووریاو زیرەك بێت. [5]**

**باشتروایە دادوەر لەناوەڕاستی شارداو لەشوێنێکی وا کەهەمووان پێی بزانن نیشەجێ بێت ودەرگەوانی نەبێت، [6]**

---

(١) واتە: لەنێوان ئەسحابەیان تابیعین یان ئیمامە موجتەهیدەکان دا.

(٢) مەبەست ئەو ڕێگایانەن کە بەهۆی ئەوانەوە حوکمە کان لەبەڵگەکان وەردەگیرێن.

(٣) چونکە زمانی عەرەبی زمانی قورئان و حەدیسە.

(٤) أبوداود (٣٥٧٣) ((القضاء ثلاثة: واحد في الجنة وإثنان في النار فإما الذي في الجنة فرجل عرف الحق فقضى به، ورجل عرف الحق فجار في الحكم فهو في النار، ورجل قضى للناس على جهل فهو في النار)).

بوخاری (٦٩١٩) موسلیم (١٧١٦) ((إذا حكم الحاكم فأجتهد ثم أصاب فله أجران وإذا حكم فأجتهد ثم أخطأ فله أجر)).

دیارە وەك ئیمامی نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: ئەمە بۆیەکێکە کە هەموو مەرجەکانی دادوەری تیایە ئەگینا یەکێك کە بۆ دادوەری نەشێت بۆی نی یە حوکم بکات وەهەرحوکمێکیش بکات جێبەجێ ناکرێت باڕاستیش بێت چونکە حوکمەکەی لەسەر بناغەی زانست و شارەزاییەوە نی یە. (شرح موسلیم (١٢/١٣)).

(٥) واتە: کەس نەتوانێت فێڵی لێ بکات.

(٦) بۆ ئەوەی ڕێگا لەکەس نەگرێت بۆ چوونەلای:

أبوداود (٢٩٤٨) الترمذي (١٣٣٢) ((من ولاه عزوجل شيئا من أمر المسلمين فاحتجب دون حاجتهم وخلتهم وفقرهم إحتجب الله دون حاجته وخلته وفقره)).

دیارە ئەمە بۆ کاتێکە کە قەرە باڵغی نەبێت ئەگینا پێویستە یەکێك هەبێت کاروبارەکان ڕێك بخات.

**وَلاَ يَقْعُدُ لِلقَضاءِ فِي المَسجدِ.**

**وَيُسَوِّي بَيْنَ الخَصمَينِ فِي ثَلاثَةِ أَشياءَ: فِي المَجلِسِ، وَاللَّفظِ، وَاللَّحظِ.**

**وَلايَجوزُ أن يَقبَلَ الهدِيَّةَ مِن أَهلِ عَمَلِهِ، وَيَجتَنِبُ القضاءَ فِي عَشَرَةِ مَواضِعَ: عِندَ الغَضَبِ، والجوعِ، والعَطشِ .**

---

**وەنابێت مزگەوت بکرێتە شوێنی دادوەری کردن [(١)]**

**پێویستە داوەر بەیەك چاوسەیری دوولایەنی کێشەکە بکات وەنابێت لەم سێ شتەدا جیاوازی لەنێوانیاندا بکات: لەدانیشتندا، لەقسە لەگەڵ کردن دا، لەسەیر کردن دا [(٢)]**

**بەهیچ جۆرێك دروست نی‌یە دادوەر دیاری لەوکەسانە وەربگرێت کە بۆ یەکالاکردنی کێشەکانیان دێنە لای. [(٣)]**

**دادوەر دەبێت لەدەحاڵەت دا واز لەدادوەری بهێنێت ولەو کاتەدا داوەری نەکات: کاتێ تووڕەبێت، برسی وتینووبێت،**

---

(١) بۆ ئەوەی دەنگە دەنگ و هەروا هوریا لەمزگەوت بەدووربێت سەرەڕای ئەوەش جاری وامەیە کە هەندێك ناتوانن بچنە ناو مزگەوتەوە وەك: حەیزدار- منالّ- شێت-کافر.

(٢) واتە: نابێت کارێکی وا بکات کەیەکێك لەلایەنەکان وامەست بکات کەبەلای یەکێکیاندا حوکمەکە ئەگۆڕێ.

الدارقطني (٤/٢٠٥) ((من إبتلى بالقضاء بين الناس فليعدل بينهم في لحظه وإشارته ومقعده ولا يرفعن صوته على أحد الخصمين مالا يرفع على الآخر)).

(٣) بوخاری (٦٢٦٠) موسليم (١٨٣٢) ((أن رسول الله (ﷺ) إستعمل عاملا فجاءه العامل حين فرغ من عمله فقال: يارسول الله هذالكم وهذا أهدي لي فقال له: ((أفلا قعدت في بيت أبيك وأمك فنظرت: أيهدي لك أم لا))، ثم قام رسول الله (ﷺ) عشية بعد الصلاة فتشهد وأثنى على الله بماهو أهله ثم قال: ((أما بعد فما بال العامل نستعمله فيأتينا فيقول: هذا من عملكم وهذا أهدي لي أفلا قعد في بيت أبيه وأمه فنظر: هل يهدي له أم لا؟ فو الذي نفس محمد بيده لا يغل أحدكم منها شيئا إلاجاء به يوم القيامة يحمله على عنقه: أن كان بعيرا جاء به له رغاء وإن كانت بقرة جاء به وله خواره وإن كانت شاة جاءبها تيعر فقد بلغت ثم رفع رسول الله (ﷺ) يده حتى إنا لننظر إلى عفرة أبطيه)).

في رواية أحمد (٥/٤٢٤) ((هدايا العمال غلول)).

دیارە ئەمە بۆ ئەوانەنی‌یە کە لەوەپێش عادەت یان وابووەکە دیاری یان پێشکەش کردووەهیچ جۆرەکێشەیەکی دادوەریشیان نی‌یە.

ئەگەر دیاری بۆ ئەوەبێت کەداوەرە بەناڕەوا حوکمی بۆ بکات ئەوە بەرتیلە وگوناهی کەبیرەیە هەموو لایەك تاوان بارن، الترمذي (١٣٣٦) ((لعن رسول الله (ﷺ) الراشي والمرتشي في الحكم)) وعند أحمد (٥/٢٧٩) ((لعن رسول الله (ﷺ) الراشي والمرتشي والرائش))، هەروەك نابێت دیاری وەربگرێت هەروەها نابێت بچێت بۆ دەعوەتو میوان داری کە بەتایبەتی بۆ ئەو کرابێت.

وَشِدّةِ الشّهوةِ والحُزنِ والفَرحِ المفرطِ، وعندَ المَرَضِ، ومدافَعةِ الأخبثَينِ، وعندَ النّعاسِ، وشدةِ الحَرِ والبَردِ. ولايَسألُ المُدعىٰ عليهِ إلا بعدَ كمالِ الدّعوىٰ. ولايُحلِفُهُ إلا بعدَ سُؤالِ المُدّعي.

ولايُلقّنُ خَصمًا حُجّةً ولا يُفهِمُه كلامًا، ولا يَتعنّتُ بالشُّهَداءِ. ولا يقبلُ الشّهادةَ إلا مِمَن ثَبتَت عدالتُه ولا يَقبلُ شَهادةَ عَدوٍ عَلىٰ عَدوِه، ولاشهادةَ والدٍ لِوَلَدِهِ ولا وَلَدٍ لِوالِدِهِ. ولا يقبلُ كِتابَ قاضٍ إلىٰ قاضٍ آخرَ في الأحكامِ إلابعدَ شَهادةِ شاهدَينِ بما فيهِ.

---

ئارەزووی جینسی زۆر بێت، خەمبار یان زۆر دڵخۆش بێت، نەخۆش بێت، تەنگەتاوی سەرئاو بێت، خەوی بێت، زۆر گەرمایان زۆر سەرما بێت.[1]

تا داواکەر (المدعی) لەپێشکەشکردنی دەعواکەی نەبێتەوە نابێت دادوەر پرسیار لەداوالێکراو (المدعي عليه) بکات، داوا لێکراو سوێند نادرێت تا داواکەر داوا نەکات کەداوای کرد ئینجا سوێند دەدرێت.

نابێت لایەنێکیان فێری بەڵگەو قسەی کردن بکات،[2] وەنابێت ئازاری شایەتەکان بدات،[3] یەکێك کە عادل نەبێت بەشایەت وەرناگیرێت هەروەها شایەتی دوژمن لەسەر دوژمن یان باوك بۆ کوڕ یان کوڕ بۆ باوك وەرناگیرێت.[4]

نوسراوی قازی یەك بۆ قازی‌یەکی تر کە حوکمی تیابێت وەرناگیرێت مەگەر شایەت شایەتی بدەن لەسەر ناوەڕۆکی نامەکە.[5]

---

(١) بوخاری (٦٧٣٩) موسلیم (١٧١٧) ((لايقضين حاكم بين أثنين وهو غضبان)) إبن ماجة (٢٣١٦) لايقضي القاضي وفي رواية: ((لاينبغي للحاكم أن يقضي...)).

(٢) واتە: ڕێو شوێنی دەعواو چۆنیەتی وەڵام دانەوە.

(٣) نابێت قسەی وایان پێ بڵێت کەپێیان ناخۆش بێت، یان گاڵتەیان پێ بکات ئایەتی: ﴿ولا يضار كاتب ولا شهيد وإن تفعلوا فإنه فسوق بكم﴾ (البقرة: ٢٨٢).

(٤) أبوداود (٣٦٠١) ((لاتجوز شهادة خائن ولا خائنة ولا زان ولا زانية ولا ذي غمر على أخيه)). الترمذي (٢٢٩٩) ((ولاظنين في ولاء ولاقرابة)).

(٥) وەك ئەوەی دادوەرێك بە (غياب) حوکمێك ئەدات بەسەرێکیکدا وبەنامەیك داوەری ئەو شوێنە ئاگادار ئەکات تا بەسەریدا (تنفيذ) بکرێت لەم حاڵەدا ئەبێت دووشایەت لەبەر دەمی دادوەری دووەم لەسەر ناوەڕۆکی نامەکە شایەتی بدەن.

(فصل) ويفتقرُ القاسِمُ إلىٰ سَبعَةِ شَرائِطَ:

الإسلامَ، والبلوغُ، والعقلُ، والحريةُ، والذكورةُ، والعدالةَ، والحسابُ، فإن تَراضيٰ الشريكانِ بِمن يَقسِمُ بَينَهما لَم يَفتقِر إلىٰ ذاكَ. وإن كانَ في القِسمَةِ تَقويمُ لَم يقتَصِرْ فيه على أقلَّ مِن اثنَينِ، وإذا دَعا أحَدُ الشَريكَينِ شريكَهُ إلىٰ قِسمَةٍ مالا ضَرَرَفيهِ لَزِمَ الآخَرَ إجابَته.

(فصل) وإذا كانَ مَعَ المُدَّعي بَيِّنَةٌ سَمِعَها الحاكِمُ وحَكَمَ لَهُ بها، وإن لَم تكُنْ لَهُ بَيِّنَةٌ فالقولُ قولُ المُدَّعىٰ عَليه بِيَمينِه.

(باس) دابەشکردنی ماڵێك کەهی دو هاوبەش یازیاتر بێت. دابەشکەر [(١)] دەبێت ئەم حەوت مەرجەی تیا بێت: ئیسلامەتی، باڵغی، ئەقڵ، ئازادی، نێرینە، عەداڵەت، حیساب بزانێت. [(٢)] ئەگەر هاوبەشەکان خۆیان یەکێك دابنێن بۆیان بەش بکات ئەوا ئەم مەرجانەی ناوێت، [(٣)]

ئەگەر لەدابەشکردنەکە نرخ بۆ دانانی تیابوو ئەوائەبێت بەلایەنی کەمەوە دووکەس بن، ئەگەر یەکێك لەهاوبەشەکان داوای لەشەریکەکەی کرد کەدابەشکردن بکەن پێویستە لەسەری ڕازی بێت مەگەر زیان بەدابەشکراوەکە بکات. [(٤)]

(باس) ئەگەر داواکەر شایەتی هەبوو، ئەوا دادوەرگوێی لێ ئەگرێت و حوکمی شتەکەی بۆ دەرئەکات، بەڵام ئەگەر شایەتی نەبوو ئەوا داوالێکراو سوێند ئەدرێت،

(١) دابەشکەر: بەوکەسە ئەڵێن: کەدادوەردای ئەنێت تا بەشەکان لێك جیا بکاتەوە، ئایەتی: ﴿وإذا حضر القمسة أولوا القربى واليتامى والمساكين فارزقوهم منه وقولوا لهم قولا معروفا﴾ (الناسء: ٨).

حەدیسی ((الشفعة فيما لم يقسم)). (ثبت أنه (ﷺ) قسم الغنيمة بين الغانمين).

(٢) مەبەست حیسابو ئەندازەیە (المساحة) دیارە ئەگەر یەکێك ئەمانە نەزانێت توانای دابەشکردنی نابێت.

(٣) واتە: تەنها باڵغ وئاقڵ بێت کافی‌یە چونکە لەم حاڵەتەدا دەبێتە وەکیلی هەر دولایان.

(٤) ئەگەر زیان بەدابەشکراوەکە بکات ئەوە بۆی هەیە گوێی نەداتێ وەك: خانووی بچووك، یەك پارچە جل.

إبن ماجة (٢٣٤٠) (٢٣٤١) مالك (الموطأ) (٢/٧٤٥-٨٠٥) ((لاضرر ولا ضرار)).

**فإن نَكَلَ عن اليَمينِ رُدَّتْ علىٰ المُدَّعي فيَحلِفُ ويَستَحِقّ.**

**وإذا تَداعَيا شيئًا في يَدِ أحَدِهِما فالقَولُ قولُ صاحِبِ اليَدِ بِيَمينِهِ، وإن كانَ في أيديهما تَحالَفا وجُعِلَ بينَهُما ومَن حَلَفَ علىٰ فِعلِ نَفْسِهِ حَلَفَ علىٰ البَتِّ والقَطعِ ومَن حَلَفَ علىٰ فِعلِ غَيرِهِ، فإن كان إثباتًا حَلَفَ علىٰ البَتِّ والقَطعِ وإن كانَ نَفيًا حَلَفَ علىٰ نَفْيِ العِلمِ.**

---

وتەی ئەو وەردەگیرێت [1] ئەگەر داوا لێکراو سوێندی نەخوارد ئەوا دادوەر داوا لە داواکەر دەکات سوێند بخوات وئیتر شتەکە وەردەگرێت. [2]

ئەگەر دووکەس دەعوای شتێکیان کرد کە لەژێر تەسەڕوفی یەکێکیان دابوو ئەوا بڕوا بەخاوەن تەسەڕوفەکە ئەکرێت پاش ئەوەی کە سوێند ئەدرێت [3] بەڵام ئەگەر بەدەست هەردوکیانەوە بوو ئەوا ئەبێت هەر دوولایان سوێند بدرێن‌و شتەکەش دابەش ئەکرێت لەنێوانیاندا.

ئەگەر یەکێك سوێندی لەسەر شتێك خوارد کە خۆی کردبووی ئەوا پێویستە بەتەواوی بنەبڕی بکات وگومانی تیا نەهێڵێت بەڵام ئەگەر سوێندی لەسەر کارێك خوارد کە یەکێکی تر کردبووی ئەگەر (ئیپبات)بوو دەبێ گومانی تیانە هێڵێت، [4] ئەگەر (نەفی) بوو [5] ئەوا لەسوێندەکەدا دەڵێت: قەسەم بەخوا نەم زانیوە فلان ئەو کارەی کردبێت.

---

(١) بوخاری (٤٢٧٧) موسلیم (١٧١١) أن النبي (ﷺ) قال: ((لويعطي الناس بدعواهم لادعي ناس دماء رجال وأموالهم ولكن اليمين على المدعي عليه)).

موسلیم (١٣٨) ((عن الأشعث بن قيس (رضي الله عنه) قال: كان بيني وبين رجل أرض باليمن فخاصمته إلى النبي (ﷺ) فقال: ((هل لك بينة؟)) فقلت: لا، قال: فيمينه وفي رواية: ((شاهداك أو يمينه)).

(٢) الحاكم (١٠٠/٤) ((عن إبن عمر (رضي الله عنهما) قال: أن النبي (ﷺ) رد اليمين على طالب الحق)).

(٣) چونکە بوونی شتەکە لای ئەو مانای موڵکداریەتی وشایەتیش دژی ئەوە نییە.

أبوداود (٣٦١٣) ((عن أبي موسى الأشعري (رضي الله عنه) أن رجلين أدعيا بعيرا أو دابة إلى النبي (ﷺ) ليست لواحد منهما بينة فجعله النبي بينهما)) الحاكم (٩٥/٤).

(٤) بۆ نموونە ئەڵێت: باوکم ئەوەندە قەرزەی لای فلانەو ئەوکەسەش ئینکاری کرد وسوێندیشی نەخوارد ئەوا داواکەر سوێند دەخوات.

(٥) واتە: (نەفی) کارێکی دەکرد کەهی یەکێکی ترە لێرەدا ناتوانێت بەقەطعی بڵێ ئەو شتە وانییە.

(فصلٌ) ولا تُقبلُ الشَهادَةُ إلا مِمَن إجتَمَعَتْ فيهِ خَمسُ خِصالٍ: الإسلام، والبلوغُ، والعقلُ، والحريةُ، والعدالة.

ولِلعَدالَةِ خمسُ شَرائِطَ: ان يكونَ مُجتَنِباً لِلكَبائِرِ، غَيرَ مُصَرٍّ عَلى القَليلِ مِنَ الصَغائِرِ، سَليمَ السَّريرَةِ مَاموناً عِندَ الغَضَبِ، مُحافِظا على مُروءَةِ مِثلهِ.

(فصل) والحقوقُ ضَربانِ: حقُّ اللهِ تَعالىٰ، وَحقُّ الآدَميِ:

فاماحقوقَ الآدميينَ فثلاثةُ اضرُبٍ:

ضَربٌ لا يُقبَلُ فيهِ إلا شاهِدانِ ذَكَرانِ، وهو: مالا يَقصَدُ مِنها المالُ ويَطّلِعُ عليهِ الرِّجالُ.

(باس) ئەگەر یەکێك ئەم پێنج مەرجەی تیانەبێت بەشایەت وەرناگیرێت: ئیسلامەتی، بالغی، عەقل، ئازادی، عەدالەت [1] عەدالەتیش بەم پێنج مەرجە دێتەدی: خۆی لەگوناهی کەبیرە بپارێزێت، [2] بەردەوام نەبێت لەسەر گوناهی (صغیرە)ی کەم، [3] عەقیدەی پاك بێت ولەکاتی ڕق هەڵساندا ئاگای لەخۆی بێت ولەسنوور دەرنەچێت، [4] خاوەن مروەت وپیاوەتی بێت وەهیچی لەهاوکوفەکانی کەمتر نەبێت.

(باس) مافەکان دووجۆرەن: مافی خوایی، مافی ئادەمیزادان. مافی ئادەمیزادیش سێ جۆرن:

یەکەم: ئەوەیە کە مەسەلەی مالی تیانییە، [5] لەم جۆرەدا تەنها شایەتی دووپیاو وەردەگیرێت.

---

(١) ئایەتی: ﴿وأستشهدو شهيدين من رجالكم﴾ (البقرة: ٢٨٢). ﴿وأشهدوا ذوي عدل منكم﴾ (الطلاق: ٢)، ﴿ممن ترضون من الشهداء﴾ (البقرة: ٢٨٢).

(٢) گوناهی کەبیرە وەك: ئارەق خواردنەوە، زنا، قەزف... ﴿ولاتقبلوا لهم شهادة أبدا وأولئك هم الفاسقون﴾ (النور: ٤).

(٣) گوناهی (صغیرة) وەك: سەیرکردنی حەرام بۆ ئافرەت، زیاتر لەسێ ڕۆژ قسەلەگەڵ برای موسڵمانی نەکات.

(٤) بۆ نموونە: ئەگەر یەکێك پێی وابێت جنێودان بەئەسحابە دروستە ئەوە عەقیدەی تەواو نییە.

(٥) وەك: مەسەلەی تەلاق ووەسیەت وژن مارەکردن:

ئایەتی: ﴿ويأيها الذين آمنوا شهادة بينكم إذا حضر أحدكم الموت حين الوصية إثنان ذوا عدل منكم﴾ (المائدة: ١٠٦) ، ﴿فامسكوهن بمعروف أوفارقوهن بمعروف وأشهدوا ذوي عدل منكم﴾ (الطلاق: ٢). حديث: ((لانكاح إلا بولي مرشد وشاهدي عدل)).

وَضربٌ يُقبَلُ فيهِ شاهِدانِ، أو رَجُلٌ وَامرأتانِ، أوشاهِدٌ ويمينُ المُدَّعي، وهو ماكان القصدُ مِنهُ المالُ. وضربٌ يُقبَلُ فيهِ رَجلانِ، أورَجُلٌ وامراتانِ، او اربعِ نِسْوةٍ وهو: مالا يَطِّلِعُ عليهِ الرِّجالُ؛

واما حُقوقُ اللهِ فلا تُقبَلُ فيهِ النِّساءُ وهي على ثَلاثةِ أضْرُبٍ: ضَربٌ لا يُقبَلُ فيه أقلُّ مِن أربَعةٍ، وهُو الزّنا.

---

دووەم: ئەوەیە کەمەسەلەی پارەی تیایە [1] یان هەرماڵێکی تر، لەم جۆرەدا ئەمانە بەشایەت وەردەگیرێن: دووپیاو، پیاوێكو دووژن، شایەتێکی پیاو لەگەڵ سوێندی داواکەر.

سێیەم: ئەو جۆرەیە کە کەئەغلەب وایە پیاوان ئاگاداری نابن [2] لەم حاڵەتەدا ئەمانە بەشایەت وەردەگیرێن: دووپیاو، پیاوێكو دووژن، چوار ژن.

مافی خوایی: بەهیچ جۆرێك لەم جۆرەدا ژن بەشایەت وەرناگیرێت [3] ئەمانەش سێ جۆرن:

یەکەم: ئەوەیە کە کەمتر لەچوار پیاو بەشایەت وەرناگیرێت ئەوەش مەسەلەی (زنا)یە. [4]

---

(١) وەك: کڕینو فرۆشتنو ئیجارەو ڕەهن...

ئایەتی: ﴿وأستشهدوا شهيدين من رجالكم فإن لم يكونا رجلين فرجل وأمرأتان ممن ترضون من الشهداء أن تضل أحداهما فتذكر إحداهما الأخرى﴾ (البقرة: ٢٨٢)

موسلیم (١٧٢١) عن إبن عباس (ﷺ) ((أن رسول الله (ﷺ) قضى بيمين وشاهد))

الشافعي / الأم (١٥٦/٦) أي قضى باليمين مع الشاهد في الأموال.

(٢) وەك مەسەلەی ژنان وشیر خواردن ومناڵبوون...

الإقناع (٢٩٧/٢) ((مضت السنة بأنه يجوز شهادة النساء فيما لا يطلع عليه غيرهن من ولادة النساء وعيوبهن)).

(٣) الإقناع (٢٩٦/٢) ((مضت السنة بأنه لايجوز شهادة النساء في الحدود)).

(٤) ئایەتی: ﴿والذين يرمون المحصنات ثم لم يأتوا بأربعة شهداء فاجلدوهم﴾ (النور: ١٣). ئەمە بەڵگەیە کە (زنا) بەکەمتر لەچوار شایەت ئیثبات نابێت.

ئایەتی: ﴿واللآتي يأتين الفاحشة من نسائكم فاستشهدوا عليهن أربعة منكم﴾ (النساء: ١٥).

﴿ولولا جاءوا عليه بأربعة شهداء فإذ لم يأتوا بالشهداء فأولئك عندالله هم الكاذبون﴾ (النور: ١٣).

موسليم (١٤٩٨) ((أن سعد بن عبادة (ﷺ) قال: يارسول الله لو وجدت مع أهلي رجلا لم أمسه حتى آتي باربعة شهداء؟ قال: رسول الله (ﷺ): ((نعم))، قال: لا والذي بعثك بالحق إن كنت لأعاجله بالسيف قبل ذلك، قال رسول الله (ﷺ): ((إسمعوا إلى مايقول سيدكم أنه لغيور وأنا أغيرمنه والله أغيرمني)).

وضربٌ يقبلُ فيهِ إثنانِ، وهو ماسوىٰ الزِنا مِنَ الحُدودِ.

وضربٌ يُقبل فيهِ واحِدٌ، وهو هِلالُ رَمضانَ ولاتُقبلُ شَهادةُ الأعمىٰ إلا في خَمسةِ مواضِعَ، الموتُ، والنَّسَبُ، والمِلكُ المُطلَقُ، والترجَمَةُ، وماشَهِدَبِهِ قبل العَمىٰ وعَلىٰ المَضْبوطِ.

دووەم: حەددەکانی تری بێجگە لە (زنـا) [1] کەلەمانەدا دووشایەت قبووڵ دەکرێن وەك شەراب خواردنەوە.

سێیەم: ئەوەیە کە شایەتی، یەك پیاوکافی‌یە ئەویش دیتنی مانگی یەکەم شەوەی ڕەمەزانە. [2]

شایەتی دانی کوێر تەنها لەپێنج حاڵەت دا قبووڵ دەکرێت کە ئەمانەن: مردن، ئیپباتی نەسەب، موڵکداری ڕەها (مطلق)، [3] تەرجەرمە کردنی وتەی شایەت یان دوولایەنی دەعوا، [4] ئەوشتەی پێش کوێر بوونی دیویەتی، [5] یان قسەیەك کەلەدەمی شایەتو لایەنەکانی دەعوا بیستبێتی. [6]

(١) وەك: حەددی قەزف —قصاص...

ئایەتەکانی پێشوو ﴿إستشهدوا شهيدين من رجالكم﴾. ﴿وأشهدوا ذوي عدل منكم﴾ حەدیثی: ((شاهداك أو يمينه)) ((مضت السنة بأنه لايجوزشهادة النساء في الحدود)).

(٢) أبوداود (٢٣٤٢) ((عن إبن عمر (ﷺ) قال: تراءى الناس الهلال فأخبرت رسول الله (ﷺ) إني – رأيته فصامه وأمر الناس بصيامه)).

بەڵام بۆ بینیی مانگی یەك شەوەی (شەوال) ئەبێت دووشایەت شایەتی بدەن.

(٣) بۆ نموونە: یەکێك دەعوای موڵکداری شتێك بکاتو کەسیش نکوولی لێ نەکات کوێرەکە شایەتی ئەدات کە ئەم شتە خاوەنی هەیە بێ ئەوەی ناوی خاوەنەکەی بڵێت.

(٤) واتە: ڕوونکردنەوەی وتەی لایەنەکان یان شایەتەکان چونکە لێرەدا مەسەلە بیستنە نەك دیتن.

(٥) واتە: پێش ئەوەی چاوی لەدەست بدات ئەو شتەی بینیوە هەردوو لایەنەکەش بناسێت.

(٦) وەك ئەوەی کەیەکێك بەگوێی کوێرەکەدا شتێکی وەك ئیقرار–تەڵاق.. بچرپێنێ ئەویش ئەوقسەیە بەرێت بۆلای دادوەر وشایەتی لەسەر ئەو کەسەبدات بەوەی کە بیستوویەتی.

**وَلا تُقْبَلُ شهادَةُ جارٍّ لِنَفسِهِ نَفعًا، ولا دافعٍ عَنها ضَرَرًا.**

**هەرکەسێك بیەوێت بەهۆی شایەتیدانەکەی سوودێك بۆ خۆی بپچڕێت، یان زیانێك لەخۆی دووربخاتەوە ئەوا ئەو شایەتی‌یەی لێ قبوول ناکرێت.** [1]

(١) نموونەیەکەم: یەکێك لەوەرەسەکان شایەتی بدات کە ئەوەی میراتی لێ وەردەگرێت (مورث) پێش ئەوەی برینەکەی چاك ببێتەوە مردووە، ئەوەش بۆ ئەوەی خوێنی وەربگرێت.

نموونەی دووەم: ئەوەیە کەیەکێك لە خزمەکانی بکوژی کوشتنی بەهەڵە (قتل الخطأ) شایەتی بدات کە شایەتەکانی کوشتنەکە (عادل) نە بوون و فاسق بوون ئەوەش بۆ ئەوەی خوێن نەدات .

**بەیارمەتی خوا تەواوبوو.**

**جمادی الثاني / ١٤١٩**

**تشرين الأول/ ١٩٩٨ وەرگێڕ**



# پێڕستی ئەم کتێبە

| باس | لاپەڕە |
|---|---|



## باسی پاککردنەوە



## باسی نوێژ

## باسی مردوو



## باسی زەکات

## باسی ڕۆژوو



## باسی حەج



## باسی کڕین و فرۆشتن

## باسی دابەشکردنی میرات



## باسی ژن مارەکردن و ئەوشتانەی پەیوەندی بەوەوە هەیە

## تاوانكاری‌یه‌كان



## سزاكان

